# پیاوان و ژنان

## تەواوکاری نایەکسان

(لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی شەرعیە)

دانانی

د. إبراهیم طاهر معروف الربانی

پێداچوونەوەی

پ.ی.د. إبراهیم أحمد شوان

ناوی کتێـــــــب: پیاوان و ژنان تەواوکاری نایەکسان
نوسینـــــــی: د. إبراهیم طاهر معروف الرّباتي
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین
نۆرە و ساڵی چــاپ: دووەم/ 1430ک ـ 2009ز
شوێنی چـــــاپ: بەیروت ـ لبنان
ژمارەی سپـــاردن: ( 242ی ساڵی 2009ی پێ دراوە.

# پیـــاوان و ژنـــان

## تەواوکاری نا یەکسان

(لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی شەرعیە)


دانانی

د. إبراهيم طاهر معروف الرّباتي


پێداچوونەوەی

پ.ی.د. إبراهيم احمد شوان

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم:30.

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾طه:50

## پێشکەشە

- دایك و باوکم، کە پەروەردەیەکی ڕاست و دروستیان کردم.

- خێزانم و منداڵەکانم: چراخان وموحەمەدو ئیسماعیل و ئەحمەدو صەلاحەددین.

- هەموو ئەو براو خوشکانەی دەیانەوێت بگەنە زانستی ڕاستەقینەی پزیشکی بۆ ئەوەی لە خودی خۆیان بگەن.

- هەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ دۆزینەوەو گەیشتن بە زانستە بەڵگە نەویستەکان(الحقائق العلمية)، پیادەکردنیان لە ژیانی ڕۆژانە.

## سوپاس وپێزانین

سوپاسی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم کە هاوکاریان کرد
بۆئەوەی ئەم پەڕاوە بێتە چاپ کردن
و بگاتە دەستی خوێنەرانی بەڕێز،
بەتایبەتی پرۆفیسۆری یاریدەدەر
إبراهیم أحمد شوان، کە ئەرکی
پێداچوونەوەی زمانی
کوردی گرتە
ئەستۆ.

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی كە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێی خولقاندووە لەیەك نەفس، لەنێوانیان خۆشەویستی وبەزەیی پەیدا كردووە، و لەسەر هەریەكێكیان هەندێ ئەرك و فەرمانی داناوە كەوا بەبێ زیادو كەم گونجاوە لەگەڵ پێكهاتەی جەستەیی و دەروونییان. درودو سەلام لە پێشەوای هەموو مرۆڤایەتی و خاووخویش و هاوەڵانی، هەموو ئەوانەی ڕێبازی ئەویان گرتووە وەك بەرنامەی ژیان تاوەكو ڕۆژی دوایی.

هەروەك لای كەس شاراوە نیە كەوا خوای خولقێنەری بوونەوەر، هەردوو ڕەگەزی نێرو مێی لەیەك نەفس خولقاندووە و، بۆ هەریەكیان هەندێ حوكمی شەرعی داناوە كەوا گونجاوە لەگەل هەردوو پێكهاتەی جەستەیی و دەروونییان، وەك ئەوەیە بڵێی كەوا خوای گەورە ئامادەی كردوون بۆ ئەوەی هەر یەكیان كارو فەرمانی تایبەت بەخۆیانەوە ببینن، وئامادەگیی پێویستی پێداون بۆ ئەوەی ئەم كارانە بە ڕێكی جێبەجێ بكەن، لە هەمان كاتیشدا هەریەكیان دەسەڵاتی تەواوی پێداون بۆ ئارەزووومەندی گوزەران وژیان، هەردووكیان یەكتری تەواو بكەن. ژمارەیەكی زۆر لە ئایەتەكانی قورئان و فەرموودە هاتوون كەوا پەیوەستن بە كاروباری ئافرەتان و ڕوونكردنەوەی ئەركە شەرعی و مافەكانیان، لە قۆناغە جیاجیاكانی ژیان، لەو كاتەی لە ناو سكی دایكیەتی تاوەكو تەمەنی منداڵی و گەنجی و هاوسەری و قوناغی دایكایەتی هەروەها كاتی پیربوونی، بەمەش لەواقیع و ڕاستیدا دەبێتە هاوبەشی پیاوو نیوەی كۆمەڵ و ئەندامێكی چالاك و بەنرخ و بەسوودو پلە بەرزو ڕێزلێگیراو لەناو كۆمەڵگەدا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم: 30

مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە، ئەی ئینسان زۆر بە چاکی ودروستی ڕوو لەم ئاینە پاك وبێگەردەی ئیسلامە بکەو لەسەر ئەو خەلیقەتە بن خوا خەلکانی لەسەر ئەفراندووە، نابێ لە هەموو کات وشوێنەکدا هیچ جۆرە گۆرانکارییەك بکرێ لە دروستکراوی خوادا، چ ئەوەی پەیوەندی دارە بە بوونەوەر لە بێ گیان و گیاندارو ڕووەك، چ ئەوەی پەیوەستە بە ئادەمیزاد لە ڕووی جەستەیی و دەرونی لە تاك و لە کۆمەڵ. ئادەمیزادەکان هەرچەندە جیاوازبن لە ڕەگەزو لە شوێن ولەو سەردەمەی تێیدا دەژین تەواوی ڕاستی دروستی فیترەتی خۆیان دەبینن لە ناو ئاینی ئیسلام. لەناو دروست کراوەکانی خوای بەبەزەیدا هیچ جۆرە نارێکی و ناتەواوییەك نابینرێ، چونکە خوای گەورە هیچ شتێکی دروست نەکردووە کە پێهاتەی خۆڕسکی(فیتری) لەگەڵ ئەو ئەرکانەی بۆی دانراوە پێچەوانەی یەکتر بن یان دژایەتی هەبێ لە نێوانیان. ئەمە هەرگیزاو هەرگیز نەبووەو نابێت لە دروست کراوەکانی خوا ڕوو نادات: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ﴾الملك: 3.

نێرینەو مێینە دوو بەشی سەرەکی و پێویستی مرۆڤایەتین، هیچ فەزلێك بۆ ڕەگەزی نێرینە نیە، هیچ کەمیەکیش بۆ ڕەگەزی مێینە نیە، سەرکەوتوویی پیاوان لە ژیان بەوەیە کەوا لەسەر سروشتی پیاوەتی خۆی بمێنی، وکاری پیاوان بکات، کۆمەڵگەش بەکاری بهێنی بۆ ئەو کارانەی لەگەل خۆڕسکی گونجاوە، هەروەها سەرکەوتوو سەربەرزی ئافرەتانیش بەوەیە کە ئەمانیش ئەرك و فەرمانەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن وکۆمەڵگەش لە چوارچێوەی کاری گونجاو بۆیان جێگەیان بۆ بکاتەوە و، بەرزیان بکاتەوە بە خوێندن و پەروەردەی دروست و کردنەوەی دەرگای بەرەو سەرکەوتن وپێشەوەچوون لە چوارچێوەی کاری گونجاوەوە، مەگەر خوا نازانێ کێی دروست کردووەو چۆنی دروست کردووە، لە کاتێکدا ووردبین و بەئاگایە؟ ئەوەی دروستی کردووە دەزانی لە چ کارێکدا سەرکەوتووە و تیایدا کارامەو سەربەرزە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ

ٱلۡخَبِيرُ﴾ الملـــك: 14 عیمـران کـوڕی حەصـین ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا چـۆن خەڵکان کارەکانیان بۆ دەکرێت؟ فەرمووی: ((كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمــا خُلِــقَ لَــهُ))[1]. هـەر کەسێك بۆ کارێك دروست کرا بێ، ئەو کارەی بۆ ئاسان کراوەو پێوەی زۆر ماندوو هەلاك نابێت.

کەواتـە خۆڕسـك نێـرو مێـی یەکسان نـەکردووە، لـە ئیسلامیـشدا لەنێوانیانـدا تـەواوکاری هەیـە نـەوەك یەکسانی. لـە حـوکم و ئـەرك و فەرمانیـشدا هاوبەشـی و لێکچوون هەیە، بەڵام بەیەکچوونی(التطابق) تەواو نیە.

ئەو هەنگاوو هەوڵانەی دران بۆ یەکسان کردنی هەردوو ڕەگەز لە یـەك تـەرازودا، هەموویان هەرەسیان هێنا. لە کۆتاییدا کۆمەڵگەی عیلمانی بێ دینی ویستی هەردوو ڕەگەز یەکسان بکات لە هەموو شتێك، بەڵام بە هەڵە چوو لـەو هـەنگاوەی، چـونکە بـوە هـۆی فەسـاد کردنـی ئـەو هاوسـەنگیەی هـەبوو لـە نێوانیانـدا. ئەنجامەکـەی هاتنەکایـەی تەوژمـەکی بـەرەڵایی و بەدڕەوشـتی بـوو، خەریکـە هـەموو بنـەماکانی خێزان و کۆمەڵگە بەرەو هەڵدێرێکی قوڵی ترسناك دەبات.

**ئامانجە سەرەکیەکان لە نووسینی ئەم بابەتە:**

1- باسێکی کورتی پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی هەردوو ڕەگەز- نێرو مێ- لە بواری تویکاری، چۆنیەتی کارکردنی هەندێ لە ئەندامەکان، بەپـشت بەسـتان بـە سەرچاوەی پزیشکی نوێی ئینگلیزی و عەرەبی، تاوەکو خوێنەری بـەرێز شـارەزایی زیاتر هەبێت لە پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی خودی خۆی بە هەردوو ڕەگەزیەوە.

2- کاریگەری کارو کرداری ئەو ئەندام وشانەو خانـە جەسـتەییانە، پێکهاتـەی دەرونـی(البناء النفــسي) لەسـەر چـەندو جـۆرو چـۆنیەتی ئـەو ئـەرك وفەرمانانـەی پەیوەستن بەژیانی ڕۆژانە، ئەو حوکمـە شـەرعیانەی کـە خـوای گـەورە بـۆ هـەردوو ڕەگەزی دیاری کردووەو پەسەندی کردووە.

---

1ـــ البخـــاري ، محـــمد بن إسماعيل، فتح الباري بشرح صحيح البخاري.
البخاري97-التوحيد 45- باب: لقد يسرنا القرآن للذكر الرقم: 7551، 638/13.ميسّر:مهيأً.

3- هەوڵدان وگەڕان بۆ گەیشتن بەو ڕاستیە گومان لێنەکراوەی، کە دەڵێ: ئەرك و فەرمان-ئەوانەی پەیوەستن بە شەرع وبە ژیانی ڕۆژانەوە- تەوافق و گونجاوی تەواوی هەیە لەگەل خۆڕسك وخەلیقەتی ئادەمیزاد بە هەردوو بەشیەوە(جەستەیی و دەرونی).

4- ئافرەتان هاوبەشی پیاوانن لە مرۆڤایەتی، هاوبەشیەتی لە پاداشت وسزا لەسەر کارەکانی، مافی تەواوی خۆی هەیە لە گشت قوناغەکانی ژیانیدا، ئەو ئەرکانەی لەسەر شانە کە گونجاوە لەگەل فیترەت وخەلیقەتی.

5- ڕوونکردنەوەو چەسپاندنی ئەو ڕاستیەی کە دەڵێت: ئاینی پیرۆزی ئیسلام تاکە بەرنامەی ئاسمانی یە کە زانستی لە باوەش گرتووەو، دەگەڕێتەوە بۆ لای عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوە لە هەموو کارێکداو، ڕاستی بنەما سیفەتێکی هەرە دیارەکانیەتی. هەر ئەو تاکە ئاینی فیترەتەو هەموو حوکم وئەرك وفەرمان وسوننەتەکانی بەتەواوی گونجاون لەگەل ئەم فیترەت و خەلیقەتە.

6- ڕوونکردنەوەی ئەو هەموو هەولانەی دراون بۆ ئەوەی ئەم دوو ڕەگەزە لە یەك تای تەرازوودا بنێن و یەکسانیان بکەن بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێك هەر چەندە گەر بۆیان گونجاویش نەبێ. و ڕوونکردنەوەی ئەنجامی ئەو کارە بێ بەرنامەیە، کە بلاوبوونەوەی فەسادی جنسی ونەخۆشی جۆراوجۆری جەستەیی و دەرونی، بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئەوانەی بەردەوامن لەسەر مەی خواردن ودەرمانی بێهۆشکەرو سەرخۆشکەر، بەرزبوونەوەی ڕێژەی خۆکوشتن و بێ بەش بوون لە ئاسوودەی جەستەیی ودەرونی.

**هۆیەکانی نووسینی ئەم بابەتە:**

قورئانی پیرۆز ئاراستەی عەقلی مرۆڤ دەکات بۆ ووردبوونەوە لە نەفسی خۆی و بوونەوەر، فیترەش ئاگار دەکاتەوەو هۆشی مرۆڤیش بەرەو ئەم دوو شتە دەبات و چاوی دەکاتەوە کە ئەم شتانە بە ڕوونی ببینێ و بە قولی لێکۆلینەوەیان لەسەر بکات ویاساکانی بدۆزێتەوە، لەئاکامی ئەمانەش دەگاتە ئەو ڕاستیە کە خوا تاك و

تەنهایە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْآفَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ فصلت:53، لەو ڕوانگەیەوە بە پێویستم زانی کەوا لە لایەنی زانستی پزیشکیەوە بتوانم تەوافق و گونجان بسازێنم لە نێوان زانیاری پزیشکی و ئەرك و فەرمانەکانی ژیانی ڕۆژانەی هەردوو ڕەگەز.

1- زیادکردنی هەندی زانیاری بەڵگەنەویست بۆ پەرتووکخانەی ئیسلامی، سەبارەت بە زانستی پزیشکی وگونجاندنی لەگەل حوکمەکانی شەرعی.

2- ئەو بابەتە ببێتە خاڵێکی دەست پێکردن بۆ زۆر براو خوشکانی تری بەرێز، هەوڵ بدەن بۆ لێکولینەوەو گەڕان بەدوای دەستکەوتنی زانیاری نوێ لەسەر بابەتەکانی تری پزیشکی وبایولوجی وکارئەندامزانی و تویکاری و پاراستنی تەندروستی وزانستی کۆرپەلە، پەیوەندی ئەو زانیاریانە بە حوکمەکانی شەرعیەوە.

3- ئەو بابەتە ببێتە هۆکارێك بۆ گەڕانەوەی باوەڕ ومتمانە بۆ زۆر لە خاوەن زانستەکان وهەڵگرانی بڕوانامەی بەرز، بەتایبەتی ئەوانەی ڕشتەی پزیشکی کەوا ئاینی ئیسلام عەقلی مرۆڤ دەدوێنێ، لەگەڵ زانست دۆستە لە هەموو کات و شوێنەکدا، هیچ دژایەتیەك و دژە بۆچونێك (التناقض) نیە لە نێوانیان.

4- بە بیر هێنانەوەی موسولمانان ئەو ڕاستیەی کە بەشداری ئافرەت بەهەندێ مەرج لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا شتەکی نوێ نیە، بەڵکو زۆر کۆنە، چەند سەدە تێپەڕیوەو ئافرەتی موسوڵمان بەشداری کۆڕی زانایانی کردووەو، فێربووەو خەلکیشی فێر کردووە، بەشداری هەبووە لە بوارە جیاجیاکانی ژیان، پلەوپایەو ڕێزی تایبەتیان هەبووە، ڕۆڵەو نەوەی دوا ڕۆژی پێگەیاندوەو پالەوانی مەیدانیشی پێشکەش بە کۆمەڵگا کردووە. بەم جۆرە ژیانی بەسەر بردووە، ئافرەتی موسڵمان لەکاتێ، کە موسڵمانان دەستیان بە بەرنامە و ئاینی ئیسلام گرتبو، سەرکردایەتی و پێشەنگی هەموو وولاتان بوون لە گشت بوارەکانی ژیان، هەر لەو کاتانەشدا

مزگەوتەکان سەرچاوەی ڕووناکی و زانست و زانیاری بوون و هەموو جیهانیان ڕۆشن کردبۆوە بە تیشکی زانست و ڕەوشت و بەها چەسپاوو پەسەندەکانی.

**بەرنامەی نوسینی ئەم پەڕاوە:**

بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پزیشکی سوودمان لە زۆر سەرچاوەی پزیشکی نوێ و هەندێکی عەرەبیش وەرگرتووە جا چ ئەوانەی پزیشکانی عەرەب دایاننناوە وەیان ئەوانەی لە بیانیەوە وەریانگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی لەسەر زانستی تویکاری و کارئەندامزانی وزانستی هورمونەکان[1] و دەروننناسی، ئەوەش پاش کورت کردنەوەو ڕێکخستنی بابەتەکان. هەموو هەوڵ و کۆششی خۆمان بەکار هێناوە بۆ دیاری کردنی جیاوازیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەز لە ڕووی جەستەیی ودەروونی یەوە لەهەموو قۆناغەکانی ژیان (هەر لە ژیانی کۆرپەلەوە تاوەکو پیری و مردن). پاشان ئەو جیاوازیە وردانەم شیکردۆتەوە، کە هەر ئەوانەن ڕێگەمان بۆ ئاسان دەکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانمان. ئەو بابەتانە هەموویان لە بەرگی یەکەم باس کراون. بەڵام بەرگی دووەم تەرخان کراوە بۆ ڕوونکردنەوەی کاریگەرو ڕەنگدانەوەی ئەم جیاوازیانە لەسەر ئەرك وفەرمانەکانی ژیانی ڕۆژانە (جا چ ئەوانەی پەیوەستن بە شەرع وئەوانەی پەیوەستن بە ژیانی دونیا)، شێوازی زیاتر گونجانی ڕەگەزێکیان بۆ هەندێك کار لە ڕەگەزەکەی تر، بەپێچەوانەش زیاتر گونجانی ڕەگەزی بەرامبەر بۆ هەندێ کاری تر، بەبێ ئەوەی ئەم ئەرکە گونجاوانە کاریگەری سەلبیان هەبێ لەسەر خودی ئەم ڕەگەزە خۆی، یان خێزان و کۆمەڵگەوە.

هەروەها لە بەرگی دووەم بە درێژی باسی ئەو بابەتانە کراوە: ئارەزووی ئافرەت بۆ خۆ ڕازاندنەوەو خۆش ویستنی خشڵ و زێر، باسی خۆداپۆشین، دەسەڵاتی بەدەست بوونی تەڵاق وبەڕێوەبردنی کاروباری ماڵ، شایەدی، چەند ژنی، وەرگرتنی پۆستەکانی وەزارەت و سەرۆکایەتی و قەزاوەت، کاری بازاڕ (حیسبە)،

---

1ـ پێوانی ئاستی هۆرمونەکان بە میلگرام، مایکروگرام، ونانۆ گرام، بیکوغرام. 1گرام =1000میلگرام،، 1 ملگرام =1000 مایکروگرام، 1 مایکروگرام= 1000 نانۆگرام، 1 نانۆ گرام =1000 بیکۆگرامە.

هەروەها حوکمەکانی پەیوەستە بە نوێژو ڕۆژی وحەج وسەفەر و جەماعەت و تێکەڵ بوون و زۆر بابەتی تر.

ئەو ڕووداوانەی بەتەنها لە ئافرەت ڕوودەدات وەك بێ نوێژی، سك پڕی، زەیستان، لە بێ نوێژی کەوتن، شیر پێدانی منداڵ، هەموویانم بە جیا وەك پەراوێکی سەربەخۆ لە ژێر ناونیشانی(تەنها بۆ ئافرەتان) بە چاپ گەیاندووە، کە لە زۆر پێویستە بخوێندرێتەوە، چونکە لە زۆر باسدا لەگەڵ ئەو پەڕاوەی ژێر دەستتدایە پەیوەندیدارە. کە تیایدا بە درێژی ماناو نیشانەکان وچۆنیەتی ڕوودانیان ڕوونکراوەتەوە. هەروەها باسی چۆنیەتی کاریگەری نیشانەکانی ئەو ڕووداوانە لەسەر جەستەو دەروونی ئافرەت، کە بونەتە هۆکار بۆ ئەوەی لەهەندێك کاتدا گونجاو نەبن بۆ بەڕێوەبردنی هەندێ کاری گرنگی کۆمەڵگەو وڵات.

هەر حوکم وئەرك و فەرمانیکم باس کردووە بیروڕای زانایانی بەڕێزی پێشینم هێناوەتەوە لەهەرچوار مەزهەبی ئیسلامی ولەگەڵ ڕای هەندی قوتابیانی تری ئەم مەزهەبانە، هەروەها لە هەندێ شوێندا ڕەئی(ئیبن حزمی زاهری)یشم هێناوەتەوە، لەگەڵ هێنانەوەی بیرو بۆچوونی زانایانی پایەبەرزی سەردەم لە ناو جیهانی ئیسلامی. پاشان بەڵگەکانی زانستی پزیشکیم هێناوەتەوە بۆ هەریەکێك لەو بابەتانە، گونجاندنیان لە نێوان زانیاریە پزیشکیەکان وحوکمەکانی شەرعی وئەرك و فەرمانەکان(واتە بەڵگەی نەقلی وعەقلیم هێناوەوە). لە کۆتایی زۆربەی بابەتەکان ڕای خۆشم داوە، بۆئەوەی گەر بۆچوونەکانم دروست نەبوو ئەوا خۆم بەرپرسیارم، ئاینی ئیسلام بەریە لە چەوتی و نادروستی، ئەگەر بۆچوونەکانم دروست بوون ئەوا تەوفیق وسەرکەوتنم بە پشتیوانی خوای گەورە بووە.

لەکاتی هاتنی هەر ئایەتەکی قورئانی پیرۆز ناوی سورەتەکە و ژمارەی ئایەتەکەم هێناوە وهەر فەرموودەیەکیش هاتبێ ئاماژە بەسەرچاوەك یان دوان کراوە. وبابەتەکانیش بە هەندێ وێنەی پزیشکی ڕازاندراونەتەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە (لەکۆتایی ئەم بەرگە).

زۆر بە پێویستم زانی ئەو بابەتە، کە نامەی دکتۆراکەم بوو وەرگێڕم بۆ سەر

زمانی شیرینی کوردی، تاوەکو ڕۆڵەکانی نیشتمانی خۆشمان بێبەش نەبن لەو بابەتە زانستیە. هەوڵی زۆرمدا یەکێك بدۆزمەوە کە شارەزایەکی تەواوی هەبێ لەسەر زاراوەی پزیشکی کوردی ئەرکی وەرگێڕانەکەم بۆ بخاتە ئەستۆی خۆی، بەلام بەداخەوە کەسم دەست نەکەوت. پاش چاوەڕوانی چەند مانگێك بە ناچاری خۆم خستە ناو ئەو کارە قورسە. پێشەکی ژمارەیەك کتابی زیدەوەرزانی قۆناغەکانی دواناوەندیم پەیدا کردو دەستم کرد بەخوێندنەوەیان ودەرهێنانی ووشەو زاراوە زانستی و پزیشکیەکان، بەڕاستی سودی زۆرم لێ وەرگرت، لەگەڵ وەرگرتنی چەند تێبینیەك:

1- بۆم دەرکەوت کەوا زمانی کوردی لە ڕووی زاراوەی پزیشکیەوە دەوڵەمەند نیە.

2- زۆر ووشەو زاراوە بە زیاتر لە جۆرێك شێوە نووسین هاتووە، وەك ووشەی مێ، مێینە،مێ ینە،هەروەها ووشەی سێ،سێ یەم، سێیەم، زۆر ووشەی تر.

3- تاوەکو ئێستا هەندێ ووشە هەیە هەر ناوی بە کوردی نیەو، لەو پەڕاوانە بە عەرەبی، یان بە ئینگلیزی نوسراوە.

هەندێ فەرهەنگی کوردیم بەکارهێناوە، کە تەنها چەند پیتێکیان تەواو بووە.

هەندێ ووشەو زاراوەش بەناچاری خۆم وەرم گێڕاوەو بەو هیوایەی کە خوێنەری بەڕێز لێیان تێ بگات.

زۆربەی ناوی ئەندام ونەخۆشی وهۆرمون وهاندەرەکان لەگەڵ ناوە کوردیەکەی بە (عەرەبی وئینگلیزی)م لە تەنیشتیەوە نوسیووە تاوەکو زیاتر ڕوون و دۆکیومێنت تر بێ.

ناوی سەرچاوە عەرەبی وبیانەکانم لە پەراوێزدا هێناوە، بەلام وەرم نەگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، تاوەکو خوێنەری بەڕێز هەرکاتێك ویستی بتوانێ بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانە.

**ڕێگە خۆشکردن (چوونە ناو بابەت)**

پیاو: بریتی یە لە نێرینەی مرۆڤ، لەو کات لەدایك دەبێت تاوەکو کۆتایی ژیانی پێی دەڵێن پیاو، بچوکراوەکەشی پیاۆکەیە.[1] کاتێ بە سیفەتیش باس دەکرێت پیاو مانای توندو تۆل وتەواوە (الشدة والكمال).[2]

ئافرەت: نیوەو تەواوکەری ئادەمیزادە، لە زمانی عەرەبی لە(مرأ. مَرَأ: مَــرَأ الرجل يمْرءُ مُرءَة والمُرُوءَة: الرجولة والإنسانية) هاتووە، واتە لە ووشەی پیاوەتی ومرۆڤایەتی هاتووە. بەچەند ووشەیەکی تریش ناسراوە: ژن، ئافرەت.[3]

کەواتە ئەم دوو ڕەگەزە بۆ ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی وتەواوکردنی کاری یەکتری وپێکەوەژیان هاتوون، نەوەك بۆ دژایەتی ودوبەرەکی. خوای گەورە بۆ هەر یەکیان پێداویستی تەواوی جەستەیی و دەروونی دابین کردووە، تاوەکو بتوانێ بەڕێکی وبێ جەخت لەخۆ کردن کارەکانی ئەنجام بدات.

هەروەك چۆن خوای گەورە ئادەمیزادی لەدوو ڕەگەزی نێرو مێ هێناوەتە بوون، گیاندارانی تریش هەروەها، هەردوو ڕەگەز بەردەوام دڵیان بۆ یەکتر دەچێت بەهۆی بوونی ئەو جیاوازیانە وبە هۆی پەیوەندی جنس وجووتبوون نەوەی دوا ڕۆژ پەیدا دەبێ وجۆری مرۆڤایەتیش دەپارێزرێ، هەروەها زەوی خوای گەورەش ئاوەدان دەکەنەوەو لەسەری دەمێننەوە تاوەکو کاتێکی دیاری کراو. بەبێ ئەم شێوەش هەرگیز ژیان بەرەو پێشەوە ناڕوات و جۆرەکانیش ناپارێزرێن، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ ﴾ آل عمران: 14

خوای گەورە دەفەرموویێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾ يس: 36

---

1ـ ابن منظور، أبو الفضل، محمد بن كرم، 154/5.

2ـ الزبيدي، محمد مرتضى، تاج العروس من جواهر القاموس،334/7.

3ـ ابن منظور، لسان العرب،62/13 .

سەید قوتب‌ﷺ دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێ[1]:

ئەو خوایە کە لە هەموو شتێك – مرۆڤ، گیاوگوڵ، ئەتۆم وزەڕات – جووت و نێرو مێی دروست کردووە ولە ناو کیانی بوونەوەران (بە ئادەمیزاد وگیانلەبەرانی ترەوە) فیترەتی لێك نزیك بوونەوەی خوڵقاندوە، چ لە ئاستی تاك و چ لە ئاستی کۆمەڵ. مرۆڤیش لە بارەی ئەو ئارەزوەوە لە ڕیزی پێشەوەی هەموو گیانەوەرانی ترە. لە ئەنجامی ئەو ئارەزووە فیتریەوە بەیەك گەیشتن دروست دەبێت لە نێوان هەردوو ڕەگەز بۆ ئارەزوویەکی تری گەورەتر، کە بە کۆمەل بوون وکاری هاوبەش وپێکەوە ژیانە، نەوەك تەنها بۆ ئارەزوویەك و پێویستیەکی تاکی وکاتی.[2]

فیترەت– خەلیقەت(الفطـــرة): بریتیە لەو پێکهاتەی کەوا خوا دروستی کردووە لەناو ئادەمیزاد بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئەو بناسێ. هەروەها بەمانای دروستکردن و داهێنان دێت لە ڕووی جەستەیی ودەرونیەوە.

خوای گەورە دەفەرموویی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم: 30، واتە ئەی ئینسان زۆر بە چاکی ودروستی ڕوو لەم ئاینە پاك وبێگەردەی ئیسلامە بکەو لەسەر ئەو خەلیقەتە بن خوا خەلکانی لەسەر دروست کردووە ونابێ هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك بکرێ لە دروستکراوی خوا وئەمەش ئاین وباوەری پاکە، بەڵام زۆربەی خەلکان نازانن.

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە، کە ئەبی هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواﷺ دەیگێڕێتەوە: ((ما من مولود إلا يولد على الفطـــرة، فـــأبواه

1 ــ سید قطب إبراهيم: زانای پایە بەرزی ئیسلام، لە سالی 1904 لە میسر لە دایك بووە، شاعیرو نووسەرو ڕۆشنبیری زمان پاڵاوتە. دەستێکی باڵای هەبووە لە زیندوو کردنەوەی گیانی ئاینی موسوڵمانان، خاوەنی پەراوێکی زۆرە، لە ساڵی 1966 لە سێدارە دراوە لە لایەن ڕەگەز پەرستی عەرەب جمال عبد الناصر. للزركلي ، خـــير الدين، الأعـــلام، 147/3.

2ـــ سید قطب، مقومات التصور الإسلامي، ص371.

یهوّدانه، أو ینصّرانه، أو یمجّسانه، کما تنتج البهیمة بهیمةً جمعاء، هل تحسون فیها من جدعاء)).[1] واتە هەموو کەسێك کە لە دایك دەبێت وهاتە دونیاوە باوەڕی هەیە بەیەکتایی خوا بەهۆی ئەو فیترەو پێکهاتەی بۆیان دانراوە بەڵام دایك وباوك ودەوروبەر وایان لێدەکەن ببن بە جولەکەو گاورو ئاگر پەرست.

هەروەها فیترەش بەمانای ئیسلام وئاینی خوا دێت کەوا بوونی ئادەمیزادی لەسەر دانراوە. وەیان بە مانای گوێڕایەڵی و میللەت دێت(الملة والطاعة).[2] فیترەت بەمانای باوەڕو ئیمان دێت بەوەی کەوا خوای گەورە خولقێنەری ئاسمان و زەمینە، ئەگەر لە خەلکان بپرسیت کێ ئەوانەی دروست کردووە، ئەوا هەموو دەڵێن بەلێ خوای گەورە دروستی کردوون، هەر ئەمەشە فیترەی یەکتاپەرستی ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ الزمر: 38.

بەلام ئەو فیترەی ئێمە باسی دەکەین وبابەتەکەمان لەسەری بەندە بریتی یە لە فیترەی جوانترین و بەرزترین دروستکراوەکانی خوا کە ئادەمیزادە (بە هەردوو رەگەزیەوە نێرو مێ)، ئەو فیترەیەش بەندە بە پێکهاتەی جەستەیی و دەرونی، بە دڵ و عەقل وهۆشی هەموو تاکێك و خێزان وکۆمەلگەو هەموو تیرەو هۆزو وگەل و ئەممەتێکەوە.

---

1ــ البخاري 29- الجنائز باب: 78 حــــديث: 1293 ، 456/1. والبخــاري: 65- كتاب التفسير باب:لا تبديل لخلق الله حديث: 4775 ، 651/8.

2ــ الطبري، أبو جعفر، جامع البيان، 48/11-49.

فتح الباري .65: كتاب التفسير، باب: لا تبديل لخلق الله ، 651/8.

# بەرگی یەکەم

## پێکهاتەی جەستەیی و دەرونی نێرینەو مێینە و

## جیاوازی نێوانیان

بەشی یەکەم: پێکهاتەی تویکاری و کارنەندەزانی ئەندام و ئورگانە دیارەکانی هەردوو رەگەزو جیاوازی نێوانیان

بەشی دووەم: پێکهاتەی تویکاری وکارنەندەزانی ئەندام و ئورگانە ووردەکانی هەردوو رەگەزو جیاوازی نێوانیان

بەشی سێ یەم: جیاوازی نێوان هەردوو رەگەز لە بواری دەرونی و عەقلی و دەمارگیری.

## دەروازە:

گەر بەووردی لە جەستەی ئادەمیزاد بڕوانین دەبینین كەوا لە جەستەی گشت گیانلەبەرانی تر جوانترو سەرسوڕهێنەرو تەلیسماوی ترە لەڕووی پێكهاتەو كاری ئەندامەكانی، تاوەكو ئێستا هەندێك شتی شاراوەی تیادا بەدی دەكرێت لە پێكهاتەو كاری ئەندامەكانی.

جەستەی ئادەمیزاد لە هەزارەها ملیار خانە پێكهاتووە[1] وخانەش یەكەی سەرەكی پێكهاتەی دروست بوونی هەموو گیانلەبەرێكە، كۆمەڵە خانەكیش شانە پێكدەهێنن وشانەكانیش ئەندام (ئۆرگان) پێكدەهێنن، كۆمەڵە ئەندامێكیش كۆئەندام(سیستەم) پێكدەهێنن و هەر ئەندامێك و شانەیەكیش كاری تایبەتی خۆی هەیە.

هەرچەندە زانستی توێكاری بەلای ئەوەدا دەچێت كەوا جەستەی ئادەمیزاد یەك شێوەو ئاكاری هەیە لە هەردوو ڕەگەزدا، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر جیاوازی هەیە لە نێوان خانەكان و شانەكان و ئەندامەكانیاندا.

لێرەوە باسی خانەو شانە لە یەكچووەكان ناكەین، بەڵكو زیاتر باسی خانە و شانە و ئەندامە جیاوازەكان دەكەین، كە زیاتر خۆیان دەنوێنن لە ئەندامەكانی زاوزێ و ڕژێنەگلاندەكان وكارگەریەكانیان لەسەر شوێنەكانی تری لەش، كە بوونەتە هۆكاری سەرەكی جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە هەردوو باری جەستەیی و دەروونیەوە.

پێش چوونە ناو بابەتەكەمانەوە خاڵێكی گرنگ هەیە پێویستی بە باسكردن هەیە، ئەویش ئەوەیە كەوا زۆر پێویستە ئەو دوو ڕەگەزە جیاواز بن، تاوەكو ئەو ئارەزوو فیتریە بێتەدی بۆ نزیك بوونەوەو بەیەك گەیشتن ومانەوەی جۆری ئادەمیزاد لە سەر ڕووی زەوی وبەردەوام بوونی. ئادەمیزاد لەسەرەتای دروست

1ـ كنجو، خالص جلبي، الطب محراب الإيمان،39/1.

بـوونی کۆرپەلـە خـۆی هـەردوو ڕەگـەزی تیایـە، بـەڵام کـاتێ هۆرمـونی نێرینـە (تیستوستیرۆن) زیادبوو لە ناو خوێنی کۆرپەلەکە ئەوا دەبێتە ڕەگەزی نێرینە، هەر کاتێ ئەم هۆرمۆنە ڕێژەکەی کەم بوو دەبێتە ڕەگەزی مێینە. لێرەوە دیار دەکەوێ کەوا هورمونی مێینـە (ئیستروجین وبروجیستروون) هـیچ ڕۆڵێکیـان نیـە لـە دیـاری کردنی ڕەگەز چ نێرینە بێت وەیـان مێینـە، هـەروەك خـودای گـەورە دەفـەرموویێ:
﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ﴾ النجم : 45 ــ 46.

وەك لای هەمووان ئاشکرایە کەوا هەردوو کۆئەندامی زاوزێی نێرو مێ بە تـەنهایی دەژمێردرێن بە دوو کۆئەندامی کەم وکورت، چونکە هەریـەکیان بـە تـەنها چـی بـۆ ناکرێـت بـۆ پاراسـتنی جـۆری ئـادەمیزاد، بـەڵام کـاتێ پێکـەوە کۆکرانـەوە دەبنـە کۆئەندامێکی تەواوو توانـای ئـەوەی دەبێـت کـاری خـۆی ئـەنجام بـدات ولـە کـاتی جووتبوونیان هاوسەنگی تەواو دروست دەبێت لە ڕژانی هورمونەکانی هەردوو ڕەگەز بە ڕێژەی دیاری کراوو پێویست.

زانـا " بردییـف" لـەو بارەیـەوە دەڵـێ: یـەکگرتنی هـەردوو ڕەگـەز تـەنها بـۆ پاراستنی جۆر نیە، بەڵکو بۆ گەشەی کەسایەتی ئادەمیزادو ئارەزووی بـۆ گەیشتن بـە کـەمال و نـەمری یـە (الکمـــال والخلـــود). گـەر ئامـانجی بەیەکگەیـشتنی جینسی(سیکسی) بۆ گەیشتن بە لوتکەی تەواوکـەری خـودی مرۆڤایـەتی(التکامـل الـــذاتي) بێـت، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـەوا هەریـەکێك لـەم دوو ڕەگـەزە نیـوەی مرۆڤێکی تەواون و پێویستە یەکتری بگرن تاوەکو بگەنە پلەی تەواو لە سـەلماندنی خودو وکەمالی مرۆڤایەتی.[1]

هـەروەك ووتمـان یـەکێك لـە ئامانجـەکانی سـلوکی جینـسی مـرۆڤ بریتیـە لـە تەواوکردنی خودی مرۆڤایەتی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا دوو نیوە بەش هەیە و پێویستە بگەن بەیەك تاوەکو ببنە بەشێکی تـەواو، هـەردەم هـەردوولا هەستێکی

1ــــ کنجو، خالص جلبي، الطب محراب الإيمان، 1/ 40-41.

خەست و بەردەوام دەکا کەوا ئەو کەم و کورتیەکی تیایەو ئارەزووی دیدارو بەیەک گەیشتن و تەواوکاری دەکات. واتە لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کەوا ئەم حاڵەتە وەك هەردوولای هاوکێشەی کیمیاوی وایە پێویستە هاوکێش و هاوسەنگ بن.[1]

1ـ السلوك: بریتیە لە کۆمەڵێك لە وەڵامدانەوەی دەمارە خانەکان بۆ هەست وبزوێنەرەکانی دەوروبەر، وئەندامە پەیوەندیدارەکانی لەش دەست دەکەن بەجێبەجێ کردنی ئەو وەڵامانە. جاسم کریم حبیب، رسالة في سلوك الإنسان، ص15.

# بەشی یەکەم

## پێکهاتەی توێکاری و کارئەندمزانی کۆئەندام وئەندامە دیارەکانی هەردوو ڕەگەزو جیاوازی نێوانیان

**باسی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی پەیکەرە کۆئەندام وکۆئەندامی دەمار**

**باسی دووەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی کۆئەندامی سوڕی خوێن وهەناسەدان**

**باسی سێیەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی کۆئەندامی زاوزێ ومیزەڕۆ**

# باسی یەکەم

## پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی پەیکەرە کۆئەندام و کۆئەندامی دەمار

بەندی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی پەیکەرە کۆئەندام

- پێشەکی پەیکەر کۆئەندام

- بەشەکانی پەیکەر کۆئەندام

برگەی یەکەم: تەورە پەیکەر

یەکەم : کاسە سەر.

دووەم : بربڕەی پشت .

سێیەم : قەفەزەی سنگ( کۆڵەی سنگ و پەراسووەکان)

چوارەم : پشتێنەی حەوز

برگەی دووەم : پەلە پەیکەر

بەندی دووەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی کۆئەندامی دەمار

برگەی یەکەم: ناوەندە کۆئەندامی دەمار

یەکەم : دەماغ

دووەم : درکە پەتک

برگەی دووەم: چێوە کۆئەندامی دەمار

بەندی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندمزانی پەیکەرە کۆئەندام

- **پەیکەرە کۆئەندام**

پەیکەر کۆئەندام لە ژیانی کۆرپەلە لە ناو سکی دایکی لە هەفتەی پێنجەمین وشەشەمین دروستبونی تەواو دەبێت، لە سەرەتاوە وەك کرکراگە وایە وژمارەیان زۆرە دەگاتە 360 ئێسك، لە دوایدا هەندێکیان یەکتری دەگرن و ژمارەیان دەبێتە 206 لە ماوەی 20 ساڵی تەمەندا. لە مرۆڤی گەورە ئێسکانەکان 5/1 ی کێشی لەش پێك دەهێنێ.

ئێسکانەکان لە لەشی مرڤدا بەم شێوەیە دابەش بووە:( کەللەی سەر: 22، ئێسکانەکانی گوێ : 6، برِبڕەی پشت: 26، پەراسوو دەفەی سینگ: 25، پەلەکانی سەرەوە: 64، پەلەکانی خوارەوە: 62، ئێسقانی اللامی: 1). [1] (بنوارە شێوەی ژمارە 1: پەیکەرە کۆئەندام).

ئێسکان توانای بەرگەی پالەپەستۆی زۆری هەیە دەگاتە600 کیلو گرام/سم[2] پێش ئەوەی بشکێت، ئەوەش بە هۆی ئەوەیە کە ماددەی کانزایی زۆر تیایە.

بە هۆی ئێسکانە پەیکەرەوە ئادەمیزاد شێوەی تایبەتی دەرەوە وەردەگرێ و ماسولکەش لەسەر ئێسکانەوە بەندە و هاوکارە بۆ وەستان وجولانەوە ولەناو مۆخی ئیسکانیش خرۆکەی سوری خوێن دروست دەبێت، هەندێ ئێسکانی پتەویش هەن وەك سندوقێکی پاریزەر هەندێ ئەندام دەگرێتە خۆی وەك کەللەی سەرو برِبڕەی پشت کە دەماخ و دڕکە پەتکە دەپارێزن.

ئەو پەیکەرەی باسمان کرد ناتوانێت خۆی بەتەنها بجولێ بەبێ هاوکاری ماسولکەکانی دەوروبەری، ماسولکەکانیش پارێزگاری دەمارو بۆری خوێن و ئەندامەکان دەکەن، جومگەکان توندوتۆل وجێگیر دەکەن و بەگشتی هۆکارن بۆ وەستانی پەیکەری ئادەمیزاد بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و ڕۆلێکی دیارو کاریگەریشیان هەیە لە دروستکردنی گەرمی لەش.[2] ژمارەی ماسولکەکانی ناو لەشی مرۆڤ لە 600 ماسولکەی گەورەو بچوك زیاترە، کە هەندێکیان چەند

1—Thibodean AG &Patton TK (2003). *Anatomy&Physiology*. P: 210.
- Rouviere J P. *Anatomic Topography*. P: 17.
2— John W&Jr W (2001). *Human Anatomy& Physiology*. P: 268.

کیلۆگرامن و هەندێکیان تەنها سانتیمترێکن لە درێژی، هەیانەش بە ئاسانی نابینرێ وەك ماسولکەی ناو گوێچکە. بەگشتی ماسولکە40-50 ٪ ی کێشی لەش پێکدەهێنێ.[1]

## بەشەکانی پەیکەر کۆئەندام

ئێسکانە پەیکەر لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

**برگەی یەکەم ، تەوەرە پەیکەر (الهيكل المحوري-** Axial skeleton).

لەو ئێسکانانە پێکهاتووە کە دەکەونە ناوەڕاستی لەش وژمارەیان80 ئێسکانە، ئەمانەن: کەللەسەر، ئیسقانی لامی، بڕبڕەی پشت، قەفەزەی سنگ.

**برگەی دووەم، پەلە پەیکەر(الهيكل الزائدي-**Appendicular skeleton).

لە ئیسکانی هەردوو پەلەکانی سەرەوەو خوارەوە پێکهاتووە وژمارەیان 126 ئێسکانە. لەبەر بەیەکچونی زۆربەی ئەم ئیسکانانە لە هەردوو ڕەگەز، تەنها ناومان بردن و ژمارەمان کردن.

**برگەی یەکەم: تەوەرە پەیکەر**

یەکەم: کاسە سەر(الجمجمة-Skull).

لە 22 ئێسکان پێکهاتووە و دوو کۆمەل پێکدەهێنن:

أ- ئێسکانی کاسەی سەر(عظـــام القحـــف- Cranial bones) دەماغ لەناوی جێگیر بووە و دەیپارێزێت و ژمارەیان 8 ئێسکانە.

ب- ئیسکانەکانی دەم وچاو ژمارەیان 14 دانەیە.

---

1ـ عايدة عبد الهادي، فسيولوجيا جسم الإنسان، ص388.

## جیاوازی نێوان کاسە سەری پیاوو ژن:[1]

1- بە شێوەیەکی گشتی کاسە سەری ژن بچوکترو سوکترە لە کاسە سەری پیاو.

2- کاسە سەری ژن کەمێك درێژترە لە ڕووی ئەستونیەوە لەوەی پیاو.

3- ڕوی پێشەوەی کاسە سەر لە ژنان خرو پانترە لەوەی پیاوان.

4- ئەو بەرزبونەوەی ئێسکانی پشتە گوێ کەمتر دیارە لە ژنان لەوەی پیاوان.

5- خاڵی پێکەوەلکانی ماسولکەو ئێسکانەکان کەمتر دیارن و توندوتولیشیان کەمترە لە ژنان. بنواڕە شێوەی ژمارە 2: کاسە سەر.

لەبەر ئەم جیاوازیانە، سەرو دەم و چاوی ڕەگەزی مێینە جوانترو خرپانترە، بەرزی و نزمی کەمتر پێوەدیارە لەسەر برۆو دوای گوێچکەو چەناگەی.

**دووەم: بڕبڕەی پشت(العمود الفقري-** Vertebral column).

بڕبڕەی پشت لە بنکەی کاسەی سەر تا وەکو کلێنجە درێژ دەبێتەوە، لە زنجیرەیەك ئێسکان پێکهاتوەو ناسراون بە بڕبڕە. لە تەمەنی منداڵی ژمارەیان 33 بڕبڕەیە، بەڵام کاتی پێگەیشتن و گەنجیەتی ژمارەیان 26 بڕبڕەیە، 5 لەم بڕبڕانە یەکتری دەگرن و ناوچەی سێ بەندە(العجز- Sacrum) پێکدەهێنن، 4 بڕبڕەی تر یەکدەگرن و ناوچەی کلێنجە پێکدەهێنن(العصعص- Coccyx). بەمەش 24 بڕبڕە دەمێنێتەوە و بەم جۆرە دابەش دەبن: بڕبڕەکانی ناوچەی مل 7، بڕبڕەکانی ناوچەی سنگ 12، بڕبڕەکانی ناوچەی کەلەکە(القطنية)5، لەگەڵ کلێنجەو سێبەندە ژمارەیان دەبێتە 26.

بڕبڕەی پشت درکە مۆخی لەخۆگرتوەو دەیپارێزێ، کاسەی سەریشی هەڵگرتووە، پەراسوەکان و ماسولکەکانی پشتی پێوەلکاوە.

---

1- Kevin.T.P& Gray.A. *Anatomy& Physiology*. P:213-227.
- John.W.H, JR, *Human Anatomy&Physiology*. P: 217.

ينظر: قرشي محمد علي وطاهر عثمان علي،التشريح البشري الوظيفي، ص516-520.

وريتشارد سنل، التشريح السريري لطلبة الطب، ص854-859.

بە شێوەیەکی گشتی بڕبڕەی پشتی نێرینەی تەواو، نزیکەی 70سم دەبێت، بەڵام لەمێینە 60 سم.[1]

بەگشتی گەنجی کوڕ لە کچان درێژترن، ئێسکانەکانی درێژترەو گەورەترەو قورسترە، هەروەها ماسولکەکانی بەقەبارەترە، ئەمەش وای کردووە کەوا شێوەکەی زبر وتوند دیار بکەوێت(أكثر خشونة)، ئەمانەش بە هۆی کاریگەری هۆرمونەکانی گەشەو ڕژێنەی سەرگورچیلەو دەرەقی یە. توانای ماسولکەو ژێ و جومگەکانی پیاوان بەهێزو توندوتۆڵە ئەمەش وای کردووە پیاوان کورج وگۆلتر بن لە کاتی مناوەرەو سورانەوەی ناکاو.

لەلایەکی ترەوە کچی پێگەیشتوو کورت تر دیارە، ئێسکانەکانی بچوکترو سوکترە وماسولکەکانی قەبارەی کەمترە، بەڵام ڕێژەی چەوری لەشیان زۆر زیاترە لە کوڕان بەتایبەتی لە سەر سنگ و مەمك و شان و کەلەکەو ڕانیان. ئەمانەش وای کردووە کچان خڕوخۆلتر بن لەکوڕان و جوانتر دیاربن لە شێوەو ئەدگاری دەرەوە.[2]

لەبەر ئەم هۆیانەو هەندێ هۆکاری تری جەستەیی ودەروونی وهورمۆنی[3] خوای گەورە لە سەر ئافرەتانی واجب نەکردووە سوارچاکی وزۆرانبازی وڕمبازی وکوشتارکردن لە گۆرەپانی شەڕ، بەڵام گەر بەشداری کرد، ئەرکی گونجاو بۆ ئەو بریتی یە لە خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و پزیشکی وهاندان.

**سێیەم: قەفەزەی سنگ (کۆڵەو پەراسوەکان).**

پێکهاتوویەکی تەخت ودرێژە، لە سێ ئێسکانی پێکەوەلکاو پێکهاتووە و دەکەوێتە پێشەوەی سنگ، درێژیەکەی 15– 20 سم دەبێت و لای خوارەوەی

1- Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiology*. P: 232.
2– Kenneth LB ( 1990). *Principle& Practice of Endocrinology*. P: 1596.
-Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiology*. P: 138.

3– درێژەی ئەو هۆیانە لە بەشەکانی داهاتوودا باس دەکەین. لە بەرگی دووەم باسێکی تێرو تەسەلی ئەو بوارانەی کە گونجاون بۆ ئافرەت کاری تیادا بکات، لەگەڵ هێنانەوەی بەڵگەی پزیشکی وشەرعی دەکەین (بە پشتیوانی خوا).

تیژەو لەهەردوو تەنیشتەوە پەراسوەکانی پێوە بەندە.

ئێسکانی کۆڵە لەپیاوان درێژترو ئەستورترە لەوەی ئافرەتان، پشتێنەی شان و پەراسوەکانی پیاو فراوانترە ئەمەش بە هۆی ئەوەیە کەوا سیەکانی پیاو لە قەبارەو کێش زیاترن لەوەی ئافرەتان وبەهۆی جیاوازی جۆرو شێوەی هەناسەدانە.[1] بنواڕە شێوەی ژمارە 3: قەفەزەی سنگ.

**چوارەم: پشتێنەی حەوز ( حزام الحوض-الورك - Pelvic-hip-girdle ).**

ئیسکانەکانی حەوز لە دوو لای وەك یەك پێکهاتووە ، هەردوولا لە ڕوی پێشەوە یەکتری دەگرن بەهۆی گرێی موسلدانە (الارتقاء العاني-Pubic symphisis) ولە دواوەش بەستراون بە ئێسکانی سیێ بەندەوەو وەك پشتێنەیەکی لێهاتووە. ئەو پشتێنە هێزو توانا دەبەخشێ بە پەلەکانی خوارەوە تاوەکو بتوانێ بەشێك لە کێشی لەش هەڵگرێ. هەر لایەك لە حەوز لە سێ ئێسکان پێکهاتووە: کلۆت (الحرقفة -Iliam )، موسولدانە (العانة- Pubis) ، سمت (الاسك- Ischiam)

ئەم سێ ئێسکانە لە تەمەنی 17 سالیدا یەکتری دەگرن لە ناوچەی (الحق- Acetabulum ) کە بریتیە لە چالێکی نیوە بازنەیی پێی دەڵێن: (قولکە بۆشایی) لە ڕوی دەرەوەی حەوزەو لەگەل سەری ئیسکی ڕان یەکتری دەگرن وجومگەی حەوز پێکدەهێنن (Hip joint).

کونێکیش لە نێوان ئێسکی سمت وموسڵداندا هەیە پێی دەڵێن (داخراوە کون) بەپەردەیەکی بەهێز داپۆشراوەو هەندێك موولوولەی خوێن ودەماری پێدا دەڕوات تا پەلی خوارەوە.

ئێسکانەکانی پشتێنەی حەوزو سێ بەندەو کلینجە حەوز پێکدەهێنن، دوو حەوزیش هەیە: حەوزێکی دڕێنەی گەورە کە دەکەوێتە لای سەرەوە و بە ئێسکان دەورە نەدراوە وهەندێ پارچەی کۆئەندامی هەرسی تیایە وحەوزێکی ڕاستەقینەی بچوك لە لای خوارەوە کە بە کە کلینجەو موسلدانە وکلۆت دەورەدراوەو دەروازەی

1- Keith LM & Arther FD. *Clinical Oriented Anatomy*. P: 61.

(مدخل) چوونە ژوورو دەرەچەی هاتنە دەرەوەی(المخرج) هەیە.[1]

گەر بە ووردی سەیری شێوەی حەوزی هەردوو ڕەگەز بکەین جیاوازی زۆر بەدی دەکرێت لە نێوان حەوزی نێرەو مێ یە، ئەو جیاوازیانە هەموویان هاوکارن بو کرداری سك پربوون ومناڵ بوون وجیاوازیەکانیش ئەمانەن:[2]

1- ئێسکانەکانی حەوزی نێرینە قورس وزبرە، ماسولکەو ژێ یەکانی کە پێوەی بەندن توندو بەهێزن. لە مێ یە ئیسکانەکان سووك وناسك ولوسە، ماسولکەو ژێ یەکانی نەرمن وتوانای کشانیان زۆرە.

2- دەروازەی حەوزی ڕاستەقینە لە مێ یە بازنەیی یە، بەلام لە نێرە بچوکترەو، لە شێوەی دڵ دایە.

3- حەوزی ڕاستەقینە لە مێ یە فراوانترە و چالایی کەمترە بەبەراورد لەگەل نێرە.

4- دەرەچەی هاتنە دەرەوەی حەوزی ڕاستەقینە لە مێ یە فراوانترە.

5- گۆشەی کەوانەی موسلدانە لە مێ یە 90 پلەیە، بەلام لە نێرە گۆشەکەی تیژە.

6- گرێی موسلدانەو دڕکە سمت لە مێ یە بۆ ڕووی دەرەوە لاربوونەتەوە تاوەکو لە کاتی کرداری گەشەی کۆرپەلە ومنداڵ بوون نازاری کۆرپەلە نەدات.

7- کلینجە لە مێ یە کورترو فراوانترو تەخت ترە بەبەراورد لەگەل کلینجەی نێرە.

8- پارچە ئیسکانە دەرچووەکانی کلینجە لە مێ یە کەمترن وبچوکترن.

---

1– *John WH , JR. Human Anatomy & Physiology.* P: 215-216.
- Stuart C &Cristoph J ( 2000). *Obstetric by ten teachers.* P: 104.
2– *Gray AT& Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 247.*
- *John WH, JR . Human Anatomy&Physiology. P: 217.*

ينظر: ريتشارد سنل، التشريح السريري لطلبة الطب، ص363. ومحمود بدر،الأساسيات في تشريح الإنسان، ص148. وقرشي محمد علي، التشريح البشري الوظيفي، ص240. والمسط، الجسم البشري، 250/1.

9- شێوەی داخراوە کون لە مێ یە سێ گۆشەیی یە، لە نێرە هێلکەیی یە.

10- ئیسکانەکانی سێ بەندە لە مێ یە زیاتر توانای جولەی هەیە.

11- گۆشەی کلێنجەو کەلەکە کەمتر بەرەو ناو حەوز بۆتەوە، ئەمەش وای کردووە تیرەی حەوز زیاد بکات لە ڕووی پێشەوەو پشتەوە.

تیرەی حەوز (لە ئاستی دەروازەی هاتنە ژوورەوە) لە پێشەوە بۆ پشتەوە کە بریتیە لە ماوەی نێوان ناوەڕاستی موسلدانەو کلینجە نزیکەی 11 سم دەبێت، تیرەی حەوز لە تەنیشتەکان واتە لە ڕاست بۆ چەپ 13 سم دەبێت. هەردوو تیرە لە مێ یە 1 سم زیاترە بەبەراورد لەگەل نێرە. تیرەی حەوز (لە ئاستی درەچە) لە پێشەوە بۆ پشتەوە 13.5 سم، تیرەی لە ڕاست بۆ چەپ 11.5 سم دەبێت، بەلام بۆ حەوزی نێرە تەنها 8.5 وە 8 سم دەبێت بۆ هەردوو تیرە یەك لەدوای یەك.[1]

شتێکی بەڵگە نەویستە کە حەوزی ئافرەت جیاواز بێت لە حەوزی پیاو، چونکە کارێکی گرنگی لەسەرە، بۆیە پێویستی بە چەند سیفەتێکی پێویست هەیە کە حەوزی پیاو ئەم پێویستیەی نیە. ئەم کارە گرنگەش بریتیە لە گەشەو خواردن پێدان و پاراستن وهاتنە دەرەوەی کۆرپەلەو پارچە پێوەلکاوەکانی ترە کاتی لەدایکبوون. بەکورتی ئەم شێوە تایبەتەی حەوزی ئافرەت وادەکات کاری لەدایك بوون ئاسان بکات بۆ هەردوولا، دایك و کۆرپەلە.

پاش لێکۆلینەوە لە ئێسکانەکانی حەوزی ئافرەت، دەبینین بەگشتی ئێسکانی ئافرەت بەشداری دەکات لە هەندێ سیفاتی فیتری پەیوەست بە ڕەگەزی مێینە، وەك ناسکی وسووکی ئێسکانەکان وتەختی وکەمی گرێ وگۆل وزبری وتیایدا، زیادی لوسی و کەمی قولی چالەکانی. لەلایەکی ترەوە سیفەتەکانی ئێسکانی پیاو پێچەوانەی سیفەتەکانی ژنانە. بنواڕە شێوەی ژمارە 4: حەوزی مێینەو نێرینە —[2]

---

1_ Stuart C &Cristoph. *Obstetric by ten teachers*. P: 105 -106.

2- Keith LM& Arther FD. *Clinical Oriented Anatomy*. P: 337.

## بەندی دووەم: پێکهاتەی تویکاری وکارئەندمزانی کۆئەندامی دەمار

کۆئەندامی دەمار لەکاتی دروست بوونی لە کورپەلە بە قۆناغی زۆردا تێدەپەرێت تاوەکو دەگاتە کێش وقەبارەی گونجاوی خۆی لە تەمەنی گەنجیەتی. زیاتر لە هەموو کۆئەندامەکانی تری لەش تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە پێشەوای هەموو کۆئەندام وئەندامەکانی تر دەژمێردرێ، بە هاوکاری لەگەل کویرەگلاندەکان ئەرك وفەرمانی هەموو ئەندامەکانی تری لەش رێکدەخەن وئاراستەو کونترۆڵی دەکەن. بە ووردترین وئالۆزترین ئەندامی لەش دەژمێردرێ وتاوەکو ئێستاش زانایان زۆر لەلایەنە شاراوەکانی ئەو ئەندامە نازانن.

کۆئەندامی دەمار لە رووی پێکهاتەوە دوو بەشی سەرەکیە: ناوەندە کۆئەندامی دەمار و چیوە کۆئەندامی دەمار. لە رووی کردارەوە سێ بەشی سەرەکیە.

### برگەی یەکەم: ناوەندە کۆئەندامی دەمار( الجهاز العصبي المركزي

(Central nervous system–

بریتیە لە ناوەندی تەحەکوم وکونترۆلی هەموو کۆئەندامی دەمار، چونکە هەموو هەستەکانی لەش دەبێت بچێتە ناوەندە کۆئەندامی دەمار تاوەکو بتوانێ شیبیان بکاتەوە، تەفسیرو مانایان بۆ دیاری بکات و وەلامیان بداتەوە. هەموو فەرمانەکانی تر بۆ رژێنەگلاندەکان وجولەی ماسولکەکان وکارەکانی تری پێویست لەوێوە دەرچێت.

ناوەندە کۆئەندامی دەمار لە رووی پێکهاتنەوە لە دوو بەش پێکدێت: دەماخ و درکە پەتك، بە هەمان شێوە لە رووی کارو کردارەوە دەکرێتە دوو بەشەوە: کۆئەندامی دەماری جەستەیی (جهاز عصبي جسدي- Somatic nervous system) وکۆئەندامی دەماری خۆیی(جهاز عصبي مستقل- Autonomic nervous system). کۆئەندامی دەماری جەستەیی فەرمان لە ناوەندە کۆئەندامی دەمار دەگوازێتەوە بۆ ماسولکەکانی لەش بۆ جولانەوەیان، ئەم جولانەوەش بە ئارەزووی مرۆڤە(الارادية)، بەلام فەرمانی کۆئەندامی دەماری خۆیی گواستنەوەی

فەرمانەکانی ناوەندە کۆئەندامی دەمارە بۆ ئەندامەکانی لەش بە شێوەیەکی خۆنەویست، وەك رێکخستنی لێدانی دڵ، دەست بەسەراگرتنی هەناسەدان و رژێنەکانی کۆئەندامی هەرس و ئارەق کردن وماسولکە لووسەکان وەی تریش. ئەم کۆئەندامەش دەکرێت بە دوو بەشەوە، یەکەمیان بەشی بە سۆز( تقسیم ودي- Sympathetic division) ، دووەمیان بەشی تەنیشت (هاوسێ ی) بەسۆزە، (تقسیم لا ودي- Parasympathetic division) کە کاری یەکێکیان پێچەوانەی کاری ئەوی تریانە وەك ئەوەی گەر یەکیان رژێنەی گلاندێك زیاد بکات، ئەوا بەشەکەی تر رژێنەی گلاندەکە کەم دەکاتەوە.[1]

**یەکەم : دەماخ (الدماغ- Brain ).**

لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

1- قەدە دەماخ (جِذع الدماغ- Brain stem) لەمانە پێکهاتووە:

أ- لاکێشە مۆخ (النخاع المستطيل-Medulla Oblongata ).

ب- پرد (الجسر-pons ).

ج- ناوەندە دەماخ (الدماغ المتوسط-mesencephalon-Midbrain ) .

2- نێوانە دەماخ (الدماغ البيني- Diencephalon) پێکهاتووە لە:

أ- لانك (المِهاد-thalamus ).

ب- (الوَطاء-hypothalamus ) .

3- مێشك (المخ-Cerebrum): لە دوو نیوە گۆی لای ڕاست وچەپ پێکهاتووە.

4- مێشکۆکە (المخيخ- cerebellum).

لەبەر گرنگی دەماخ خودای گەورە لەناو سندوقێکی بەهێزی داناوە(کاسە سەر)

1_ Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 435.
-John WHole, JR . Human Anatomy &Physiology. P: 400- 405.
-Keith LM & Arther FD. Clinical Oriented Anatomy. P: 38

کە توانای زۆر هەیە بۆ بەرهەڵست کردنی صەدمەکان (الصدمات)، توانای بەرگری پاڵەپەستۆی زیاتر لە 50 پاڵەپەستۆی هەوا/ سم[2] هەیە.[1]

دەماخ لە ئەندامە گەورەکانی لەش دەژمێردرێ وکێشی نزیکەی 1300–1400 گرام دەبێت، واتە 2٪ ی کێشی لەشە. کێشی دەماخ لە پیاو 100 گرامی زیاترە لە ژن، کێشی دەماغ لەگەل بەرەو پێشەوە چوونی تەمەن کەم دەکات.[2] هیچ پەیوەندیەکیش نیە لە نێوان کێشی دەماخ وزلێری کەندۆکەو پلیکەکانی ناو دەماخ لەگەل ئاستی زیرەکی، هەروەك پێشتر زانایان وای بۆ دەچوون.[3]

دەماخ پێکهاتووە لە زیاتر لە هەزار بلیون دەمارە خانە[4]، تیرەی لەپێشەوە بۆ پشتەوە 16 سم، تیرەی لە ڕاستەوە بۆ چەپ 14 سم، بەرزیەکەی 12 سم. لە ئافرەت تێکرایی 1 سم کەمترە لە پیاو.[5]

خانەکانی دەماخ دوو جۆرە: خانەکانی مێشك (الخلايا الدماغية– Neurons)، کە کاروفەرمانی داهێنان وزیرەکی وسۆزو هۆشی لە ئەستۆ دایە، گونجاندن و پێکەوەلکاندنی زانیاریەکانی هاتوو بۆ ناو دەماخ دەکەن. ژمارەی ئەم خانانە نزیکەی 100 ملیار خانەیە. یەکێك لە تایبەتمەندیە هەرە گرنگەکانی ئەم خانانە ئەوەیە کە نە زۆر دەبن و نەدەجولێن، بەڵکو لەگەل درێژی تەمەنی ئادەمیزاد بەم شێوەیە دەمێننەوە. ئەگەر ئەم خانانە وەك خانەکانی تری لەش لە زۆربوون و نوێ بوونەوەدا بوونایە، ئەوا بیرەوەری وکەسایەتی ئادەمیزاد وفێربوونەکانی لە گۆڕانی بەردەوام دەبوو وپێویستی بە نوێ کردنەوە دەست پێکردنەوەی خوێندن وفێربوون

---

1ـ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص47.

2ـ أحمد كنعان، موسوعة الجسم الإنسان، ص47. والمط، محمد فائز، الجسم البشري، 169/2.

- *Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 383.*

3ـ موريس بوكاي، ما أصل الإنسان ، ص136.

4ـ كنجو، خالص جلبي، الطب محراب الإيمان، 95/1 .

- *Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 383 .*

5ـ المط، محمد فائز، الجسم البشري، 369/2.

دەبوو پاش هەموو صەدمەیەکی تون[1]

جۆری دووەمی خانەکانی دەماخ خۆی لە خانەی پارێزەر دەنوێنێ بۆ خانەکانی جۆری یەکەم (خلايا داعمة للأولى– Neuroglia )، لە ژمارە نایەن لە زۆری ودەڵێن زیاترە لە 900 ملیار خانەو پێنج جۆری جیاوازی هەیەو کاروفەرمانی زۆریشیان هەیە، وەك: گەیاندنی خواردن بۆ خانەکانی دەماخ وپارێزگاری کردنی وجیاکردنەوەیان لە یەکتری، واتە وەك شانە ناوەندیەکان کاردەکەن.[2] یەکێك لە تایبەتمەندیان ئەوەیە توانای جولەو زۆربونیان هەیە بەتایبەتی کاتێ دەماخ توشی برین وهاوسان دەبێت (وذمة الدماغ– Brain Edema).[3]

هەرچەندە دەماخ 2٪ی کێشی لەش پێکدەهێنێ بەڵام زیاتر لە 20٪ی ئوکسجینی ناو خوێنی لەشی بەکاردەهێنێ. کەواتە دەماخ چالاکترە لە هەموو ئورگانەکانی تری لەش لە زیندەچالاکیدا (میتابولیزم)، بڕی ئەو ئوکسجینەی بەکار دەهێنێ لەسەرچالاکی دەماخ وکارەکانی دەوەستێت.[4] بنوارە شێوەی ژمارە 5: دیمەنی ناوەوەی دەماخ وسوڕانی شلەی دەماخ وشلەی دڕکی.[5]

پێکهاتەی دەماخ زۆر ئاڵۆزەو بەجۆرێك کە عەقل وهۆش وبیرو ئەندێشەو سۆزو بەزەیی و زۆری تر لەو ووشانەی کە ڕۆژانە بەکاریان دەهێنین وپەیوەندیەکی توندیان هەیە بە مرۆڤەوە تاوەکو ئێستا ئادەمیزادو زاناو فەیلەسوفەکان نەیان توانیوە بە شێوەیەکی وردو ڕاست ودروست ماناو تەفسیری بۆ بکەن، هەرچەندە زانست و تەکنۆلۆژیا گەیشتۆتە پلەیەکی بەرزو پێشکەوتوو توانیویەتی ژمارەیەك لە

---

1 –*Keith LM & Arther FD. Clinical Oriented Anatomy*. P: 66.

هەندێك لێکۆڵینەوە ئەگەری بوونی جولەو زۆربوون لە هەندێ خانەی دەماخ دەکەن لەناوچەی دەزگای حوفی (الجهاز الحوفي) "*Limbic System*" وئەسپی دەریایی (الحصان البحري) "*Hippocampus*"، کە هەردووکیان دەکەونە توێکڵی دەماخ وپەیوەندیان هەیە بە داکردن (خزن) و لێکدانی زانیاری وگونجاندنیان لەگەڵ یەکتری، واتە پەیوەندیان هەیە بە بیرکردنەوەی درێژ خایەن.

- *Malvolm BC & Jerom S* (1993). *Human Neuroanatomy*. P: 239.

2–Malvolm BC & Jerom S. *Human Neuroanatomy*, P: 134.

3– Malvolm BC & Jerom S. *Human Neuroanatomy*. P: 14

4–Kevin TP& Gray A *Anatomy & Physiology*. P: 377-380.

5–Keith LM & Arther FD. *Clinical Oriented Anatomy*. P: 890.

هۆرمون وئینزیمەکان و بنکە هەستیارو گرنگەکانی ناو مێشك بدۆزێتەوە. تاوەکو ئیمڕۆ زانایان نەیان توانیوە ئەم نهێنیە بدۆزنەوە و وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە کە دەڵێ: ئایا گەورەیی مێشکی پیاو کاریگەری هەیە لە سەر ئەوەی کەوا پیاوان لە داهێنان ودۆزینەوەو زیرەکی باڵا ترن لە ئافرەتان؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زانایان دوایان خستووە تاوەکو زیاتر شارەزا دەبن لە کاری دەماخ، تاوەکو پێشکەوتنی تری زانستی پزیشکی وفیزیاوی بەدەست دەهێنن.[1]

بە شێوەیەکی گشتی دەبینین نێرینە لە کاروپیشەی میکانیکی و لێخورینی ئوتوموبیل وتوانستی کردارەکانی حیسابی وبیرکاری ودارشتنی ئەندازەیی وزۆری تر لە زانستەکان لە پێشەنگدایە وزۆربەی داهێنەرو زانا وبلیمەتەکان(العباقرة) لە رەگەزی نێرینەن لە گشت بوارەکانی زانستدا. کەواتە نێرینە زاڵە لە دەست بەسەرداگرتنی بەسەرگشت داهێنەرە زانستیەکان وبێگومان ئەم کارە لەژێر ڕکێف و ئارەزووی ڕەگەزی نێرینە خۆی نیە، بەڵکو لە ئەنجامی ژمارەیەك هۆکاری بایولۆجی ئالۆزەوە ڕوودەدات.[2] هەر بۆیە خوێنەری مێژوو، ژمارەیەکی زۆر کەم لە ئافرەتان دەبینێ لە نێوان لیستی داهێنەرو زاناو داناو فەیلەسوفەکان وگەر هەشبێ لە دەگمەنەکانە(نامۆ).

## دووەم : دڕکە پەتك (الحبل الشوكي - Spinal Cord ).

لە شێوەی پەتێکی لوولەکیدایەو لە ماددەیەکی مۆخی پێك دێت کە دەمارەخانەو تەوەرەکانی تێدایەو تێکڕای درێژی یەکەی 45 سم دەبێت لە کۆتایی لاکێشە مۆخەوە دەست پێ دەکات تا ئاستی دوا بڕبڕەی کەلەکەو لە 31 پارچە پێکهاتووە، هەریەك لەو پارچانە جووتێك مێشکە دەماری لێ دەردەچێت بۆ لەش لە لای ڕاست و چەپ. 8 جووت دەمار بۆ ناوچەی مل (Cervical Nerves) ، 12

1—Peter LW & Roger W (1995). *Functional Neuroanatomy Of Man*. P: 746/2.

2— یا إبراهيم، سايكولوجية المرأة، ص164-18.

جـووت بـۆ ناوچـەی سـنگ(Thoracic Nerves )، 5 جـووت بـۆ ناوچـەی کەلەکـە(Lumber Nerves)، 5 جـووت بـۆ ناوچـەی سـێ بەنـدە (Sacral Nerves)، 1ـ جووت بۆ ناوچەی کلێنجە (Coccygial). درکە پەتك کاروفـەرمانی زۆری هەیـە لەمانـە: وەك ڕێڕەوێـك کاردەکـات کـە فـەرمانـەکان لـە دەماخـەوە دەگوازێتەوە بۆ ڕژێنەگلاندەکان وماسولکەو ڕیخۆلەو بۆریەکانی خوێن، لە لەشـەوە ئاگاداریـەکان و بزوێنـەکان دەگوازێتـەوە بـۆ دەمـاخ. ڕێکخستنی کـاری ماسـولکە خۆییەکان بەهۆی گرێ ودەمارە خانە تێکهەڵچووەکان ئەنجام دەدات.[1]

## برگـەی دووەم : چـێوە کۆئەنـدامی دەمـار (الجهـاز العـصبي المحيطـي- (Peripheral nervous system).

لـە زۆر کۆمەڵـە دەمـار پێـك دێـت کـە بەهـەموو لایـەکی لەشـدا بڵاوبوونەتـەوە، فرمانیان گەیاندنی هەموو جۆرە هاندەرێکە لـە هەسـتە ئەندامەکانـەوە بـۆ ناوەنـدە کۆئەندامی دەمـار(Efferent system )، وەڵام دانەوەیـەتی لـەو کۆئەندامـەوە بـۆ هەموو ئەندامەکانی لەش وەك ماسوولکەمان و ڕژێنەکان(Afferent system) وئەو دەمارانە چوارپەل دەبەستن بە مەڵبەندەکان وئەوانیش بە چوار پەل دەبەستنەوە. چێوە دەمارەکان لە درکە دەمارەکان وکاسە دەمارەکان و دەمارەکانی دەمارە کۆ ئەندامی خـۆیی پێـك دێـن. لەبـەر ئـەوەی جیاوازیـەکی ئـەوتۆ نیـە لـە نێـوان ئـەم کۆئەندامەوە لە هەردوو ڕەگەز بۆیە بەکورتی لەسەری دواین.

کورتەی جیاوازیە سەرەکیەکانی نێوان کۆئەندامی دەماری هەردوو ڕەگەز:

1- کێشی دەماخی پیاو 100 گرامی لە ژن زیاترە.
2- تیرەی دەماخی پیاو زیاترە لەوەی ژن.
3- درێژی درکە پەتك زیاترە لە پیاو بەبەراورد لەگەڵ ئافرەت .
4- زۆربـەی بوارەکـانی زانسـت وداهێنـان ودۆزینـەوەو توێژینـەوە پیـاوان بـاڵا

---

1ــ مفيد حنون، أساسيات في علم وظائف الأعضـــاء، ص58.

دەست بوون تیایاندا بە درێژایی مێژوو.

5- جیاوازیەکانی دەرونی پەیوەست بە عەقل وبیرو هۆش لە بەشی سێیەم بە درێژی باس دەکەین.

# باسی دووەم

## پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆئەندامی سووڕان و هەناسەدان

### بەندی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆئەندامی سووڕان

برگەی یەکەم: دڵ

برگەی دووەم: خوێن

یەکەم: پلازما

دووەم: خڕۆکەکانی خوێن

### بەندی دووەم: پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆئەندامی هەناسەدان

برگەی یەکەم: قوڕگ

برگەی دووەم: سی یەکان

## پێکهاتەی توێکاری و کارئەندامزانی کۆئەندامی سووڕان

کۆئەندامی سووڕان لە دڵ وبۆڕیەکانی خوێن و خوێن پێکدێت. لەبەر ئەوەی هیچ جیاوازیەکی وا بەرچاوو سودمەند نیە بۆ باسەکەمان لە نێوان بۆڕیەکانی خوێن لە هەردوو ڕەگەزدا بۆیە باسی ناکەین، تەنها باسی دڵ وخڕۆکەکانی ناو خوێن دەکەین.

### بڕگەی یەکەم: دڵ (القلب - Heart).

دڵ ئەندامێکی ماسولکەیی شێوە قووچەکی یە، بنکەکەی بۆ سەرەوەو لووتکەکەی بۆ خوارەوەیە، دەکەوێتە ناو قەفەزەی سنگەوە، لە نێوان هەردوو سی دا کەمێك بەلای چەپدا لارە لەبەر ئەوە لە نێوان پەراسووی 5-6 لای چەپدا هەست بە لێدانی دەکەین. دڵ بە پەردەیەك دەورە دراوە ناو دەبرێت بە پەردەی توێی دڵ (تامور). دڵ لە دوو نیوە پێك دێت، بەربەستێکی ماسولکەیی لێکیان جیا دەکاتەوە. هەر نیوەیەکیش پێك دێت لە هۆدەیەکی سەرووی دیوار تەنك پێ ی دەڵێن گوێچکەلە وهۆدەیەکی خوارووی دیوار ئەستوور پێ ی دەڵێن سکۆڵە. هەر گوێچکەلەو سکولەیەکیش، لەلای ڕاست یان لای چەپ، بە پێکهاتووەکی ڕیشاڵی، لێك جیا دەبنەوە کە هاتو چۆی خوێن لە گوێچکەلەوە بۆ سکۆلە ڕێك دەخات پێ ی دەڵێن زمانەی دڵ. زمانەی لای ڕاستی دڵ لە سێ پەڕەکەی پەردەیی پێك دێت پێی دەڵێن زمانەی سیانی. هەرچی زمانەی چەپیشە تەنها لە دوو پەڕە پێك دێت، پێ ی دەڵێن زمانەی دوانی یان (تاجی).

قەبارەی دڵ لە کەسێکی تەواوی پێگەیشتووی بالآ مام ناوەندی 12سم درێژو، 9 سم پان و 6 سم ئەستورە. [1] کێشی لە نێوان 250- 350 گرام دەبێت، بە تێکڕایی 310 گرام بۆ پیاوان و 260 گرام بۆ ژنان. [1]

---

1- قرشي محمد علي، التشريح البشري الوظيفي، ص76.
- Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiology*. P: 557-559.

ماسولکەکانی دڵ لەجۆری خۆنەویستی هێڵدارن، بەشێوەیەکی وا دابەش بوون و چونەتە ناویەك کەوا هیچ مانوبوونێك بۆ دڵ دروست نەبێت کاتی کارکردنی، هەربۆیە چەندەها ساڵ کاردەکات بێ وەستان.

دەروازەی نێوان گوێچکەلەو سکوڵەی لای ڕاست چیوەکەی دەگاتە 1.2 سم بۆ پیاوان و 1.05– 1 بۆ ئافرەتان و دەروازەی نێوان گوێچکەلەو سکوڵەی لای چەپ 1.10 سم بۆ پیاوان و 0.9 سم بۆ ئافرەتان.[2]

## بڕگەی دووەم: خوێن (الدم - Blood).

شلەیەکی ڕەنگ سووری لینجە، لە شلەی پلازما (Plasma) وخڕۆکەکانی خوێن پێك دێت و نزیکەی 7٪ ی کێشی لەش پێك دێنێت. شلەی پلازما چەند جۆر خوێ و ماددەی پرۆتینی تیایە.

قەبارەی خوێن لە لەشی مرۆڤی پێگەیشتوودا لە نێوان 5– 6 لیترە بۆ پیاو،4–5 لیترە بۆ ژن. ئەمەش بە هۆی ئەوەیە کە ڕێژەی ماسولکە لە پیاوان زیاترەو ڕێژەی چەوریش لە ئافرەتان زیاترە.[3] بنواڕە شێوەی ژمارە 6: دڵ ودەروازەکانی.[4]

## پێکهاتەکانی خوێن:

### یەکەم : شلەی پلازما

ڕێژەی90 ٪ی شلەی پلازما ئاوە و ئەوی تری بریتیە لە خوێکانی کانزایی و ناکانزایی، گرنگترینیان خوی چێشتە (سۆدیوم کلوراید) وهەندێ مادەی پروتینی و چەوری وترشی ئەمینی وشەکری گلوکوزیشی تێدایە، ئەمانە بریتین لەو خواردنانەی

---

1ـ محمود بدر عقل، الأساسيات في تشريح الإنسان، ص265. والمط،الجسم البشري، 277/1.

- John WH, JR. *Human Anatomy&Physiology.* P: 557.

2 ـ المط، محمد فائز، للجسم البشري،284/1.

3ـ Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiology.* P: 531.

4ـ Keith LM& Arther FD. *Clinical 0riented Anatomy.* P: 123.

کە پاش هەرس ومژین چوونەتە ناو خوێن.

## دووەم : خرۆکەکانی خوێن

خرۆکەکانی خوێن دەکرێن بە سێ بەشەوە: خرۆکە سپی یەکان (الخلايا البيضاء Leukocytes )و خرۆکە سوورەکان (الخلايا الحمراء Erythrocytes)و پەرەکانی خوێن (الصفائح Platelets - Thrombocytes).

**أ-خرۆکە سپی یەکان:**

خانەی بێ رەنگن، شێوەیان جێگیر نیەو ، ناوکیان تیایە. تیرەی هەر خرۆکەیەکی سپی لە نێوان (6– 20) مایکرۆن دایەو ژمارەشیان لە مێ یەدا نزیکەی 6 هەزارو لە نێرەدا نزیکەی 8 هەزار خرۆکەیە لە هەر ملم $^3$. ئەم ژمارەیە لە منالان زیاترەو لەکاتی تووش بوون بە میکروب وبەکتریای نەخۆشی خرۆکە سپی یەکان ژمارەیان زیاد دەکات.

**ب- خرۆکە سوورەکان:**

خانەی خەپلەیی دوولا قۆپاون، پاش دروست بوونیان بە ماوەیەکی کورت ناوکیان تیا نامێنێت، تیرەی هەر خرۆکەیەك نزیکەی 7 مایکرۆنە، ژمارەیان لە نێرەدا 5.5 ملیون لە هەر ملم$^3$، بەلام لە مێ یەدا لم ژمارەیە کەمترەو نزیکەی 4.8 ملیون لە هەر ملم$^3$. خرۆکە سوورەکان لە منالّدا، پێش لەدایکبوون لە سپڵ و جگەردان ولەدوای لەدایکبوون لە مۆخی ئێسکدا، دروست دەبێت. ئەم خرۆکە سوورانە بۆیەکی سووریان تیایە پێ ی دەڵێن هیموگلۆبین کە تاکە لێپرسراوی گواستنەوەی ئۆکسجین ودووانە ئۆکسیدی کاربۆنە لە لەشدا. وە بڕی هیموگلوبین لە ناو خوێنی پیاو نزیکەی 14– 16 گرام بۆ هەر 100 میلیتر، لە ئافرەتدا 12– 14 گرامە. ئەمەش لەبەر بزربوونی بڕێکی زۆری هیموگلوبینە لە کاتی بێ نوێژی

دەگاتە 15- 30 گرام لە هەر سووڕێکدا، لە کاتی سک پڕی ومنداڵبوون زۆر لەوە زیاترە.[1]

## ج- پەڕەکانی خوێن.

تەنی بچوکی خەپلەیی یان هێلکەیی، بێ ناوك وبێ ڕەنگن. تیرەیان نزیکەی2-4 مایکرونەن ژمارەشیان دەگاتە نزیکەی 000 250- 500000 پەرەکە لە هەر یەك ملم[3] لە خوێن. فەرمانیان بەشداری کردنە لە کرداری مەیینی خوێن.[2]

## بەندی دووەم: پێکهاتەی تویکاری وکارئەندامزانی کۆئەندامی هەناسەدان

کۆئەندامی هەناسەدان لەم ئەندامانەی خوارەوە پێك دێت:

لووت (الأنف- Nose)، گەروو (البلعوم- Pharynx) ، قورگ (الحنجرة - Larynx )، بۆری هەوا (الرغامي- Trachea )، سی یەکان. لێرەوە تەنها باسی قورگ و سی یەکان دەکەین لەبەر بوونی هەندێ جیاوازی لە نێوان هەردوو رەگەزدا. بنوارە شێوەی ژمارە 7: کۆئەندامی هەناسە.

### بڕگەی یەکەم: قورگ (الحنجرة- Larynx).

پێکهاتوویەکی شێوە قوچەکی ناوپۆش کراوە بە لینجە پەردەیەك، دەکەوێتە سەرووی بۆری هەواوەو لە نۆ پارچەی کرکراگەیی پێك هاتووە، (3 پارچەی تاکن و 3 پارچەی جووتن). بەپەردەیەکی لاستیکی جیر بەیەکەوە بەستراون، گرنگترین ئەو پارچانەش پارچەیەکی بازنەیی ناتەواوو بەشی پێشەوەی دەرپەڕیوەو پێ ی دەوترێ سێوی ئادەم(تفاحة آدم-Adams Apple)، کە لە دوو پارچەی یەکگرتوو لە بەشی پێشەوەدا پێکهاتووەو لە بەشی سەرەوەی ملدا بە ئاسانی دەبینرێت. ئەم

---

1ـ أبو حامد، حسين سليم، مختصر الفسيولوجيا البشرية، ص304.
- John WH , JR . *Human Anatomy&Physiology*. P: 874.
2ـ *Gray A& Kevin T . Anatomy& Physiology. P: 541.*

بەشەش لە نێرینەی پێگەیشتوو زیاتر دەرپەڕیوە لەوەی ئافرەتان[1] وای کردووە کەوا گەردنی ئافرەت خۆی جوانتر بنوێنێ . دووەم پارچە کرکڕاگەی گرنگ بە زمانەی بچکۆلە ناو دەبرێ کە شێوە گەلایی یەو دەبێتە قەپاغی کونی زورنا (کونی سەرەوەی قورگ) مەلاشوو بۆشایی لووت دادەخات ونایەلێت خۆراك بچێتە ڕێڕەوی هەناسە. جووتێك لۆچی پەردەییش بۆ ناو بۆشایی قورگ درێژ دەبنەوە پێیان دەڵێن (دەنگە ژێکان) (الحبال الصوتية الحقيقية– True vocal cord) . کە لە سەرەوە بە هەردوو لای کرکڕاگەی یەکەمەوەو لە خوارەوەش بە کرکڕاگەی سێ یەمەوە بەستراون. دوو لۆچی تریش لە تەنیشتیانەوە هەن پێیان دەڵێن نادەنگە ژێکان (الحبال الصوتية الكاذبة – False vocal cord ). لە کاتی قسە کردندا، دەنگە ژێکان دەلەرنە لە ئەنجامی تێپەڕ بوونی ئەو هەوایەی کە لە سێ یەکانەوە دەردەچێت و بەسەر ژێکاندا دەڕوات، دەنگ دەردەچێت. هەر لەبەر ئەوەشە قورگ بە (سندوقی دەنگ) دادەنرێت. دەنگە ژێکان لە پیاوان درێژترو ئەستورترە لەوەی ژنان، ئەمەش وای کردووە دەنگی پیاوان لەحنی کەمترو، قولی وقەلەوی زیاتر بێت، بەڵام دەنگی ژنان بە پێچەوانەوە بە لەحن ترو ناسکترە.[2] بنوارە شێوەی ژمارە 8 : قورگ

**بڕگەی دووەم: سی یەکان (الرئة– Lung).**

بریتین لە دوو ئەندامی ئیسفەنجی نەرمی گەورەی شێوە قووچەکی کە زۆربەی بۆشایی سنگ داگیر دەکەن.

کێشی سیەکانی پیاو: 1200 گرامە، سی لای ڕاست 700 گرام ولای چەپ 500 گرام، بەڵام لە ئافرەت بە هەردوو سیەکان 1000 گرامە.[3]

1– John WH , JR. *Human Anatomy &Physiology*. P: 584.
2– Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiology*. P: 689-690.
- John WH , JR. *Human Anatomy&Physiology*. P: 585.
3– المط، محمد فائز، الجسم البشري ، 345/1.

دوو جۆری هەناسەدان هەیە : یەکەم هەناسەدانی سنگی کە پشت دەبەستێ بە هاتنە خوارەوەی پەراسووەکان. جۆری دووەم هەناسەدانی سکی کە زیاتر پشتدەبەستێ بە جولەی ناوپەنچك.

جۆرو شێوەی هەناسەدانی نێرو مێ جیاوازە، ئافرەتان زیاتر هەناسەدانی سنگی بەکاردەهێنن، بەلام پیاوان دەتوانن بەهەردوو جۆر هەناسە بدەن وبە شێوەیەکی گشتی زیاتر جۆری سکی بەکاردەهێنن.[1]

ئەمانەش وای کردووە کەوا ڕەگەزی نێرینە بتوانێ ڕێژەیەکی زیاتر لە ئوکسجین بەکاربهێنێ، خوێن زووتر پاك بکاتەوە، کرداری میتابۆلیزم و ووزە بەخشین خێراترو چالاکتر ئەنجام بدات، بەمەش لە گۆرەپانی وەرزش و شەڕوشۆڕدا بەردەوامتر و خۆراگرتر وگونجاوتر بێ.

**جیاوازیەکانی لە نێوان هەردوو کۆئەندامی سووڕان و هەناسەدانی پیاوو ژن.**

1- کێشی دڵی پیاو زیاترە لەوەی ئافرەت، بە تێکڕایی 310 گرام بۆ پیاوان و 260 گرام بۆ ژنان.

2- قەبارەی خوێن لە لەشی نێری پێگەیشتوو لە نێوان 5- 6 لیترە، بەلام بۆ مێی پێگەیشتوو 4- 5 لیترە، ئەمەش بە هۆی ئەوەیە کە ڕێژەی ماسولکە لە پیاوان زیاترەو ڕێژەی چەوریش لە ئافرەتان زیاترە.

3- دەروازەی نێوان گوێچکەلەو سکۆڵەی لای ڕاست چیوەکەی دەگاتە 1.2سم بۆ پیاوان و1.05- 1 سم بۆ ئافرەتان، دەروازەی نێوان گوێچکەلەو سکۆڵەی لای چەپ 1.10 سم بۆ پیاوان، 0.9 سم بۆ ئافرەتان.

4- خرۆکە سپی یەکان لە پیاودا ژمارەیان 8 هەزار خرۆکەیە لە هەر ملم [3]، لە مێ یەدا نزیکەی 6 هەزارە.

---

1ـ ریتشارد سنل، التشريح السريري لطلبة الطب، ص10.

5- خرۆکە سوورەکان ژمارەیان لە نێرینەدا 5.5 ملیون لە هەر ملم$^{3}$، بەلام لە مێنەدا لم ژمارەیە کەمترەو نزیکەی 4.8 ملیون لە هەر ملم$^{3}$.

6- بڕی هیموگلوبین لە ناو خوێنی پیاو نزیکەی 14- 16 گرام بۆ هەر 100 میلیتر، لە ئافرەتدا 12- 14 گرامە.

7- سێوی ئادەم لە نێرینەی پێگەیشتوو زیاتر دەرپەڕیوە لەوەی ئافرەتان، دەنگە ژێکان لە پیاوان درێژترو ئەستورترە لەوەی ژنان، ئەمەش وای کردووە دەنگی پیاوان لەحنی کەمترو، قوڵی و قەڵەوی زیاتر بێت، بەلام دەنگی ژنان بە پێچەوانەوە بە لەحن ترو ناسکتر بێ.

8- کێشی سیەکانی پیاو: 1200 گرامە، سی لای ڕاست 700 گرام ولای چەپ 500 گرام، بەلام لە ئافرەت بە هەردوو سیەکان 1000 گرامە.

9- جۆرو شێوەی هەناسەدانی نێرو مێ جیاوازە، ئافرەتان زیاتر هەناسەدانی سنگی بەکاردەهێنن، بەلام پیاوان دەتوانن بەهەردوو جۆر هەناسە بدەن وبە شێوەیەکی گشتی زیاتر جۆری سکی بەکاردەهێنن.

# باسی سێیەم

# پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆنەندامی

# دەرهاویشتن و زاوزێ

بەندی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆنەندامی زاوزێی نێرینە

برگەی یەکەم : جووتە گون

برگەی دووەم: دوو جۆگەی گوێزەرەوە

برگەی سێیەم: ڕژێنە پاشکۆکان

برگەی چوارەم: تۆو- توخمە خانەی نێرینە

برگەی پێنجەم: ڕێڕەوی هاویەش

بەندی دووەم: پێکهاتەی توێکاری وکارنەندامزانی کۆنەندامی زاوزێی مێ یینە

برگەی یەکەم : ئەندامەکانی زاوزێی ناوەوە

یەکەم: جووتە هێلکەدان

دووەم: جووتە جۆگەی هێلکە

سێ یەم : منداڵدان

چوارەم : زێ

برگەی دووەم: مێ یە کونی زاوزێ

برگەی سێیەم: مەمك

**دەروازە (المدخل):**

لە ڕاستی دا جیاوازیە سەرەكیەكانی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرینەو مێینە بریتی یە لە جیاوازی ڕژێنەكانی گوێرەگلاندەكان و ئەندامەكانی زاوزێ و هۆرمونەكانیان و جیاوازیە دەرونیەكان. چونكە هورمۆنەكان كاریگەریەكی زۆریان هەیە لەسەر گەشەی جەستەو بیرو هۆش ونارەزوو ویژدان ومیزاج . جیاوازیەكان لە هۆرمونەكانەوە دەست پێدەكات و كۆتایی دێت بە جیاوازی جەستەو عەقل وهۆش.

هەرچەندە ڕەگەزی كۆرپەلە لە یەكەم ساتی دروست بوونی هێلكەی پیتێنراوەوە دیاری دەكرێت، لوتكەی زاوزێ (الشامخة التناسلية) هەر زوو لەسەرەتای دروست بوونیەوە دەگۆرێ بۆ ئەندامی زاوزێی نێرینە (جووتە گون)یان بۆ ئەندامی زاوزێی مێینە (هێلكەدان). بەلاَم ئەندامەكانی زاوزێی دەرەوە لوادەكەون لە دیار كەوتن تاوەكو هەفتەی حەوتەم. تاوەكو ئەوكات ناتوانرێ بزانرێ كە ئەو كۆرپەلەیە نێرە یان مێ یە چونكە ئەندامەكانی زاوزێیان هاوبەشە. لە مانگی حەوتەم لە ژێر كاریگەری هورمونی تیستۆستیرون و هەندێ مادەی نا ئیستیرۆیدی كە خانەكانی (سرتۆلی MIS ) جووتە گون دروست دەكات، بە گواستنەوەو شۆربوونەوە لەناو هەناوەوە بۆ ناو تورەكەی گون. ئەگەر هورمۆنی تیستوستیرون نەبوو، كەنالی(ولفی) نێرینە دەپوكێتەوەو كەنالی (مولەری) مێینە دەست بەگەشە دەكات لەژێر كاریگەری هورمونی ئیسترۆجینی ناو خوێن وویلاَش، ئەندامەكانی زاوزێی مێینەی ناوەوە دروست دەبن.[1]

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێ كەوا كۆئەندامی زاوزێ لە كۆرپەلە هاوبەشە لە نێوان نێرو مێ، بەلاَم بە هۆی كاریگەری هۆرمۆنی نێرینە تیستۆستیرون، ڕەگەزی كۆرپەلە جیادەبێتەوە بۆ نێرینە یان مێینە.

هەرچەندە گەر كۆرپەلە وای بۆ نووسرابوو ببێ بە نێرینە، بەلاَم لەناو ناخی پێكهاتەی جەستەیی ودەرونی بەشێك و پشكەكی لە مێینەشی تیایە. بە تاقیكردنەوە دەركەوتووە كە جیاوازی تەواو(التميز التام) لە نێوان نێرینەو مێینە

---

1ـ حامد، أحمد حامد، الآيات العجاب في رحلة الإنجاب ، ص183-190.

هەرگیز مەحالەو موستەحیلە. هەر کاتیّ هورمونی نێرینە زاڵ بیّ بەسەر هۆرمونی مێینە ئەوا ڕەگەزی کۆرپەلە دەبێتە نێر، هەرکاتیش تیستوستێرون نەبوو ئەوا کۆرپەلە دەگۆڕیّ بۆ میّ.

هەر بۆیە زۆر لە هۆرمونەکان دەبینین هاوبەشن لە نێوان هەردوو ڕەگەز، بەلاّم بە ڕێژەیەکی جیاواز. لەبەر هەمان هۆ دکتۆر بیدل Biedel دەڵیّ: پیاوی پاڵەوتە (الرجل الخالص)، یان ئافرەتی پاڵەوتە (المـرأة الخالـصة) دوو حاڵەتی وان زۆر بەدەگمەن دەست دەکەون لە باری ئاساییدا واتای. واتای وایە کەم ڕوودەدات نێرینەیەك هیچ هورمۆنی مێینەی نەبیّ، یان بە پێچەوانەوە مێینەیەك هیچ هورمونی نێرینەی تیا نەبیّ.[1]

کۆئەندامی دەرهاویشتن وکۆئەندامی زاوزیّ بریتین لە دوو کۆئەندام، جیاوازن لە کارو فەرمان، بەلاّم لە ڕووی تویکاریدا لە کۆتاییەکەیاندا لە هەردوو ڕەگەزی نێرو میّ دا یەکدەگرنەوە.

کۆئەندامی دەرهاویشتن (الجهاز البولي Urinary -Renal- System)لە: دوو گورچیلە(الکلیتین− Kidneys )،جووتە بۆری میز(الحـالبین− Ureters )، میزڵدان(المثانة البولیة− Urinary bladder)، ڕێڕەوی هاوبەشی (الأحلیل − Urethra )پێك دێت.

دەبینین هاوبەشی وپێکچوونەکی زۆر هەیە لە نێوان هەردوو کۆئەندامی دەرهاویشتن لە نێرو میّ، تەنها جیاوازیەکی زۆر بەدی دەکرێت لە درێژی بۆری دەرەوەی میزکردن (ڕێڕەوی هاوبەشی)، کە لە نێرینە درێژترە لەوەی مێینەو لەگەڵ ئەندامی زاوزیّ یەکدەگرێتەوە لەکۆتایەکەیدا، بەلاّم لە مێینە کورتەو یەك ناگرێتەوە لەگەل ئەندامەکانی زاوزیّ. شێوەی میزڵدانیش دەگۆڕیّ و جیاوازیشە لەبەر بوونی جیاوازی شوێن وشێوەی ئەندامەکانی زاوزیّ لەهەردوو ڕەگەز.

1ـ زکریا إبراهیم، سایکولوجیة المرأة ، ص15.

كۆئەندامی دەرهاویشتن خوێن دەپاڵێوێ لە ماددە زیان بەخشەكان و ئاوی زیادە بۆ دەرەوەی لەش دەبات. كارو فەرمانی تریشی زۆر هەیە بەلام لێرە ئێمە پێویستمان بە باسكردنی نیە.

**ڕێرەوی هاویەش (الأحليل- Urethra)**

بریتی یە لە كەناڵێك درێژ دەبێتەوە لە ملی میزڵدانەوە بۆ دەرەوەی لەش. لە مێینەدا درێژی ئەم كەناڵە تەنها 4 سم و لەسەرەوەی دەرچەی زاوزێ دەكرێتەوە. بەلام لە نێرینە نزیكەی 20 سم دەبێت و لە سێ بەش پێكهاتووە.

1- ڕێرەوی هاوبەشی پرۆستاتی: ئەم بەشە بەناو گلاندی پرۆستاتدا دەڕوات ودرێژی 3 سم، هەر لەم بەشەوە دەروازەی هەردوو كەناڵی هاویشتنی تۆوی نێرینە (القناتان القاذفتان- Ejaculatory duct) دەكرێتەوە.

2- ڕێرەوی هاوبەشی پەردەیی: ئەو بەشەیە كە بەناو ناوبڕەی میزو زاوزێ دا دەڕوات ودرێژیەكەی1.3 سم دەبێت، لە هەردوو لاوەی گلاندی كوپر ( Cowper's Gland ) هەیە.

3- ڕێرەوی هاوبەشی ئیسفەنجی: ئەو بەشەیە دەكەوێتە ناو نێرە ئەندامی زاوزێ ودرێژی 15 سم دەبێت وبە هۆی دەروازەیەكی تەسكەوە بۆ دەرەوەی لەش دەكرێتەوە. لە سەرەتای ئەم بەشە دەروازەی هەردوو گلاندی كۆپر بەدی دەكرێت، ولە هەردوو تەنیشتیەوەش گلاندی لیتر( Urethral- Litter gland ) هەیە كە شلەیەكی لینج دەڕژێنێ كاتی جووتبوون.[1]

*1 – John WH, JR. Human Anatomy&Physiology* P: 772.
- Stuart C & Ash M (2000). *Gyaecology by ten teachers*. P: 15

**بەندی یەکەم: پێکهاتەی توێکاری وکارئەندامزانی کۆئەندامی زاوزێی نێرینە** .(Male Reproductive system)

کۆئەندامی زاوزێی نێرینە لەم ئەندامانە پێکهاتووە : جووتە گون (الخصية)، دوو جۆگەی گوێزەرەوە (القنوات التناسلية)، ڕژێنە پاشکۆکان (الغدد الجنسية الإضافية)، شلەی تۆو- شاوی نێرینە(السائل المنوي)، ڕێڕەوی هاوبەش (الأحليل).

## بڕگەی یەکەم : جووتە گون (الخصية- Testis).

بریتین لە جووتێک ڕژێنی شێوە هێلکەیی، هەریەکەیان کەوتۆتە ناو توورەکەیەکی پێستی دیوار تەنکەوە لە دەرەوەی لەش پێی دەڵێن تورەکەی گون. درێژی ئەم ڕژێنانە نزیکەی 5 سم وپانی 2.5 سم کێشەکەشی 10-15 گرام دەبێت. گونی لای چەپ کەمێك لە خواروی گونی لای ڕاستەو گەورەتریشە. جووتە گون لە کۆرپەلە دا لە لای سەروی دیواری هەناوە، لەخواروی شوێنی گورچیلە- واتە نێوان بڕبڕەکان وپەراسوەکانە-[1] دەست دەکات بە هاتنە خوارەوە بۆ خوارەوەی بۆشایی هەناو، دەگاتە ناو حەوز لە مانگی سێیەمی تەمەنی کۆرپەلە، پاشان دیواری پێشەوەی سك دەبڕێ و بەناو کەناڵی لاڕان- پەنا ڕان(القناة الأربية- Inguinal canal ) دەگاتە ناو تورەکەی گون پێش لە دایك بوونی کۆرپەلەی تەواو، هەروەك خودای گەورە دەفەموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾الطارق:7. پێویستە ڕژێنی گون لەو شوێنە بێت کە بۆی دیاری کراوە چونکە ناتوانێت تۆوی نێرینە دروست بکات مەگەر لە شوێنێك کە پلەی گەرمای لە پلەی گەرمای لەش کەمتر نەبێت، بێجگە لە (تورەگەی گون) لە هیچ شوێنێکی تردا لەناو لەشی مرۆڤ ئەم پلەی گەرمایە گونجاوە دەست ناکەوێت.

---

1ــ الترائب: بریتیە لە ئێسکانی پەراسووەکان، هەروەها دەڵێن ئێسکانی نێوان هەردوو پەلەکانی خوارەوەیە.

ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 498/4. وقيل الترائب: الأضلاع.

جووتــە گــون دابــەش دەبێــت بــۆ چــەند ژوورێکــی بــچوك ژمارەیــان 200–300 دەبێت. لە هەر یەکێك لەم ژوورۆکانەش 1– 3 گرێی لولپێچ(النبيبــات) هەیـەو هـەر لێرەوە تۆوی نێرینە دروست دەبێت(الإنطاف Spermatogenesis). ئەو گرێ یە لولپێچانە خانەی سـرتۆلی( الداعمة- sertoli-supporting cells ) تیایـە، ئـەم خانانە کاری پارێزگاری و دابین کردنی خۆراك بۆ خانەی دروستکردنی تۆو دەگرێتـە ئەسـتۆ. بێجگـە لـەم کارانـە لـەناوبردن وقووتـدانی تـۆوە مردوەکـان و رێکخـستنی جولـەی تـۆوە زینـدووەکان وگواسـتنەوەیان بـۆ نـاو بۆریـەکانی تـۆو گـوێزەرەوە دەگرێتــە ئەســتۆ. هــەروەها هۆرمــونی ئینهیــبین Inhibin وهەنــدێ پــرۆتینیش دەرژێنێ، لەمانە گرنگتریش، کاردەکات وەك بەربەستێکی خوێنی کـە ناهێڵێـت دژە تەن بگەنە خانە نۆییەکانی تۆو دروستکردن کە پاش تەمـەنی پێگەیـشتن(البلــوغ) دروست دەبن. ئەو گرێ یە لولپێچانە خانەی تۆو گوازەرەوەی تری تیایـە بـە نـاوی لیدج (Leydin Cells ) کە هۆرمونی تیستۆستیرون( testosterone)دەرژێنێ.[1]

## برگەی دووەم: جۆگەی گوێزەرەوە (القنوات التناسلية- Genital Ducts )

پاش دروست بوونی تۆو لە لولپێچەکانەوە دەگوازرێتەوە بەهۆی ئەو جۆگانەوە، کە هەرلایەك تۆوی ئەو گونە دەگوازێتەوە کە لێوەی دەرچووە. سـەرەتاکەی فـرە پێچاوپێچە بە جۆرێك درێژی دەگاتە 6 مەتر، هەرچەندە خۆی درێـژی لـە 4 سـم تێ ناپەرێت، پـێ ی دەلـێن بوربـوخ (البــربخ- Epididymis ) لـە بوربوخـەوە سپێرم گەشەی تەواو دەکات وتوانای پیتێنی دەبێت، ئەم کـردارەش نزیکـەی 10– 14 رۆژی دەوێت. ئەم کەنالە توانای داکردنی تۆوی هەیـەو لەوێـشەوە پـاڵی دەدات بۆ ناو تۆواوە چـیکڵدانە و نـاو جۆگـەی هاوبەشـی میـزو زاوزێ بـە هـۆی گرژبـوونی ماسولکە لووسەکانی دەوروبەر لەکاتی جووتبووندا.[2]

*1– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 989.*
*- Frances SG & Jordon JS . Basic&Clinical Endocrinology P: 2132.*
*2– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 900.*
*-John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 811.*

لە دوای بوربوخەوە لولەی گوێزەرەوە دێت ( القناة الأسهرية -Ductus -vas Deferens ) کە تەواوکەری بوربوخە، بەلام لوچی کەمترەو فراوانترەو درێژیەکەی 45 سم دەبێت و بەرزدەبێتەوەو سەردەکەوێت ولول وپێچ دەبێت لە کۆتاییەکەیدا وتاوەکو دەگاتە دەروازەی کەناڵی تۆواوە چیکڵدانە (الحويصلة المنوية- Seminal vesicle ) و یەکتردەگرن وکەناڵی هاوێژەر (القناة الدافقة- Ejaculatory Duct ) پێکدەهێنن، ئەم کەناڵەش 2 سم درێژەو لە پشتەوە دەچێتە ناو ڕێڕەوی هاوبەشی پرۆستاتی.[1]

**برگەی سێیەم:رژێنە پاشکۆکان(الغدد الجنسية الإضافية-Accessory Sex Glands ).**

لەم ڕژێنانە پێکهاتوون:

1- تۆواوە چیکڵدانە(الحويصلة المنوية-Seminal vesicle ): لە کۆتایی هەر جۆگە گوێزەرەوەیەکدا، نزیك بە ملی میزلدان، تورەکەیەك هەیە، بۆ کۆکردنەوەی توخمە خانەکان (تۆو) دوای پێگەیشتنیان، پێ ی دەڵێن تۆواوە چیکڵدانە. ئەم چیکڵدانە شلەیەکی لینجی تفت دەردەدات وشەکری فرکتۆز تیایە کە پێویستە بۆ جولە ووزەی توخمە خانەکان، ئەم شلەیەش 60٪ی هەموو ئەم شلەی تۆو پێکدەهێنێت(Seminal Fluid) کە پیاو فرێی دەدات کاتی جووتبوون. ئەم شلەیە لە چیکڵدانە بە هۆی کەناڵی چیکلدانەوە دەچێتە ناو ڕێرەوی هاوبەشی پرۆستاتی وپاشان بۆ ناو نێرە ئەندامی زاوزێ. تفتی ئەم شلەیەك سوود مەندە بۆ هاوتاکردنی ترشی ناو مێیە ئەندامی ئافرەت لە کاتی جووتبووندا.[2]

2- گلاندی پرۆستات(Prostate Gland ): یەك دانەیەو دەکەوێتە خواروی میزڵدانەوە، جۆگەی هاوبەشی پرۆستاتی بەناویدا تێپەر دەبێت. شلەیەکی سپی تفت دەردەدات کە13-33٪ شلەی تۆوی پیاو پێکدەهێنێ وترشی سیتریك ئەسید Citric Acidو هەندێ ئینزیمی تیایە وەك، ترشی فوسفاتیز(Phosphatase)و

---

1- *Gray A & Kevin T. Anatomy& Physiology. P: 901-902.*

2- *John WH. JR . Human Anatomy& Physiology ,P: 812.*

پرۆستاگلاندین (Prostaglandin ) کە پێویستن بۆ جولەو چالاکی تۆخمە خانەکان.[1]

3- گلاندی کۆپەر(الغدة البصلية الأحليلية- Bulbourethral-Cowper's Gland): ژمارەیان دووانەو دەکەوێتە ژێر پرۆستات ولە هەردوولای ڕێڕەوی هاوبەشی پەردەیی، شلەیەکی لینج دەردەدات بۆ ناو ڕێڕەوی هاوبەشی ئیسفەنجی، ئەمەش بۆ چەورکردنی بەشە ئیسفەنجیەکەی نێرە ئەندامی زاوزێ یە پێش کرداری هاویشتنی تۆو لەکاتی جووتبووندا.[2]

## بڕگەی چوارەم : شلەی تۆو- ئاوی نێرینە (السائل المنوي- Seminal Fluid)

بریتیە لەو شلەیەی کە تۆخمە خانە(الحیوانات المنویة- Sperms ) وئەو شلانەی تیایە کە ڕژێنە پاشکۆکان دەریدەدەن. قەبارەی ئەو شلەیە کە نێرینە دەری دەهاوێت لەهەر جووتبوونێکدا لە نێوان 2.5 -6 میللتر[3]، زۆرو کەمی ئەو شلەیەش دەوەستێ لەسەر ژمارەی دەرهاویشتنەکان. ژمارەی تۆخمە خانەکان لە هەر یەك میللتر سێ جا دەگاتە 50-100 ملیون، واتەلە هەر دەرهاویشتنەکدا 300 ملیون تۆخمە خانە هەیە. شلەی تۆو هەندێ دژە ماددەی تیایە وەك سیمنالبلازمین( Seminalplasmin) . شلەی تۆو ڕاستەوخۆ پاش دەرهاویشتن پەیت دەبێت ودەمەیی بەهۆی ئینزیمەکانی پرۆستاتەوە، بەڵام پاش ماوەیەك شل دەبێتەوە بە هۆی هەندێ ئینزیمی ترەوە.[3]

## بڕگەی پێنجەم: نێرە ئەندامی زاوزێ، چوك (القضیب- penis) :

بریتیە لە ئەندامێکی لوولەیی کاری گواستنەوەی تۆوە لە پیاوەوە بۆ ناو زێ (المهبل) مێینە، پێکهاتووە لە ڕەگ وجەستە. جەستە ئەو بەشە درێژەیە کە لە سێ

---

1 -Leslie JD (1989). *Endocrinology*. P: 3/2152.
2_ John WH, JR. *Human Anatomy& Physiology*. P: 812.
3_ Leslie JD. *Endocrinology*. P: 3/2132.

بارستەی لوولەیی پێکهاتووە، دووان لە ڕووی سەرەوەن وپێ یان دەڵێن ئەشکەوتەن (الجسم الكهفي-Corpus Cavernosum)، ئەوی تریان دەکەوێتە لای خوارەوەو پێ ی دەڵێن ئیسفەنجە تەن(الجسم الإسفنجي- Corpus Spongiosum) . جەستەی ئیسفەنجی کۆتای دێت بە ئاوسانێك وپێ ی دەڵێن کڵاوە(الحشفة- Glans penis )، ئەو بەشەش داپۆشراوە بە پارچەیەك لە پێستە، پێ ی دەڵێن خرۆسك (القلفة- Prepuce ). هەر ئەو پێستەیە لە کاتی کرداری پاککردنەوە وسونەت کردن (عملية الختان- الطهور Circumcision) دەبڕدرێت وفڕێ دەدرێت. ئەم بارستە لوولویی یە لەو جۆرە شانەیە پێکهاتووە کە نەرمە، لەهەمان کات توانای ئاوسان وڕەق بوونیشی هەیە (إنتصابية- Erectile Tissue) بە هۆی پڕ بوونی بە خوێن لە کاتی هەڵسانی ئارەزووی جنسی و جووتبووندا.[1] بنوارە شێوەی ژمارە 9 و10 : کۆئەندامی زاوزێی نێرینە لە ڕووی تەنیشت وپێشەوە.

## بەندی سێیەم: پێکهاتەی تویکاری وکارومەندامزانی کۆئەندامی زاوزێی مێینە (الجهاز التناسلي الأنثوي- Female Reproductive Systems).

پێکهاتووە لەو ئەندامانەی کە دەکەونە ناو هەناو وەك: جووتە هێلکەدان (المبيضان- Ovaries )، جووت جۆگەی هێلکە(الأنبوبتان الرحميتان- قناة فالوب)، منداڵدان(الرحم)، زێ (لمهبل). ئەو ئەندامانەی کە دەکەونە دەرەوە و پێ ی دەوترێ گولینك و لەم بەشانە پێکهاتووە، وەك: بەرزی موسلدانە (جبل العانة)، دوو لۆچی گەورە (الشفرتين الكبيرتين)، دوو لۆچی بچووك (الشفرتين الصغيرتين)، سەری قیتکە (البظر)، ڕاڕەوی گولینك (دهليز المهبل).

1– John WH, JR. *Human Anatomy& Physiology*. P: 814.
- Gray AT & Kevin TP. *Anatomy& Physiolog*. P: 906.

## بڕگەی یەکەم: ئەندامەکانی زاوزێی ناوەوە:

### یەکەم : جووتە هێلکەدان (المبیضان- Ovaries)

بریتین لە دوو ڕژێنی هێلکەیی کە دەکەونە بەشی خوارەوەی لەشە بۆشایی لەم لاو ئەولای منداڵدان.[1] جووتە هێلکەدان لە کۆرپەلەدا لە بەشی سەرەوەی دیواری هەناو بە ڕووی پشتەوە ولە خوارەوەی گورچیلە دروست دەبێت، هەروەك جووتە گون دەست دەکات بە گواستنەوەو شۆڕبوونەوە بۆ خوارەوەی بۆشایی هەناو، لەوێوە بۆ ناوبۆشایی حەوز، لەگەل منداڵداندا بە چەند کەژیەك (ژێ) پێکەوە بەند دەبن تاوەکو بەرگری بکات لە دابەزینی هێلکەدان بۆ دەرەوەی لەش وەك جووتە گون.

ئەرك و فەرمانی هێلکەدان بریتی یە لە بەرهەم هێنانی هێلکە، دەردانی هورمۆنی مێینە وەك ئیسترۆجین و بروجیسترۆن و ریلاکسین و ئینهبین، ئەمانەش بۆ دەرکەوتنی توخمە سیفەتە دوەمی یەکانە لە ئافرەتدا. بەکرداری بەرهەم هێنانی هێلکەو ناردنی بۆ پیتێن لە هەموو مانگێکدا پێی دەوترێ کرداری هێلکەدانان (الإباضة–Ovulation).[2]

### دووەم: جووت جۆگەی هێلکە (الأنبوبة الرحیمة –البوق-Fallopian Tube).

هەر هێلکەدانێك پێکهاتوویەکی شێوە ڕەحەتی بە ناتەواوی دایدەپۆشێت کە سەرەتای جۆگەی هێلکەوە، کە درێژیەکەی نزیکەی 10 سم دەبێت وکاری گواستنەوەی هێلکەی پێگەیشتووە لە هێلکەدانەوە بۆ ناو منداڵدان. لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

أ- ڕەحەتی (القمع–Infundibulum ) : شێوەی وەك ڕەحەتی یەو پەنجەی شۆڕبۆوەی پێوەیە (خمل البوق- Fimbriae) ، یەکێك لەو پەنجانە بە

---

*1 – Stuart.C &Ash.M. Gyaecology by ten teachers. P: 14.*
*-Gray.A&Kevin.T. Anatomy& Physiology. P: 914.*
*2 – John.W.H, ,JR. Human Anatomy&Physiology. P: 818.*
*- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 776.*

هێلکەدانەوە لکاوە, هەرئەم بەشەیە کە پێشوازی لە هیلکەی پێگەیشتوو دەکات کاتی هاتنە دەرەوەی لە هێلکەداندا.

ب- گۆپکەی جۆگەی هێلکە (أنبورة الأنبوبة الرحمية- Ampulla of Uterine Tube): ئەم بەشە لە هەموو بەشەکانی تری جۆگەی هێلکە فراوانترو درێژ ترەو سێ یەکی درێژیەکەیەتی، هەر لەناو ئەو بەشەدا کرداری پیتێنی نێوان سپێرم و هێلکەی پیگەیشتوو ڕوودەدات. هێلکە توانای هەیە کە 24-48 کاتژمێر چاوەڕوانی سپێرم بکات، گەر نەهات لە داخانا دەمرێت.

ج- چالایی جۆگەی هێلکە (برزخ البوق- Isthmus):بەشێکی کورت وباریکە و بە منداڵدانەوە دەنوسێت...

د- منداڵدانە بەش (الجــزء الرحمــي- Intramural or uterine Part): کە دەچێتە ناو دیواری منداڵدان.[1]

دیواری جۆگەی هێلکە لە سێ چین پێکهاتووە ، کە ئەمانەن:

أ- لینجە چین: کە پەردەیەکی چلمی لینجەو بە خانەی قامچی داری ستوونی پشتی داپۆشراوە وڕژێنە خانەشی تیایە.

ب- ماسولکە چین(الطبقـــة العـــضلية): پێکهاتووە لە چینێکی بازنەیی ئەستوورلە ڕووی ناوەوە وچینێك ماسولکەی تەنك ودرێژۆکانی لە ڕووی دەرەوە. بە هۆی پێچە جولە( Peristatic Contraction) وگرژی ئەم ماسولکانەو جولەی خانە قامچی دارەکان هێلکە پاڵ دەدەن بە ئاراستەی منداڵدان.

ج- دەرە چین (الطبقة الخارجية): چینێکی پەردەیی لووسە.

**سێ یەم : منداڵدان (الرحم- Uterus).**

بریتی یە لە ئەندامێکی فراوانی دیوار ماسوولکەیی شێوە هەرمێ، لوتکەکەی بۆ خوارەوەیەو بنکەکەی بۆ سەرەوەیە. بۆشایی منداڵدانیش بەشی سەرەوەی بە هێلکەدانەوە بەستراوە، هەروەها لە خواریشەوە بە زێوە بەستراوە، زێش بە مێ یە

---

*1– Stuart C & Ash M. Gynecology by ten teachers. P: 15.*
*-Gray AT & Kevin T. Anatomy& Physiology. P: 915.*
*-John WH. JR. Human Anatomy&Physiology. P: 822.*

کۆئەندامی زاوزێ بۆ دەرەوە دەکرێتەوە. درێژی منداڵدان لە کاتی لە دایکبوونی کۆرپەلە3.5 سم، کێشەکەشی 7.5 گرامە. پاش ماوەیەکی کورتی دوو هەفتەیی دەست دەکات بە پوکانەوە، بەم شێوەیە دەمێنێتەوە تاوەکو تەمەنی پێگەیشتن و بێ نوێژی وسەرهەڵدانی چالاکی جنسی، لەو کاتەدا منداڵدان دووبارە دەست بە گەشەو گەورەبوون دەکات لە ژێر کاریگەری هۆرمونەکانی مێینە. بەمەش درێژیەکەی دەبێتە سێ جار و کێشەکەشی دەبێتە 10 جارانی پێشوو، واتە بە درێژی 7.5 سم، پانی 5 سم، ئەستووری 3 سم .[1] لێرەوە سووڕەکانی بێ نوێژی (وەهك– كنج) دەست پێدەکات ، لە نێوانیاندا سك پڕی وزەیستانی دەبێت تاوەکو ئافرەت دەکاتە تەمەنی 45– 55 ساڵی ، پاشان دووبارە منداڵدان دەپوکێتەوە بەڵام ئەمجارەیان پوکانەوەکەی کۆتایی ودواجارەیە .[2]

**منداڵدان دەکرێ بە سێ بەشەوە:**

أ– بنکەی منداڵدان (قاع الرحم): بریتی یە لەو بەشەی کە دەکەوێتە ئاستی سەرووی جۆگەکانی هێلکە.

ب– لەشی منداڵدان(جسم الرحم): بەشی هەرە گەورەی منداڵدانەو بۆشاییەکی گەورەی تیایە ناسراوە بە بۆشایی منداڵدان.

ج– ملی منداڵدان (عنق الرحم – Cervix): بەشی خوارەوەی منداڵدانەو باریکەو دیواری پێشەوەی زێ دەبڕێت وشلەیەکی لینجیش دەردەدات. بۆشایی ناو ملی منداڵدانیش دوو دەمی هەیە، یەکەمیان دەمی ناوەوە کە لەسەرەوە کراوەتەوە بۆ ناو بۆشایی منداڵدان، دووەمیش دەمی دەرەوەیە کە لە خوارەوە کراوەتەوە بۆ ناو بۆشایی زێ. ئەم دەمەی خوارەوە لەبەر تەسکی ڕێگە نادات کە ئەندامی زاوزێی نێرینە بۆ سەرەوەتر بڕوات کاتی جووتبوون تاوەکو کاتی سك پڕی پاڵەپەستۆ

---

1_*Stuart C & Ash M. Gynecology by ten teachers. P: 12-13.*
*-Gray.A &Kevin.T.P. Anatomy& Physiology. P: 916.*

2ـ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص56.

لەسەر پەردەی دەوری کۆرپەلە نەکات وبێتە هۆی ڕژاندنی شلەی ئەمنیوتی ومندالبوونی ناتەواو.

ئەرکەکانی مندالدان: شوێنی بێ نوێژی وشوێنی چاندنی هێلکەی پیتێنراوە، شوێنی گەشەی کۆرپەلەو هاتنە دەرەوەیەتی، هەروەها ڕێڕەوی توخمە خانەی نێرینەیە بۆ ناو جۆگەی هێلکە بۆ پیتێن.[1]

**دیواری مندالدانیش لە سێ چین پێکهاتووە:**

1 – دیواری ناوەوە (بطانة الرحم- Endometrium ): ئەویش دوو بەشە: بەشی کارئەندامی(الطبقة الوظيفية) ، کە لە ڕووی سەرەوەی دیواری ناوەوەیە وژمارەیەکی زۆر لە خوێنهێنەری لوولی تیایە. ئەو بەشەیە لەکاتی بێ نوێژیدا دادەپچڕێ ودێتە خوارەوە وەك خوێنەکی پیس وخانەی مردوو. چینی سەرەکی (الطبقة الأساسية)، ئەوچینەیە کە پاش بێ نوێژی دەمینێ وچینێکی تری نوێی کارئەندامی دروست دەکات. ئەم چینە جیاواز لە چینەکەی پێشوو بە خوێنهێنەری ڕاست دەورە دراوە.

2- چینی ماسوولکەیی (عضل الرحم- Myometrium ): چینێکی ئەستوورو سەرەکی یەو لە ناوەڕاستدایە، لە لووسە ماسولکە پێکهاتووە کە بە سێ تاوەکو چوار چین ڕێز بوون. ماسوولکەی مندالدان بە دوو تایبەتمەندی لە ڕوکار دژ بەیەك ناسراوە: لە لایەکەوە توانای هەیە بۆ کشان بە شێوەیەکی زۆر فراوان. لە سەرەتای پیتێن مندالدان تەنها شوێنی 5 گرام دەبێت، بەلام لە کۆتایی ڕۆژانی سك پڕی جێگەی زیاتر لە 5000 گرامی هەیە، کە بریتی یە لە (قەبارەی کۆرپەلە، شلەی دەوروبەری کۆرپەلە، وێلاش). ئەوەش بە هۆی کشان وگەورەبوونی ماسوولکەکانیەتی.[2] لە لایەکی ترەوە توانایەکی زۆری هەیە بۆ گرژبوون، کە بەهۆیەوە دەتوانێ سەری کۆرپەلە پال بدات بۆ دەرەوە ودەتوانێ بەردەوام بێ لە

---

*1 – John WH, JR. Human Anatomy& Physiology. P: 822.*

2 ـ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص56.

سەر ئەم گرژبوونە یەك لەدوای یەکە بۆ ماوەی چەندەها کاتژمێر وەیان چەند ڕۆژێك بەبێ ماندووبوون بۆ ئەوەی کۆرپەلە ڕووناکی ژیان ببینێ.[1] گەورەیی بۆ ئەو دروستکارو داهێنەرە کە هەموو دروستکراوەکانی ڕێگە نیشانداوە بۆ ئەوەی کارەکانیان بکەن بە ڕێکی بێ ماندوو بوون، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ طه: 50

3- چینی دەرەوە- پشتەوە (ظهـارة الـرحم- Perimetrium ): چینێکی پەردەیی یە دەکەوێتە ڕووی دەرەوەی دیواری منداڵدان.

**چوارەم : زێ (المهبل - Vagina ).**

بریتی یە لە بۆڕیەکی ماسوولکەیی درێژیەکەی 10 سم، درێژ دەبێتەوە لە ملی منداڵدانەوە بۆ دەرەوەی لەش، دەکەوێتە نێوان میزڵدان وڕێکە(المـستقیم). ئەم بۆڕیە توانای درێژبوونی زۆری هەیە، تاوەکو جێگەی ئەندامی نێرینەی زاوزێی بێتەوە کاتی جووتبوون وهاوکاری هاتنە دەرەوەی کۆرپەلە دەکات ، ڕێڕەوێکە بۆ گەیاندنی توخمی نێرینە بۆ ناو منداڵدان، هاتنە دەرەوەی خوێنی بێ نوێژی. لە کۆتایی ئەم بۆڕیە دەروازەی زێ هەیە کە بە پەردەیەك داپۆشراوەو کە پێ ی دەڵێن پەردەی کچێنی(غشاء البکارة)، ئەویش کونێك یان چەند کونی بچوکی شێوە جیاوازی تیایە بۆ هاتنە دەرەوەی خوێنی بێ نوێژی.[2] بنواڕە شێوەی ژمارە 11 : کۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەکانی ناوەوە).

---

*1 _ Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 917.*
*-John WH ,JR. Human Anatomy&Physiology. P: 823.*
*2 _Stuart C & Ash M. Gyaecology by ten teachers. P: 12.*
*-Gray A &Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 919.*

**برگەی دووەم: ئەندامەکانی دەرەوەی کۆئەندامی زاوزێی مێینە(الاعضاء الخارجیة- فرج الرحم).**

لەم ئەندامانەی خوارەوە پێکهاتووە:[1]

**یەکەم: بەرزی موسلدانە(جبل العانە-** Mons Pubis).

بەرزایی یەکە دەکەوێتە سەرێسکی موسلدانە، لە شانەی چەوری بە موو داپۆشراو پێکهاتووە.

**دووەم: دوو لۆچی گەورە (الشفران الکبیران-** Labia Majora )

دوو لۆچی پیستەیی درێژن، لە بەرزە موسلدانەوە بۆ خوارەوە درێژ دەبنەوە، شانەی چەوری تیایە، تەنها لە ڕووی دەرەوەی بە موو داپۆشراوە. ئەو ئەندامەش بەرامبەر توورەکەی گونە لە ڕەگەزی نێرینەدا وگلاندی زۆری تیایە لە جۆری گلاندی (الغدد الزهمیة- Sebaceous Glands ).

**سێیەم: دوو لۆچی بچوک (الشفران الصغیران-** Labia Minora )

بریتی یە لە دوو لۆچی بچوکی داپۆشراو بە لینجە پەردە، دەکەوێتە ڕووی ناوەوەی لۆچە گەورەکان، ژمارەیەك ڕژێنەی ئارەقەو زەهمی تیایە، بەلام مووی پێوەنیەو شانەی چەوریشی تیا نیە.

**چوارەم: قیتکە (البظر -** Clitoris)

دەکەوێتە نێوان خاڵی یەککگرتنی هەردوو لۆچی بچوك لەلای سەرەوە، شێوەی لە ئەندامی زاوزێی نێرینە دەچێت بەلام زۆر بچوکەو بۆڕی میزیشی پیادا ناڕوات. لە بارستەیەکی لوولەیی لە شانەی ڕەپ (الانتـــصابي) بـوو پێکهاتووە وژمارەیەکی زۆریش دەماری هەستیاری تیایە. قیتکە بە پێستەیەك داپۆشراوە پـێ ی دەڵێن خرۆسك(Prepuce )، بەشە دیارەکەی قیتکەش پێ ی دەڵێن کڵاوە (Glans ).

*1– Stuart C & Ash M. Gyaecology by ten teachers. P: 9.*
*- John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 826-827.*

**پێنجەم: زێ - گولینك (الفرج- Vestibule ).**

بریتی یە لەو ڕێڕەوەی نێوان هەردوو لۆچی بچوك ، ئەم ئەندامانەی لەخۆ گرتووە.

1- دەرەچەی زێ: بە پەردەی کچێنی داپۆشراوەو لە بەشی خوارەوەی ئەم ڕێڕەوەیە.

2- دەرەچەی میزەڕۆ: کۆتای ڕێڕەوی میزەڕۆیە لە مێینە و دەکەوێتە نێوان قیتکەو دەرەچەی زێ.

3- دەرەچەی ڕژێنە گلاندەکاندەکانی لۆچی گەورە، کە بەرامبەر گلاندی کوپەرە لە نێرینەدا، کاری ئەم گلاندانەش ڕژاندنی ماددەی لینجەیە بۆ ئاسانکردنی کرداری جووتبوون.

4- دەرەچەی کەنال گلاندی سنکس(Para urethral Glands- Skenes)کە دەکەوێتە هەردوو لا تەنیشتی دەرەچەی میزەڕۆوە، کە بەرامبەر گلاندی پرۆستاتە لە نێرینەداو ماددەی لینجە دەرژێنێ .

5- دەرەچەی گلاندەکانی لۆچی بچوك، کە زۆر بچوکن و بەچاو نابینرێن و لەناو ئەم ڕێڕەوەدا بڵاو بوونەتەوە. بنوارە شێوەی ژمارە 12 : کۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەکانی دەرەوە).

## برگەی سێیەم: مەمك (الثدي- Mammary Gland - Breast )

مەمك لە هەردوو ڕەگەزدا هەیە، زۆر بچوکە لە نێرینەو کچۆڵەی پێ نەگەیشتوو، هەر بەم بچوکیەش دەمێنتەوە لە نێرینەدا، بەڵام لە کچاندا دەست بە گەورە بوون دەکا لە ژێر کاریگەری هۆرمونەکانی مێینە، دەگاتە گەورەترین قەبارەی لە کاتی سك پڕیدا، هەروەها بە درێژایی کرداری شیردانی دایك بۆ منداڵەکەی. کەواتە مەمك بە ئەندامێکی گرنگی ڕەگەزی مێینە دەژمێردرێ و بریتی یە لە گلاندێکی ئارەقەی گۆردراو(غـدة عرقيـة محـورة- Modified Sweat Gland )، لە 15- 20 بەش پێکهاتوەو لە نێوانیان شانەی توندو شانەی چەوری

هەیە، هەر بەشە لە چەند بەشۆکەیەك پێکهاتووەو خانەی تیایە بۆ شیر دروست کردن، بەشۆکە لە چەند سیکلدانۆچکەیەك (أسناخ- Alveoli) پێکهاتووە. لەهەر بەشۆکەوە جۆگەیەکی وورد دەردەچێت، پاشان ئەم وورده جۆگانە یەکدەگرن و کەنالی گواستنەوەی شیر پێکدەهێنن، لەوێوە شیر دەچێت بۆ ناو گۆی مەمك (حلمـــة الثدي- Breast Nipple). هەر گۆی مەمکێك 15- 20 دەرەچەی کەناڵی گواستنەوەی شیری تیایە.

لە قوڵایی مەمکەوە پۆشەرە شانە هەیە، کە ماسولکەی گەورەی سەر سنگی داپۆشیوە. لە نێوان پێستەو ئەم پۆشەرە شانانە هەندێ پشتێنەی لیفکەیی هەیە بە کەژی کۆپر ناسراون کە پێستەو شانەکانی ژێرەوەی ئەم ناوچەیە توند دەکەن وپارێزگاری لە خڕی مەمك وهاتنەدەرەو قیتیەکەی دەکەن.

لە دەورەی گۆی مەمك ناوچەیەکی بازنەیی ڕەنگاوڕەنگ هەیە پێ ی دەڵێن جۆخینە (هالة- لعوة الثدي-Arcola ) کە لە ژمارەیەك لە گلاندی زەهمی گۆڕدراو پێکهاتووە، وای کردووە هالە ڕووی دەرەوەی زبر بێت وڕنگی پەمەیی (زهريـــاً) نیشان بدات لە کچان پێش شووکردن، بەڵام ئەم ڕەنگە دەگۆڕێ بۆ قاوەیی تۆخ (بني غامق) لە مانگی یەکەم، لە یەکەم کرداری سك پڕی. بنواڕە شێوەی ژمارە 13: مەمك وجۆگەکانی شیر.

هیچ پەیوەندیەکیش نیە لە نێوان قەبارەی مەمك و ڕێژەی ئەو شیرەی کە دروست دەبێت و دەردەهاوێژرێت. دروستکردنی شیر پەیوەستە بە هۆرمۆنی پرۆلاکتین، دەرهاوێژتنی شیریش پەیوەستە بە هۆرمونی ئۆکسیتۆسین.[1]

خوای گەورە نێرو مێی خولقاندووە ولە هەر یەکیان لە پێکهاتەی فیترەتی خۆی داوای دارشتووە کە بتوانێ ئەو ئەرك وفەرمانانەی بۆی دانراوە لە ژیان جێبەجێی

---

*1 – Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 921.*
*- John WH, JR. Human Anatomy& Physiology. P: 839.*
- وقرشي محمد علي، التشريح البشري الوظيفي، ص20-21.
- عايدة عبد الهادي ، فسيولوجيا جسم الإنسان، ص386.

بکات. کەواتە هەموو کەسێك ئاسانکاری بۆ کراوە بەرامبەر ئەو کارەی بۆی دانراوەو هەر بەو ئاراستەش دەڕوات کە داهێنەرەکەی بۆی داناوە گەر لەسەر فیترەی خۆی لا نەدات بە هۆی کاریگەریە جیاجیاکانی دەرەکی.

بەهۆی لێکۆڵینەوە وتوێژینەوە زانستیەکان سەلمێنراوە کەوا ئافرەت جیایە لە پیاو لە شێوەو ئاکاری دەرەوەو کارلێکەکانی ناوەوەو کاری مێشك وکاریگەری هۆرمونەکانی، تاوەکو دەگاتە هۆیەکانی مردنیش کە زۆریان پەیوەستن بە پێکهاتەو جۆری ڕەگەز هەر لەسەرەتای دروست بوونی کۆرپەلە لە ناو سکی دایکی. ئەم جیاوازیە لەگەل تەمەن سەردەکەوێ بە جیاوازی لە پەیکەرو کاریگەری هۆرمونەکان وئارەزوەکان، کە هەمووی بەو ئاراستەدا دەڕوات کە ئافرەت ئامادە دەکرێت بۆ گرنگترین وپیرۆزترین کار، کە هیچ پیاوێك ناتوانێت شان بەشانی بوەستێت لە هەر کات ولە هەر شوێن ولە هەر ئاستێکدا بێت، ئەویش بریتی یە لە کرداری منداڵبوون وگەشە پێکردنی وپەروەردە کردنیەتی.

# بەشی دووەم

## پێکهاتەی تونکاری وکارئەندامزانی کۆئەندامە ووردەکانی هەردوو ڕەگەزو جیاوازی نێوانیان

باسی یەکەم : کرۆمۆسومەکان(بۆیە ڕەنگیەکان) و توخمە خانەکان

باسی دووەم : ڕژێنەگلاندەکان وهۆرمونەکانیان

باسی سێیەم : پێگەیشتن (البلوغ) و کاریگەری ژینگەلەسەر پێگەیشتن

باسی چوارەم : جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە قۆناغەکانی ژیانی کۆرپەلەو پێگەیشتن وتەمەنی زاوزێ وە هەروەها لە هۆکاری مردن.

# باسی یەکەم

## کرۆمۆسومەکان (بۆیە ڕەنگیەکان) وتوخمە خانەکان

**بەندی یەکەم: پێکهاتەی کرۆمۆسومەکانی زاوزێ لە هەردوو ڕەگەز**

**بڕگەی یەکەم: پێکهاتەی کرۆمۆسومەکانی زاوزێ**

**بڕگەی دووەم : جیاوازی نێوان کرۆمۆسومەکانی زاوزێی هەردوو ڕەگەز**

**بەندی دووەم: پێکهاتەی توخمە خانەکانی زاوزێ وجیاوازی نێوانیان**

**بڕگەی یەکەم: پێکهاتەی توخمە خانەکان (سپێرم و هێلکە)**

**بڕگەی دووەم: جیاوازی نێوان توخمە خانەکان (سپێرم و هێلکە)**

**بەندی یەکەم : پێکهاتەی کرۆمۆسومەکانی زاوزێ لە هەردوو ڕەگەزو (الكروموسومات الجنسية- Sex chromosomes).**

## بڕگەی یەکەم: پێکهاتەی کرۆمۆسومەکانی زاوزێ.[1]

لە مرۆڤێکی دروستدا 46 کرۆمۆسوم هەیە، بە جووتە ڕێز بوون، واتە 23 جووت کرۆمۆسوم هەیە، لەوانە 22 جووتی جەستەیی یەو 1 جووتی جنسی یە کە پەیوەستە بە دیاری کردنی ڕەگەزی نێرینە و ڕەگەزی مێینە، هێماکەی لە ڕەگەزی نێرینە xy ، لە ڕەگەزی مێینە xx .

بنواڕە شێوەی ژمارە 14: قەبارەی کرۆمۆسومەکانی جەستەیی وڕەگەزی

46 کرۆمۆسوم هەڵگری هەموو نهێنیەکان وتایبەتمەندیەکانی ئادەمیزادە، لە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ڕیشاڵ پێك دێت، هەر ریشاڵێکیش لە دەزووی پرۆتینی وناوکە ترش پێك دێت، کە ناووکە ترشی رایبی کەم ئوکسجینی DNA تێدا زاڵە.[2]

هەر جووتێك لە کرۆمۆسومی جەستەیی لە دوو لەتی هاوبەش وهاوشێوەو هاو قەبارە پێکهاتوون، بەڵام تەنها جووتە کرۆمۆسومی ڕەگەزی یە لەم یاسایەی لاداوەو نامۆیە (شازە)، کە هاوشێوەو هاوقەبارە نین.

هەر لەتێك لە کرۆمۆسوم دوو زنجیری تەواوکەری یەکتریە، پێکهاتووە لە ماددەی شەکرو فۆسفۆرو تفتی ئەمینی. ئەو دوو زنجیرەیە لەیەکتری ئاڵاون وەك لولپێچ و لە هەندێ شوێن وخاڵی تایبەتدا بەیەکتریەوە لکاون. یەك لەو زنجیرانە (Transcribed strand)ژمارەیەك لە زانیاری هەڵگرتووە کە کۆنترول وئاراستەی دروستکردنی هەندێ لەو پرۆتینانە دەکات لە DNA کە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە بونیادنانی خانەو، هەموو سیفەتەکانی مرۆڤی تیادا شاردراوەتەوە. ترشی DNA

---

1– بۆیەکان (الصبغيات): کرۆمۆسوم ووشەیەکی لاتینیە بە مانای ڕەنگاو ڕەنگ، هەروەك لە ناوەکەی دیارە کە کرۆمۆسومەکان یەکێك لە ڕەوشتەکانی بریتی یە لە وەرگرتنی ڕەنگ لە سەرەتای دابەش بوونی خانە. زانا ڤالدیار "Waldeyar" ئەم دیاردەی دۆزیەوەو لە ساڵی 1888ز. موريس بوكاي، ما أصل الإنسان، ص73 .

*2– Gray AT & Kevin TP. Anatomy & Physiology. P: 83.*
*-John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 884.*

چالاکی وسیفەت وکارو فەرمان وجۆری ئینزیمەکانی هەموو خانەکان ئاراستەو دیاری دەکات. ئەو کارانەی DNA ئەنجامی دەدات بەرنامەی بۆ داڕێژراوەو بە جۆری هیچ کارێك ناکات تەنها لە کاتی دیاری کراوی خۆی وبەبڕی دیاری کراو نەبێ.[1] بنواڕە شێوەی ژمارە 15: ترشی ناوکی RNA و پرۆتینەکانی

لەکاتی دابەش بوونی ئاسایی لە خانەی جەستەیی(الانقسام العادي- Mitosis ) هەر کرۆمۆسومێك دوو هێند دەبێت بۆ پێکهێنانی دوو کرۆمۆسومی دوو هێند بوو (دوو کرۆماتیدی برا)، کەوا دەردەکەون وەك یەك کرۆمۆسوم بن، بە دەست پێ کردنی کرداری دابەش بوونەکە هەردوو کرۆمۆسومەکە لێك دوور دەکەونەوە. هەر خانەیەك لە خانەکانی لەشی مرۆڤ 46 کرۆمۆسومی تیایە پێش دابەش بوونەکە، دوو هێند دەبن ودەبنە 92 کرۆمۆسوم، کاتی کرداری دابەش بوونی خانەکە تەواو دەبێت ئەوا 46 کرۆمۆسومیان دەچێتە خانەیەك و 46 کرۆمۆسومەکەی تریش دەچێتە خانەی دووەم. لەکۆتایی دابەش بوونەکەدا دوو خانەی هاوشێوەی لەیەکچوو دروست دەبێت، هەر یەکە لە دوو خانە ساوا ونوێیە هەمان ژمارەو جۆری کرۆمۆسوم وەردەگرێت کە لە بنچینەدا لە دایکەخانەدا هەبووە.[2] ئەم دابەش بوونە لە لەشی مرۆڤ و زیندەوەران ڕوودەدات وپێویستە، بە تایبەتی لە قۆناغی کۆرپەلە و دوای لەدایکبوون، وەك گەشەو هەڵدانەوە(نۆژەبوونەوە).

هەموو خانەکانی لەش بەم جۆرە دابەش دەبن بەبێ هیچ لاریەك و لادانێك لەم یاسایە. تەنها لە یەك شوێنی لەش نەبێت ئەویش هێلکەی گونە لە پیاو وهێلکەدانە لە ئافرەت، کە لە کاتی دابەش بووندا هەرخانەیەکی نوێ تەنها 23 کرۆمۆسومی

---

1— هەردوو زانا واتسون وکریك دەڵێن: هەر ترشێك لە ناو ناوکی خانە لە هەزار پێنج پێکهاتووە کە بۆماوەکانی لەسەر دابەش بووە، بە شێوەیەك کەوا تاوەکو ئێستا زانیاری پزیشکی نەیتوانیووە زۆربەی زۆری لایەنەکانی تەفسیری دروستی بۆ بکات. ئەو بۆماوانە سیفەتەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن لە باوك ودایکەوە بۆ نەوە یەك لەدوای یەکەکان. درێژی هەریەك لەو پێچانە تەنها 30 ئەنگستوم دەبێت. کنجو، جلبي، الطب محراب الإيمان، 64/1.

2— *Gray AT& Kevin T P. Anatomy& Physiology. P: 105*

*- John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 886.*

تیایە نەوەك 46، بەم جۆرە دابەش بوونە دەڵێن کەمەدابەش بوون(الانقسام الاختزالـــي- Meiosis). ئەمەش لەبەر ئەوەیە کاتی پیتێن، ئەم دوو توخمە خانەیە یەکتری دەگرن ودەبنە یەك خانەو هەردوو ژمارە کرۆمۆسومەکان تێکەڵ بەیەك دەبن ودەبێتەوە 46 کرۆمۆسوم.

خانەکانی گون دەگۆڕێن بۆ توخمە خانەی نێرە(سپێرم)، خانەکانی هێلکەدانیش دەگۆڕێن بۆ هێلکەی پێگەیشتوو. ئەو دوو خانەیەش خۆ ئامادەدەکەن بۆ پیتێن، زنجیرەیەك لە گۆڕانکاری گرنکیش ڕوودەدات لەم کردارەدا، کرۆمۆسۆمەکان و سایتۆپلازم دەگرێتەوە، لەو گۆڕانکاریانە:

1- جووت کۆمەڵە کرۆمۆسوم (العدد الضعفاني- Diploid ) کەم دەبێتەوە بۆ تاك کۆمەڵە کرۆمۆسۆم (العدد الفرداني- Haploid). ئەوەش شتێکی زۆر پێویستە بۆ پارێزگاری کردن لەسەر جووتە ژمارەی کرۆمۆسومەکان وچەسپاندنی پاش پیتێن، گەر وا نەبووایە ژمارەی کرۆمۆسومەکان لە هەر نەوەیەك بۆ نەوەیەکی تر دەبووە دووبەرابەرو بەم شێوە ژمارەکە سەردەکەوت بۆ ژمارەی کۆتایی نەهاتوو لەڕێگەی کەمە دابەش بوون.[1]

2- گۆڕانی توخمە خانەی نێرینە لە خانەیەکی خڕی نەجولاوەوە بۆ خانەیەکی تر کە لە سەرو مل وکلك پێکهاتووەو توانایەکی زۆریش هەیە بۆ جولان، لە کاتی پیتێن سپێرم زۆربەی قەبارەی سایتۆپلازمەکەی وون دەکات، بە پێچەوانەوە خانەی مێینە قەبارەکەی زیاد دەکات بە زیادبوونی سایتۆپلازمەکەی.[2]

---

1ـ ا لتهامي، محمد عبد المجيد، أسس علم الأجنة، ص3.

2ـ التهامي، أسس علم الأجنة ، ص4.

## بڕگەی دووەم: جیاوازی نێوان کرۆمۆسومەکانی زاوزێی هەردوو ڕەگەز

1- هێمای نێرینە بریتی یە لە y ، هێمای مێینە بریتی یە لە x. توخمە خانەی نێرینە(سپێرم) هەردوو کرۆمۆسومی نێرینەو مێینەی هەلگرتووە xy، بەڵام توخمە خانەی مێینە(هێلکە) تەنها کرۆمۆسومی مێینەی هەلگرتووە xx .

2- ئەگەر سپێرمەکە هێمای y ی هەلگرتبوو جووت بوو لەگەل هێلکە کە هەردەم هێمای x ی هەیە ئەوا دوای پیتێن دەبێتە 46-xy کە ئەوەش مانای وایە کۆرپەلەکە ڕەگەزی نێر دەردەچێت، ئەگەر سپێرمەکە هێمای x هەلگرتبوو جووت بوو لەگەل هێلکە کە هەردەم هیمای x ی هەیە، ئەوا دوای پیتێن دەبێتە 46-xx ، ئەوەش واتای وایە کۆرپەلەکە ڕەگەزی مێ دەردەچێت. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا ڕەگەزی نێرەو مێ یە بە هۆی جۆری سپێرمەوە دیاری دەکرێت. ئەو ڕاستیەش قورئانی پیرۆز پێش1400 ساڵ باسی کردووە، بەلام لەبەر دووری موسولمانانی سەردەم لە ئاین و زانست نەیان توانیوە هەستی پێ بکەن تاوەکو زانایانی ڕۆژئاوا پاش ماندووبونەکی زۆر گەیشتنە ئەم ڕاستیە. هەروەك داهێنەرو دروستکەرمان فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴾ النجم : 45-46

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴾ القيامة: 36-37.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾ البقـرة: 223. واتە ئافرەتیش هەروەك كێلگەیێك وایە چی تیا بچێنی هەر ئەو شتە دێتە بەرهەم، ئەمەش واتایە دەگەنێ، کە وایە سپێرمەکە چ جۆرێك بێت ئەو ڕەگەزەکە دیاری دەکات کە نێرەیە، یان مێ یە.

3- کرۆمۆسومیy زۆر بچوکەو تەنها دەیەها بۆماوەی هەلگرتووە، بەلام x زۆر لەو گەورەترەو 2000–3000 بۆماوەی هەلگرتووە. کرۆمۆسومیy لە قەبارەدا بچوکترە لە بچووکترین کرۆمۆسومی جەستەیی، بەلام x لە زنجیرەی

کرۆمۆسومەکان لە ژمارەی حەوتەمینە لە قەبارەدا. هەرچەندە y لە قەبارەدا بچوکە بەڵام توانایەکی چاوەڕوان نەکراوی هەیە.[1]

4- کرۆمۆسومی x زۆر پێویستە بۆ ژیان ومانەوە، بەڵام کرۆمۆسومیy زۆر پێویست نیە بۆ ژیان. ئەمەش سەلمێنراوە کەوا ئەو کۆرپەلانەی کرۆموسومیxo یان هەلگرتووە توانای ژیانیان هەیە، بەڵام ئەوانەی کرۆمۆسومیyo یان هەلگرتووە هەرگیز دروست نابن وەیان ناتوانن بژین. کەواتە کرۆمۆسومی y کە هێمای نێرینەیە بەبێ بوونی x کە هێمای مێینە ناتوانێ بژیت، بەڵام x بە تەنهایی بەبێ y دەتوانی بژیت هەرچەندە گەر کۆرپەلەکە ناتەواویش بێت.[2]

## بەندی دووەم : پێکهاتەی توخمە خانەکان وجیاوازی نێوانیان.

### برگەی یەکەم: پێکهاتەی توخمە خانەکان (سپێرم و هێلکە)

### یەکەم: توخمە خانەی نێرینە(تۆو- سپێرم-النطفة).

سپێرم لەناو جووتە هێلکەی گون دروست دەبێت بە تێکرایی 300 ملیون لە هەرجارێکی هاویشتن، ئەمە لە سەرەتای ژیانی زاوزێیدا. سپێرم پاش دەرهاویشتن توانای ژیانی هەیە بۆ ماوەی 48-72 سەعات لە ناو کۆئەندامی زاوزێی مێیەدا.[3] جا گەر پیتێن رووی نەدا ئەوا گشتیان دەمرن.

سپێرم لە سەرو مل و کلك پێکهاتووە. سەر: هەموو پێکهاتەکانی ناوکی خانەی تیایە، هەروەها مایتۆکوندریای(Mitochondria) تیایە کە جوولە ووزە دەبەخشێ بە سپێرم بۆ گەیشتن بە هێلکەی مێینە ولە رووی پێشەوەی سەری سپێرم ناوچەی برەر(قونس- Acrosome) هەیە کە ئینزیمی تایبەتی تیایە هاوکارە بۆ برینی دیواری هێلکەی مێینە لەکاتی پیتێندا (الإخصاب- Fertilization) وکلکی سپێرم

1ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص42.

2 _ *Stuart Cl& Cristoph . Obestetric by ten teachers. P:178.*

3_ *Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 855.*

وەك سەوڵ وایە جوولەی سپێرمی لە ئەستۆدایە بۆ هەموو ئاراستەکان.[1] بنواڕە شێوەی ژمارە 16: توخمە خانەی نێرینە.

درێژی سپێرم50 مایکرونە، درێژی کلکی 40 مایکرونە، تێکڕای خێرایی یەکەی 2- 3 میلیمەترە لە یەك خولەکدا، واتە سپێرم دەگاتە ناو بۆشایی منداڵدان پاش 4- 6 کاتژمێر لەدوای جووتبون.[2]

ئەو سپێرمەی کە هێمای نێرینەی هەڵگرتووە y لە نووکی سەریەوە بریسکەو ڕووناکیەکی هەیە، خێرا دەڕوات و بەتواناترە و دەگاتە قوڵایی منداڵدان بە کەمتر لە6 کاتژمێر، هەرچی ئەو سپێرمەی هێمای مێینەی هەڵگرتووەX ئەم بریسکەو ڕووناکیەکی نیەو بە هێواشی دەڕوات وتوانای کەمترە، زیاتر لە6 کاتژمێری دەوێت، تا دەگاتە ناو بۆشایی منداڵدان.[3] لەوانەیە یەکێك بپرسێ وبڵێ گەر وایە زۆربەی کۆرپەلەکان کوڕ دەبن؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە سێ خاڵ دەخەینە ڕوو:

1- بە تێکرایی لە هەموو کۆمەڵگەکانی جیهان، هەروەها لە شاری هەولێریش بە پێ ی ڕاپۆرتەکانی بەشی سەرژمێری ناو نەخۆشخانەی منداڵبوون ڕێژەی منداڵبوونی کوڕ زیاترە لە کچان، بەڵام ڕێژەی مردنی نێرینە لە هەموو تەمەنەکان لە مێینە زیاترە، بۆیە لە کۆتاییدا دەبینین لە هەموو کۆمەڵگاکان ژمارەی مێینە زیاترە لە نێرینە.

2- مەرج نیە ئەو سپێرمانەی هێمای نێرینەیان هەیە کاتی گەیشتن بە هێلکە بتوانن دیواری هێلکە ببڕن و بچنە ژوورەوە وپیتێن ڕووبدات.

---

*1– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 989.*
*- Frances SG &Gordon. Basic&Clinical Endocrinology. P: 2132.*
*2– Stuart C & Cristoph. Obstetric by ten teacher. P: 37.*
*-Kenneth. Principle& Practice of Endocrinology. P: 944.*

– عبد الحميد دياب وأحمد قرقور مع الطب في القرآن الكريم، ص76.جیاوازی هەیە لە درێژی و خێرایی سپێرم لە یەکێکەوە بۆ یەکی تر. ئەو ژمارانەی ئێمە وەرمان گرتووە تێکرایی یە. بە هەمان شێوە بۆ زۆربەی ژمارەکانی تر.

3– البار، محمد علي ، خلق الإنسان بين الطب والقرآن ، ص135.

3- له هەموویان گرنگتر ئەوەیە کۆرپەلە گەر نێرینە یان مێینە بێت، بە دانان وبریاری خودای گەورەیە. ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ الشورى: 48-49. واتە خوا خۆی خولقێنەرو بەخشەرە، گەر بیەوێ مێینەتان پێدەدات یان نێرینە، یان هەردووکیان. زۆر جاریش هەندێکتان نەزۆك دەکات، هەر خۆی زاناو بە توانایە.

**دووەم : تۆخمە خانەی مێینە (هێلکەی پێگەیشتوو_ البويضة).**

ئەرك وفەرمانی هێلکەدان دروستکردنی هێلکەو هاویشتنی بۆ ناو جۆگەی هێلکەیە، دروستکردنی هۆرمۆنەکانی مێینە وەك: ئیستروجین(Estrogen )، برۆجیسترون (Progesterone)، ریلاکسین (Relaxin)، ئینهبین(Inhibitin). هەموو مانگێك یەکێك لەو دووهێلکەدانە هێلکەیەکی پێگەیشتوو دەردەهاوێت بۆ ناو جۆگەی هێلکە بە هیوای پیتێن بوون، بەو کردارە دەڵێن هێلکەدانان (الإباضة- Ovulation). شێوەی ژمارە 17: تۆخمە خانەی مێینە – هێلکە-وکلاوەی بریقەداری.

ژمارەی هێلکەکانی ناو هەردوو هێلکەدان هەر لەسەرەتای ژیانی لەدایکبوونی کۆرپەلە دیاری کراوە و دەگاتە نزیکەی( 2000000) هێلکەو ئەو ژمارەیە زیاد ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە 99.9٪ ئەم ژمارەیە بەهۆی کرداری پوکانەوە"Atresic process" لەناو دەچن وتەنها 400-500 هێلکە دەمێنێ بە درێژایی تەمەنی زاوزێی ئافرەت. ئەو پوکانەوەش بە هۆی بوونی هۆرمونی نێرینەیە (تستۆستیرون) لە ناو خوێنی ئافرەتدا. لەناو هێلکەداندا خانەی هێلکە بە هێلکەدانە چیکڵدانەکان دەورەدراوە (Ovarian Folliclle). کاتێ ئەم چیکلدانەیە پێدەگات پێ ی دەڵێن چیکڵدانەی گرافیان (Grafian Follicle) و هەر ئەویش هێلکەی پێگەیشوو دەردەهاوێت وهۆرمۆنی ئیستروجینیش دەرژێنێت. پاشان ئەم

چیکلدانەیە بۆ زەردە تەن دەگۆڕێ (الجسم الأصفر - Corpus Lutem)، کە هۆرمۆنی ئیستروجین وبرۆجیسترون دەرژێنێت، تەنها دوو هەفتە هۆرمونەکان دەرژێنێت، گەر پیتێنی نێوان سپێرم وهێلکەی مێینە ڕووینەدا و سک پڕی نەبوو، ئەوا دەمرێ و بۆ تەنی سپی دەگۆڕێ (الجسم الأبیض - Corpus Albicans). بەلام گەر پیتێن وسک پڕی ڕوویدا، ئەوا بۆ زەردە تەنی سک پڕی دەگۆڕێ (جسم الحمل الأصفر - Corpus Lutem of pregnancy)، کە ڕژاندنی هەموو هۆرمۆنەکانی مێینە کە پێویستن بۆ مانەوەی کۆرپەلە دەگرێتە ئەستۆ، تاوەکو وێلاش گەشە دەکات وشوێنی ئەو دەگرتەوە. پاش سێ مانگ زەردە تەنی سک پڕی بەتەواوی لەناو دەچێت و وێلاش دەست بەکاردەبێت بۆ ڕژاندنی هۆرمۆنەکان. شێوەی 18: قۆناغەکانی گواستنەوەی هێلکە لە هێلکە دانەوە بۆ منداڵدان.

### بڕگەی دووەم: جیاوازی نێوان توخمە خانەکان (سپێرم و هێلکە).

1- هێلکە لە سپێرم زۆر گەورەترە. تیرەی خانەیەکی ئاسایی لەش 7.5مایکرۆنە، سپێرم لە 50 مایکرۆن تێ ناپەڕێت[1]، بەلام هێلکە تیرەکەی 400 مایکرۆنە[2]، واتە گەورەترین خانەیە لە لەشی مرۆڤدا. هەرچەندە سپێرم زۆر بچوکترە لە هێلکە بەلام بەشداری دەکات لە نیوەی پێکهاتەی کۆرپەلە هەروەک هێلکە. نهێنی ئەم جیاوازیە لە قەبارەدا لەوەدایە کەوا هێلکە لێپرسراوە لە خۆراک و گەشەی ئەم خانە نوێیەی کە دروست بووە لە ئەنجامی پیتێن، کە پێی دەڵێن خانەی پیتێنراو، کە نیوە کرۆمۆسۆمی باوک (سپێرم) ونیوە کرۆمۆسۆمی دایکی(هێلکە) تیایە. شێوەی ژمارە 19: هێلکە کاتی پیتێن.

ئەو لێپرسراویەی هێلکە بەردەوام دەبێت بۆماوەی 8 ڕۆژ تاوەکو خانەی پیتێنراو خۆی دەنوسێنێ بە دیواری منداڵدان و دەچێتە قۆناغی

---

*1_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 949.*
*2 _Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 782.*

هەڵواسراو(العلقة).[1] لێرەوە هەڵواسراوە تەن خۆراك و خوێن وهەوا وەردەگرێ لە دیواری منداڵدان وپارێزگاری تەواویشی لێدەکرێت. لە هەمان کات پاشەڕۆکانی خۆی دەردەهاوێتە ناو خوێنی دایك ولەوێوە بۆ دەرەوەی لەش. ئەو کردارە بەردەوام دەبێت تاوەکو دەبێتە کۆرپەلەیەکی تەواوو لەدایك دەبێت. دووبارە دایك خۆراك و خوێن و شیرو سۆزو بەزەیی خۆی پێدەدات تاوەکو گەورە دەبێت. بۆمان دەردەکەوێت هەر لەسەرەتای کرداری پیتێن وقۆناغەکانی دروست بوون وگەشەی کۆرپەلە، دایك لە خۆراك و ووزەی خۆی دەبەخشێت، زۆر زیاتر لەوەی کە باوك ئەنجامی دەدات. دەتوانین بڵێین ڕۆڵی باوك لە ماوەدا کورتەو تەنها پیتێنەو بەس.
شێوەی ژمارە20: کۆرپەلەیەکی تەواو.

پاش ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستیانە دەتوانین بڵێین کەوا ووزەی نێرینە هەر لە سەرەتای ژیانیەوە کە لە سپێرم خۆی دەنوێنێ بریتی یە لە: جووڵە ووزەو چالاکی دەرەکی وهێزی چوون بۆ پێشەوەو پاڵنان وڕووبەڕووبوونەوە، بەلام ووزەی مێینە کە لە(هێلکە) خۆی دەنوێنێ بریتی یە لە: ووزەیەکی نەرم وشاراوە، نواندنی چالاکی لە ناوەوەو توانای دروستکردن و شێوەنانەوەی هەیە (التکوین و التشکیل).

2- سپێرم لە قەبارە بچوکەو، جووڵەی خێرایەو توانای بەرەوپێشەوە چوون و سەرکەوتن وجووڵەی ئەولاو ئەولای زۆرە، بەناو بۆشایی منداڵداندا دەڕوات بۆ سەرەوە و بەربەرەکانی دەکەن لەگەڵ یەکتریدا هەر یەکێکیان هەوڵ دەدات بە هەموو توانای خۆی تاوەکو بگاتە ئامانجی خۆی کە جووتبوونە لەگەڵ هێلکە وەیان لەو پێناوەدا دەمرێت، بەلام هێلکە بە پێچەوانەی ئەوە بە تەواوی، کە جوان ڕازاوەتەوە وەك مانگی چواردە شەو خۆی دەنوێنی، لە ڕوکاری دەرەوەی کڵاوەیەکی بریسکەدارو گەشاوە هەیە وپێ ی دەڵێن کڵاوەی زێرینە – تاجی بریقەدار(التاج المشع- Corona radiate) تاوەکو سەرنجی سپێرم بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، جووڵەی زۆر هێواشەو لارو لەنجەی زۆری تیایە، بە ژمارەکی زۆر لە

1ـــ البار، محمد علي، خلق الإنسان بين الطب والقرآن، ص164.
*– Gray AT& Kevin TP. Anatom y &Physiology. P: 69*

خانەی کلکدار دەورە دراوەو هێواش هێواش پاڵی دەدەن ودەیجوولێنن ولەهەمان کات پارێزگاری دەکەن تاوەکو دەگەنە شوێنی مەبەستن (ئەویش سێ یەکی کۆتایی جۆگەی هێلکەیە)، لەو شوێنە دەمێنێ لەگەل خزمەتکارو پارێزکارەکانی و چاوەڕوانی ئەو سپیرمەن کە خودای گەورە بۆی داناوە سەربکەوێت ولەگەلی جووت بێت وپیتێن ڕوبدات. هەرکاتێ کە پیتێن ڕوویدا هێلکە بە چوار دەوری خۆی دیوارێکی پتەو دروست دەکات ونایەڵێت سپێرمەکانی تر نزیکی بکەونەوە کە ژمارەیان چەند سەدێکە، هەرچەندە بەتواناو بەهێزیش بن، هەر هەموویان دەمرن بەغەم وپەژارەوە. ئەم ڕوداوانەی باسمان کردن لە ژیانی هێلکەو سپێرم ڕەنگدانەوەیەکی زۆر واقیعی وکاریگەرو لەیەکچویان هەیە لەگەلَ ژیانی نێرو مێ کاتێ دەگەنە تەمەنی زازێ و گەورەبوون، هەروەها کاریگەریشی هەیە لەسەر زۆر ئەرك و فەرمانەکانی پێیان سپێردراوە لە ژیانی ڕۆژانەیان، هەروەك بڵێ ی ئەم شتانە بۆیان ڕێکخراوە ودیاری کراوە هەر لە سەرەتای دروست بوونی ئادەمیزاد کە هێشتا هەر لە قۆناغی توخمە خانەیە جا چ نێرینە بێت وەیان مێینە. واتە سپێرم بە جوانترین شێوە تەمثیلی هەڵسوکەوتی نێرینە دەکات ، هێلکەش بەهەمان شێوە تەمثیلی هەڵسو کەوتی مێینە دەکات لە دوارۆژدا. لە بەرگی دووەمدا بە درێژی باسی ئەو بابەت و حوکمانە دەکەین کە بە پەیوەستن بە ئافرەت و پیاو، بەپشتیوانی خوا.

3- دابەشبوون لە توخمە خانەی نێرینە ڕوونادات تاوەکو نێرینە نەگاتە تەمەنی پێگەیشتوو(بالغ بوون)، سپێرم 10- 14 ڕۆژی دەوێت تاوەکو دەبێتە توخمە خانەیەکی تەواو پێگەیشتوو وتوانای پیتێنی هەبێ، بەلام لە مێینەدا توخمە خانە(هێلکەی پێنەگەیشتوو) دروست دەبێت هێشتا کورپەلەیە لە سکی دایکیدایە، تەواو گەشە دەکات وپێدەگات دوای شووکردنی وهاتنی سپێرم بۆ پیتێن. دوایین هێلکە کە لە هێلکەدان دەردەچێت پێش ئەوەی ئافرەت بگاتە تەمەنی (لەبێ نوێژی کەوتن)تەمەنی ئەو هێلکەیە نزیکەی 50 ساڵ دەبێت.[1]

---

*1– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 115.*
*- John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 896.*

4- ژمارەی سپێرم زۆرە، دەگاتە 300 ملیۆن لە هەرجووتبوونێکدا، بەڵام هێلکە ژمارەیان تەنها 400- 500 دانەیە وهەر مانگێك یەك هێلکە دەردەچێت. ئەو هێلکانەی دەپیتێنرێن لە هەر ئافرەتێکدا لە چەند دانەیەك تێپەڕ ناکات. واتە بەرامبەر هەر هێلکەیەك جووتە گون یەك بلیۆن سپێرم دروست دەکات لە تەواوی ژیاندا.

هەروەك دیمان کەوا ڕۆڵی ئافرەت لە مانەوەی جۆری ئادەمیزاد زۆر زیاترە لە ڕۆڵی پیاو، چونکە بەبێ کرۆمۆسۆمی مێینەX هەر لەسەرەتاوە ژیان نابێت، خانەی پیتێنراو دروست نابێت بەبێ هێلکە، خانەی پیتێنراو گەشە ناکات بەبێ سایتۆپلازمی ناو هێلکە، کۆرپەلە بەبێ منداڵدانی دایك گەشە ناکات وناژیت لە شوێنی تر، دوای لە دایکبوون، شیری پاك و گەرم وبێگەردو سۆزوبەزەیی و چاودێری و پەروەردەی ئەو نەبێت نابێتە ڕۆڵەیەکی بەسوودی کۆمەڵ. واتە فەرامۆش کردنی ڕۆڵی ئافرەت وگرنگی پێنەدانی لەم بوارەدا وابزانم دژایەتی مرۆڤایەتی ونەتەوایەتی و گشت یاساکانی ئاسمان وزەوی وفیترەت و خودی کەسایەتی ئافرەتیشە، چونکە ئامانجی سەرەکی گشت ئافرەتێك لە شووکردن، هێنانە بەرهەمی منداڵەو تەواوکردنی سۆزو ئارەزوویەتی لە ژیان، ژیانی ئافرەتی شووکردوو بێ منداڵ هەردەم تاڵەو بەختەوەری خێزانیش هەر بە بوونی منداڵەو سەرکەوتنی کۆمەڵگەش هەر بە پەروەردەی منداڵە لە ئامێزی دایکیدا. لە بەشی سێیەمدا بە درێژی باسی دایکایەتی گرنگیەکەی دەکەین لە ژیانی ئافرەتدا.

# باسی دووەم

## ڕژێنە گلاندەکان و هۆرمۆنەکانی

بەندی یەکەم: ڕژێنی ژێرچوارپای بینین وڕژێنەی ژێر مێشك(شای ڕژێنەکان)

بڕگەی یەکەم؛ ڕژێنی ژێر چوارپای بینین

بڕگەی دووەم ؛ ڕژێنی ژێر مێشك

بەندی دووەم: ڕژێنی دەرەقی وهاوسێی دەرەقی ڕژێنی سەرگورچیلە

بڕگەی یەکەم: ڕژێنی سەرگورچیلە

بڕگەی دووەم؛ ڕژێنی دەرەقی وهاوسێی دەرەقی

بەندی سێیەم: توخمە هۆرمونەکانی نێرینەو مێینەو هۆرمونە هاوبەشەکان

بڕگەی یەکەم: توخمە هۆرمونەکانی نێرینە

بڕگەی دووەم: توخمە هۆرمونەکانی مێینە

بڕگەی سێیەم: هۆرمونە هاوبەشەکانی نێوان نێرینەو مێینە

## دەروازە

پاش ئەوەی باسێکی تەواوی کۆئەندامە دیارەکانی دەرەوەو ناوەوەی لەشمان کردو بۆمان دیار کەوت کەوا نێرینەو مێینە جیاوازن لە پێکهاتەی جەستەیی و قەبارەو کاری ئەندامەکانی. هۆرمۆنەکان کاریگەریەکی بەرچاووی تەواویان هەیە لەدروست بوونی ئەو جیاوازیانە.

رژێنە گلاندەکان بریتین لەو گلاندانەی کە هیچ جۆگەیەکیان نیە بۆ دەردانی ئەو هۆرمۆنانەی دروستی دەکەن، بەڵکو لە رێگەی خوێن، یان کرداری بڵاوبوونەوە کار لەو ئەندامانە دەکات کە بۆیان دیاری کراوە، هەریەکێکیان یەك هۆرمۆن یان زیاتر دەرژێنێ. هەرچەندە بڕی ئەو هۆرمۆنەی کە ئەو رژێنەگلاندانە دەیرژێنن زۆر زۆر کەمە، بەڵام بەردەوامەو نەگۆڕەو هاوسەنگە. هەر زیادو کەمیەك لە بڕی هەریەکێك لەوهۆرمۆنانە ڕوویدات ئەوا پشێویەکی جەستەیی یان دەروونی زۆر دروست دەکات.[1] کاری رژێنە گلاندەکان پەیوەست نیە بە تەمەنێك وکاتێکی تایبەت و دیاری کراو، بەڵکو تاوەکو کۆتایی ژیانی ئادەمیزاد درێژ دەبێتەوە.

هۆرمۆنەکان کاریگەرییان هەیە لە سەر دیاریکردنی شێوەی لەش و بونیادی کەسایەتی وتیژی بیرو هۆش وپێگەیشتنی بیرکردنەوەو ڕوونی دەربڕین وهێزی جەستەو جوانی ڕەنگ وخۆشی دەنگ و ورێکوپێکی لەش و وهاوسەنگی سۆزو ئەندێشەی هەردوو ڕەگەز. هەروەها رژێنە گلاندەکان هاوکاری سەرەکی لەشن بۆ سەرکەوتن بەسەر کێشەو بارە ناهەموارو نالەبارەکانی بەسەریدا تێدەپەرێت. رژێنە گلاندەکان بە هاوکاری کۆئەندامی دەمار کاردەکات بۆ ڕاگرتنی لەنگەری لەش و رێکخستنی کرداری زیندەچالاکی و گەشەو زاوزێ وڕاگرتنی لەنگەری ڕێژەی ئایۆنەکان و خوێ وئاوو شلەکانی تری ناو لەش.

---

*1 – Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 487.*
*- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 776.*

لەبەر بوونی ئەم هەموو کاریگەریەی هۆرمۆنەکان لەسەر لەشی ئادەمیزاد بەگشتی، بە پێویستم زانی کەوا بە ووردی باسیان بکەم تاوەکو خوێنەری بەرێز زیاتر ئاگاداری کارو کاریگەرەکانیان بێت لە سەر هەردوو رەگەز.

## بەندی یەکەم: رژێنی ژێر چوارپای بینین ورژێنی ژێر مێشک

### برگەی یەکەم: رژێنی ژێر چوارپای بینین (غدة تحت السرير البصري- The Hypothalamus Gland)

ئەرك و فەرمانی رژێنی ژێر چوارپای بینین زۆر گرنگەو تەواکەری ئەرك و فەرمانی کۆئەندامی دەمارو رژێنەگلاندەکانە، هەروەك پردێك وایە لە نێوانیان.

ئەو رژێنە لە دوو کۆمەڵ خانەی (دەمارە رژێن) پێکهاتووە، یەکیان دروستکەری هۆرمونەکانی بەشی دواوەی رژێنەی ژێر مێشکە، ئەوی تریان هەندێ دەرهاوێژە فاکتەر (عوامل محررة–releasing factors) بەرهەم دەهێنێ کە ئەرك وفەرمانی بەشی پێشەوەی رژێنەی ژێر مێشك رێکدەخات.[1] رژێنی ژێر چوارپای بینین ئەم دوو هۆرمونە بەرهەم دەهێنێ:

1- هۆرمونی دژە میزتن– پەستان بزوێن(المانع لإدرار البول- anti diuretic –ADH) ئەو هۆرمونە لەگەل خوێن دەچێتە ناو هەندێ خانەی تایبەت لە ناو هەردوو گورچیلە، فەرمانی گێرانەوەی ئاوو خوێ یان پێدەدات بۆ ناو خوێن و دەرنەهاویشتنی بۆ دەرەوە، بەمەش قەبارەی میز کەم دەبێتەوە، بە هۆیەوە هاوسەنگی پاڵەپەستۆی ئۆزمۆل(الضغط الأسموزي للدم–Osmolarity ) ناوخوێنیش رادەگرێ، بۆیە کەمی یان نەبوونی ئەم هۆرمونە دەبێتە هۆی میزکردنێکی بێ شومار.[2]

---

1_ *Leslie JD. Endocrinology. P: 1/97.*
- *Frances SG & Gordon. Basic&Clinical Endocrinology. P: 10.*
- ماري كلود، دليل المرأة الطبي في الصحة والمرض، ص40-42.

2_ *Gray AT &Kevin TP. Anatomy& Physiology, P: 501.*
*Frances SG &Gordon. Basic& ClinicalEndocrinology. P:146.*

2- هۆرمـۆنی ژان بـزوێن- خێراكردنـی منـداڵبوون(هۆرمـۆنی ئۆكیتۆسـین- Oxytocin ) ئەوهۆرمۆنە كار دەكاتـە سـەر ماسـولكەكانی منداڵـدان وگلانـدەكانی شیر دروست كردن لە مەمكدا. رێژەی ئەو هۆرمونە زیاد دەبێت لەناو خوێن لە كاتی منداڵبوون وكاتی شیر پێدانی دایك بۆ كۆرپەكەی. لە كاتی منداڵبوون ماسولكەكانی منداڵدان كرژ دەكات بۆ ئەوەی بتوانێ كۆرپـەلـە و ویـلاش بـۆ دەرەوەی لـەش پـاڵ بدات. زۆر جار پزیشكانی منداڵبوون ئەم هۆرمۆنە بەكاردەهێنن بۆ ئەوەی بتوانن بە خێرایـی كـرداری منـداڵبوون ئـەنجام بـدەن ولـە كـاتی شـیر پێـدان هاوكـارە بـۆ دەرهاویشتنی شیر بەشێوەیەكی گونجاوو پێویست.[1]

## برگەی دووەم: رژێنی ژێر مێشك (ملكة الغدد -الغدة النخامية - The pituitary Gland)

شوێنەكەی دەكەوێتە تەختایی دەمـاخ و بـە ئێـسكان دەورە دراوە. هەرچـەندە قەبارەكەی بچوكە بەڵام بە شـای رژێنـەكان ناسـراوە، چـونكە هۆرمۆنـەكانی كـاری رێكخستن و كۆنترۆل كردنی هەموو رژێنەگلاندەكانی تری ناو لەشە. ئەو رژێنەیە لـە دوو بەش پێكهـاتووە، بەشـێكی رژێنـی زەردبـاو كـە پـێ ی دەڵـێن پلـی پێـشەوە، بەشێكی دەماری سپی باوە، كە پێ ی دەڵێن پلی پشتەوە، كە كاری هەر یـەكیان جیایە لەوی تر. پلـی پـشتەوە لـە ژێـر كاریگـەری رژێنـی ژێـر چـوارپای بیـنین كـار دەكات هەروەك باسمـان كـرد كـە هـەردوو هۆرمـونی ئۆكسـیتۆسین وهۆرمـۆنی دژە میزتن دەرژێنێ. بەشـی پێـشەوەی ژمارەیـەكی زۆر لـە هۆرمـۆن دەرژێنـێ كـە كـار لەسەر رژێنەكانی تری لەش دەكات. ئەو رژێنەیە لە بەشە جیاكانی دەمـاخ زانیـاری وەردەگرێ ، لەسەر ڕەوشی ئەو زانیاریانە كاری خۆی رێكدەخات. بـەڵام كـۆنترۆڵی بـڕو دەرچـوونی ئـەو هۆرمونانـە لـە ژێـر چـاودێری رژێنـی ژێـر چـوارپای بینینـەوە دەبێت.[2]

---

1– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 891.

2– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 495.

-Frances SG &Gordon J. Endocrinology. P: 12.

## هۆرمۆنەکانی بەشی پێشەوەی رژێنەی ژێر مێشك:

ژمارەیەك لە هۆرمۆنی پرۆتینی وپیپتیدی دەرژێنێ، چوار لەمانە کاردەکەنە سەر رژێنەگلاندەکانی تر بۆ بەرهەم هێنانی هۆرمۆن ورژاندنیان.

1- هۆرمۆنی ماندەری رژێنەی دەرەقی (الهرمـون المحفـز للغـدة الدرقيـة TSH" Thyroid -stimulating hormone) کـۆنترۆلی بەرهـەم هێنـان ودەرچوونی هۆرمۆنەکانی گلاندی دەرەقی دەکات.

2- هۆرمۆنی ماندەری توێکلی سەر گورچیلە رژێن (المنشط لقشرة الغدة الكظرية ACTH- Adrenocoticotropin) کـۆنترۆلی بەرهـەم هێنـان ودەرچـوونی هۆرمۆنەکانی توێکلی گلاندی سەر گورچیلە دەکات.

3- مانـدەرە هۆرمـۆنی چـیکڵدانەکان (المنـشط للحوصـلة- Follicle FSH -Stimulating Hormone) کونترۆلی دروستکردنی هێلکە دەکات.

4- ماندەرە هۆرمـۆنی زەردە تـەن (المنشط للجـسم الأصـفر- Lutenizing LH- Hormone). کۆنترۆلی کرداری زاوزێ و زۆربوون بەهۆی کاریگەری لـە سـەر کۆئەندامی زاوزێ دەکات.

5- هۆرمونی ماندەری گەشە (هرمون النمو- GH -Growth hormone) .

6- هۆرمونی ماندەری بەرهـەم هێنـانی شـیر(المفـرز للحليـب- Prolactin PRLH -hormone). ئـەم هۆرمونـە مەمکـەکان دەبزوێنـێ لـە مێینـەدا بـۆ شـیر دەردان.

7- ماندەر هۆرمونی بۆیەی میلانین (المحفز لصبغة الميلانـين Melanocyte Stimulating Hormone-MSH)، بـڕی ئـەو هۆرمونـە ڕەنگـی پێـستە دیـاری دەکات. گەر ڕێژەی لە خوێن زیاد بوو ئەوا ڕەنگی نادەمیزادەکە ڕەش دەبێت، وەك دانیشتوانی ئەفریقیاو ناوچە گەرمەکان. کـەمی دبێتـە هـۆی سـپی بـوونی پێـستە و سووتانەوەی کاتی ڕۆژ بەرکەوتنی پێ ی دەڵێن سپی بوون(Albinism).

8- هۆرمونی ئیندۆرفین(الإندروفن- Endorphins) .

9- هۆرمەنی ئینکیفالین (إنکفالن- Enkephalins ).

ئەو چوار هۆرمونی پێشەوە (1- 4) لە دواییدا بە درێژی باسیان دەکەین بە ویستی خوا. هۆرمونەکانی 8 و9 لەم ساڵانەی دوایی دۆزراونەتەوە وکاریگەریان لە سەر خودی مێشکەو ئەرك وفەرمانیان زۆر ڕوون نیە، بۆیە باسیان ناکەین چونکە خزمەتی بابەتی ئێمە ناکات.

هۆرمۆنی هاندەری گەشە: کاریگەری هەیە لە سەر ژمارەیەکی زۆر لە خانەو شانەی لەش، ڕاستەوخۆ هاوکاری گەشەی لەشە، ناراستەوخۆ هاوکاری گەشەیە بە هاندانی بەرهەم هێنانی هەندێ فاکتەری تری گەشە، وەك گەشەی کرکڕاگەو ئێسکان وهاندانی جگەرە(الکبد) بۆ دروستکردنی هۆرمۆنی سوماتومیدین[1] (Somatomedins).

ئاستی ئەو هۆرمۆنە لە خوێندا دەگاتە 1.25 مایکروگرام/مل$^3$. لە دوای لە دایکبوون و تەمەنی منداڵی وپێگەیشتن ئاستی ئەو هۆرمونە لە مێینە زیاترە لە نێرینە. ئاستی ئەو هۆرمونە لە تەمەنی منداڵی لە مێینە 2.3 مایکرو گرام/مل$^3$، لە نێرینە 1.5 مایکرو گرام/مل$^3$، لە تەمەنی11- 12 ساڵیدا ئاستی ئەو هۆرمونە لە مێینە و6.9 مایکرو گرام/مل$^3$، لە نێرینە 3.6 مایکرو گرام/مل$^3$. بەلام دوای پێگەیشتن ئاستی ئەو هۆرمونە لە نێرینە 3.4 مایکرو گرام/مل$^3$، لە مێینە 3.1 مایکرو گرام/مل$^3$.[2]

لەبەر بەرزی ئاستی ئەو هۆرمونە لە مێینە لە دوای لە دایکبوون تاوەکو تەمەنی پێگەیشتن، بۆیە پێگەیشتن و بالغ بوون لە مێینە 1.5- 2 ساڵ لە پێش نێرینەیە.

**هۆرمونی هاندەری بەرهەم هێنانی شیر:**

هۆرمونێکی پرۆتینیە، لە هۆرمونی گەشە دەچێت. ئەو هۆرمونە لە ئافرەتی سك پڕ پاش هەفتەی نۆزدەهەم دەرژێت ولە زیاد بووندایە بە هێواشی تاوەکو هەفتەی

1- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 126.
2- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 79, 129, 1462.

سێیەم، دەگاتە بەرزترین ئاست لە دوای لەدایکبوونی کۆرپەلە. کار دەکاتە سەر گەشەی شانەکانی مەمك وهانی ڕژانی شیر دەدات ڕاستەوخۆ دوای لە دایکبوون، هاندەرە بۆ زیاد بوونی ڕێژەی پرۆتین و چەوری وشەکر وکانزاکان لە ناو پێکهاتەی شیر.

بەڵام ئەو هۆرمۆنە لە نێرینە هانی جولانەوەی سپێرم دەدات وڕێژەی دەرهاویشتنی ئاوو خوێ لە گورچیلە کەم دەکاتەوە. ڕێژەی ئەو هۆرمونە لە مێینەی پێگەیشتوو، هەروەها لە کاتی سك پڕی زیاد دەکات بەڵام لە نێرینە زیاد ناکات.[1] ئاستی ئەو هۆرمونە لەئافرەتی ئاسایی کە سکی پڕی نەبێ وشیر نەداتە منداڵی و نەگەیشبێتە تەمەنی لە بێ نوێژی کەوتن، نزیکەی10- 20 نانو گرام/مل3، بەڵام لە پیاوو ئافرەتی پیر، سێ یەکی ئەو ڕێژەی سەرەوەیە3-7 نانو گرام/مل3.[2]

## بەندی دووەم: ڕژێنەی سەرگورچیلەو ڕژێنەی دەرەقی وهاوسێ ی دەرەقی.

### برگەی یەکەم: ڕژێنەی سەرگورچیلە( الغدة الكظرية- الغدة فوق الكلوية .(The Adrenal -supra renal Glands-

هەر ڕژێنەیەك دەکەوێتە سەر لوتکەی گورچیلەیەك وهەردووکیان هەمان قەبارەن، شێوەیان قوچەکی یە (الشكل الهرمـــي)، هەریەکیان لە دوو بەش پێك هاتوون، جیاوازن لە بنەچەو لە کارکردندا. ئەمانیش بریتین لە: توێکڵ، کە بەشی دەرەوەی ڕژێنەکە پێك دێنێ، کرۆك، بەشی ناوەوەی ڕژێنەکە پێك دێنێت.[3]

---

*1– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 136,788.*
*2– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 137,1462.*
*Jelliffee DB& Jelliffee (1978). Human Milk in Modern World,Psychological,Nutritional,Economical Significance. P: 54.*
*3– Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 506.*
*-Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 572-575..*

**یەکەم: کرۆکی ڕژێنەی سەرگورچیلە ( نخاع الغدة الكظرية- Medulla Adrenal Gland).**

لە ناو کرۆك خانەی(Chromaffin) هەیە کە دروست کەری هۆرمۆنی کاتیکۆلامینە(Catecholamines)، ئەویش دوو هۆرمونە (ئیفیدرین ونۆرئیفیدرین)، ئەم خانانەش لە ژێر کاریگەری کۆئەندامی بەسۆز کاردەکەن. کرۆك دوو هۆرمۆنی نزیکە لێکچوو لە پێکهاتندا دروست دەکات، لە ڕووی فرمانەوە کەمێك لێك جیاوازن. لەو کاتەی یەکێکیان کاردەکاتە سەر کرداری زیندە پاڵ کردنی خۆراك وزۆربوونی چالاکی دڵ ولەش، تاوەکو ئامادەبێت بۆ بەرەنگاری هەڵوێستە شلۆق وبارە کتوپڕەکان. هەروەها کاردەکاتە سەر دەردراوەکانی پلی پێشەوەی ڕژێنی ژێر مێشك، بەمەش هەست کردن بە ئازار کەم دەکاتەوە، ماسولکەمان توانای بەکارهێنانی شەکری گلوکوزیان زیاد دەکات، کلایکوجینی ناو جگەر دەگۆڕێ بۆ شەکری گلوکوز و بەمەش پلەی گەرمی لەش زیاد دەکات و لەش ئارەقەیەکی زۆر دەکات. هۆرمونەکەی تریان کارێکی سەرەکی دەکاتە سەر پاراستنی ئاستی سروستی پەستانی خوێن لە لەشدا، بە پلەی دووەمیش کاردەکاتە زیندەپاڵ کردنی خۆراك .[1]

**دووەم :توێکلی ڕژێنەی سەر گورچیلە(قشرة الغدة الكظرية Adrenal Gland cortex)**

توێکلی ڕژێنەی سەر گورچیلە بە هەمان شێوەی کرۆك کاتێ پاڵەپەستۆیەکی دەرەکی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە، ئەم ڕژێنە بە دەنگیەوە دێت. ئەو ڕژێنە لە ژێر کاریگەری کوێرە گلاندەکان کار دەکات زیاتر لەوەی دەمارە خانەکان. ڕژێنی ژێر چوارپای بینین هاندەرێك دەردەدات کە هانی گلاندی ژێر مێشك دەدات بۆ ڕژاندنی هۆرمونی(ACTH) کە ئەویش بە هۆی خوێنەوە دەگاتە ڕژێنی سەر گورچیلە وهانی دەدات بۆ ڕژاندنی ژمارەیەك لە ستیرۆیدات ناسراون بە هۆرمونەکانی توێکلی ڕژێنی سەر گورچیلە(Corticosteroids).[2] توانراوە ژمارەیەك لەو هۆرمونانە

1_ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 587.*
2_ *Kenneth. Principle of Endocrinology . P: 142..*

بدۆزرێتـــــەوە: یەکــــەمیان، ) گلوکوکورتیکویــــد(Glucocorticoids) ، وەك کورتیزۆل (Cortisol) کە دەستیان گرتووە بە سەر زیندەپالی کاربوهیدرات لە لەشدا بە کرداری دروستکردنی شەکری گلوکوز لە ماددەکانی نا کاربوهیدراتی وەك پرۆتین وپەیداکردنی ووزە بۆ ماوەیەکی درێژتر لە کاری ئیپینیفرین. دووەمیان، هۆرمونــە کــانزایی یــەکان(Mineralocorticoids) کــە دەســتیان بەســەر هاوسەنگی ئاوو خوێ لە لەشدا گرتووە، وەك ئەلدۆستیرون(Aldosterone) ، کە ڕژاندنی پەیوەستە بە ڕێژەی ئایۆنەکان لە ناو پلازمای خوێن ولە ژێرکاریگەری هۆرمونــەکانی جگــەرو گورچــیلە کاردەکــەن.[1] ســێیەمیان، ڕژانــدنی توخمــە هۆرمونە(الهرمونات الجنسية) بە ڕێژەیەکی کەم، لەوانە ئەندروجین لە هەردوو ڕەگەزی نێرومێ. لە نێرینە ئەندروجین بۆ تیستۆستیرون دەگۆردرێ کە بڕەکەی ڕۆژانە لە 100مایکرۆگرام کەمترە، بەلاّم جووتە گون ڕۆژانە 700مایکرۆگرام لەو هۆرمونە بەرهەم دەهێنێ.[2] لە ئافرەتان ڕژێنەی سەر گورچیلە 50٪ ی هەموو ئەو تیستۆستیرۆنە دەرژێنێ کە لە خوێنی مێینەدا هەیە، ڕۆژانە بە بڕو ڕێژەی دیاریکراوو نەگۆر دەرژێنرێ، بەرپرسە لە هەڵسانی ئارەزووی جنسی لە ئافرەتان. بڕێك لە ئەندروجین لە ئافرەتان دەگۆردرێ بۆ ئیستروجین بەتایبەتی کاتی گەیشتنە تەمەنی لە بێ نوێژی کەوتن. بەلاّم کاتێ ئافرەت نە گەیشتووتە تەمەنی لە بێ نوێژی کەوتن وهێلکەدان هەر لە کار ماوە، ئەوا ڕژێنەی سەر گورچیلە هیچ ڕۆلێکی نیە لە دروستکردنی ئیسترۆجین.[3]

لە کاتی گەیشتنە تەمەنی گەنجیەتی ئەو ستیرۆیدە جنسیانە بەرپرسن لە زۆربوونی مووی لەش و پەیدابوونی بۆنی تایبەتی لەش ودیارکەوتنی دەنکۆکەی گەنجیەتی(حب الشباب).[4]

---

*1— Leslie JD. Endocrinology. P : 2/1543-1557.*
*-Frances SG& Gordon J. Basic&Clinical Endocrinology. P:104,435.*
*2— Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 584.*
*3— Kenneth. Principle of Endocrinology P: 584.*
*4— Kenneth. Principle of Endocrinology P: 741.*

## برگەی دووەم : ڕژێنی دەرەقی وهاوسێ ی دەرەقی

### یەکەم : ڕژێنی دەرەقی ( الغدة الدرقية- The Thyroid Gland ).

ئەو ڕژێنە دەکەوێتە پێشی ملەوە، یەکسەر لە ژێر قورگدا، لە دوو پل پێك دێت کە بە پردێکی لکێنەر پێکەوە لکاون، بۆیە بە دیمەن لە پەپوولە دەچێت. هۆرمونی ماندەری دەرەقی کە لە ڕژێنەی ژێر مێشکەوە دەگاتە ناو ڕژێنەی دەرەقی بەهۆی خوێنەوە وا دەکات دوو هۆرمونی لە یەکچوو دروست بکات، یەکیان چوار مولیکیولی یۆدی تیایە (T4-Iodothyronine) ، ئەوی تریان سێ مولیکیولی یۆدی تیایە - (T3- Triiodothyronine) . بڕی هۆرمۆنی ماندەری دەرەقی لە ناو خوێن 1.4- 2.0 مایکروگرام/مل[3]. ڕێژەی ئەم هۆرمونە ناگۆڕێ لە نێرو مێ، لە گەنجی وپیریدا.[1]

هەندی لە خانەکانی ناو ڕژێنەی دەرەقی هۆرمونی کالسیتونین (Calcitonin) دەرژێنن بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی کالیسیومی ناو خوێن بۆ لەنگەر گرتنی.[2]

ئەرکەکانی ڕژێنەی دەرەقی تێکڕای زیندەپاڵ کردنی خۆراك ڕێك دەخات، کەوای لێ دەکات کارێکی ڕاستەوخۆ بکاتە سەر گەشەی گشتی وتایبەتمەندبوونی ئەندامەکانی لەش ودروست بوونیان. ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە زیاد بوونی بەکارهێنانی ئۆکسجین و کرداری زیندەچالاکی و بەخشینی ووزەو گەشەی جەستەیی وعەقلی و جنسی وپارێزگاری گەشەی پێستەو مووەکان دەکات وێکخەری پلەی گەرمای لەشە.[3]

---

*1– Frances S& Gordon J. Basic& Clinical Endocrinology. P: 192-213.*
*- Leslie JD. Endocrinology. P: 1/377, 1/505.*
*2– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 148.*

3 ـــ مفيد حنون، أساسيات علم وظائف الأعضاء، ص265.

**دووەم : ڕژێنەی هاوسێ ی دەرەقی (الغدد جارات الدرقیە The Parathyroid Glands).**

چوار دانەن، لە هەر لایەك دوو دانە، دەکەوێتە سەر ڕووی دەرەوەی ڕژێنەی دەرەقی وهۆرمونی هاوسی ی دەرەقی دەرژێنێ (PTH– Parathyroid) کە کرداری ڕێکخستنی ڕێژەی کالیسیوم وفوسفور دەکات، واتە پێچەوانەی هۆرمونی کالسیتونین کاردەکات، کە لە سەرەوە باسمان کرد.[1]

## بەندی سێیەم: توخمە هۆرمونەکانی نێرینەو مێینە

پێشتر وا باو بوو کەوا جیاوازی نێوان نێرینەو مێینە لە جیاوازی نێوان ئەو ژینگەی کە هەردوو ڕەگەز تیادا دەژین، ئەو باروەزخەی کەوا هەردوو رگەز پیایدا تێدەپەڕێت، یان لەو تاقیکرنەوەی کە ڕۆژانە هەردوو ڕەگەز ڕووبەڕووی دەبنەوە دروست دەبێت، بەلام پێشکەوتنی زانستی سەلماندی کەوا جیاوازی نێوان هۆرمونەکانی هەردوو ڕەگەز لە جۆرو بڕدا(النوعیة و الكمیة) کاریگەری تەواوی هەیە لە سەرهەردوو ڕەگەز لە سەرەتای ژیانی کۆرپەلەوە تاوەکو کۆتایی ژیان، لە گەشەی دەماخەوە تاوەکو گەشەی جەستەیی و دەروونی وبیرو سۆزو داهێنان.

هۆرمونە ستیرۆیدیەکان لە جووتە گون وهێلکەدان دروست دەبن وسێ جۆر لە ستیرۆیدات هەیە کە کار لە گەشە دەکەن وڕێکخەری سلوکی ئادەمیزادو سوری زاوزێن. ئەمانەش لە هەردوو ڕەگەز هەن بە بڕو ڕێژەی جیاواز وئەوانیش ئەمانەن: ئەندروجینەکان (Androgens ) وئیستروجین(Estrogens)وبرۆجیسترون (Progestins).

### بڕگەی یەکەم: توخمە هۆرمونەکانی نێرینە(الهرمونات الجنسیة للرجل).

هاندەرە هۆرمۆنی چیکڵدانەکان FSH. کە کونترۆلی دروستکردنی هێلکە دەکات، هاندەرە هۆرمۆنی زەردە تەن LH کە لە ڕژێنەی ژێر مێشکەوە دەڕژێن و

---

1 – *Gray AT& Kevin. Anatomy& Physiology. P: 505*
*Frances S& Gordon J. Basic& Clinical Endocrinology. P:286.*

کاردەکەنە سەر جووتە گون بۆ ڕژاندنی هۆرمونەکی سەرەکی کە ئەندروجینە، ئەویش لە کۆتاییدا دەبێتە تیستۆستیرون. لە تەمەنی کۆرپەلە ئەندروجین هۆکارە بۆ دیاریکردنی ڕەگەزی کۆرپەلە کە ببێتە نێر یان مێ هەروەك باسمان کرد، لە تەمەنی هەرزەکاریدا(Puberty ) هۆکاری گەشەی ئەندامەکانی زاوزێ ودەرکەوتنی سیفەتە دوەمی یەکانە لە نێرینەدا.[1]

هۆرمونی تیستۆستیرون هاندەرو بزوێنەری ئارەزووی جنسیە لە هەردوو ڕەگەزدا، بەڵام لە نێرینەدا بڕی ئەم هۆرمونە 10 جار زیاترە لەوەی مێینە. بڕەکەی لە نێرینە لە نێوان 3- 10.6 نانوگرام/مل3، لە مێینەدا تەنها 0.1- 0.9 نانوگرام/مل$^{3}$).[2]

گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەی ڕوو دەدات بەهۆی ڕژانی هۆرمونی تیستوستیرون:[3]

1- دەرکەوتنی سیفەتە دوەمی یەکان(لاوەکیەکان) لە تەمەنی پێگەیشتن- هەرزەکاریدا (البلوغ) وەك دەرکەوتنی ڕیش وسمێل، چڕی مووی لەش، گۆڕانی دەنگ بەرەو زبری.

2- هۆکاری سەرەکی یە لە گۆڕانکاری وپارێزگاری کردنی سیفەتە دوەمی یەکانی نێرینە.

3- ئاسانکردنی کرداری پرۆتین دروستکردن لە ناو ماسولکەکان، بەمەش بارستەی ماسولکەکان وهێزیان زیاد دەکات.

4- زیاد کردنی توانای ماسولکەکان لەسەر داکردنی شەکری گلایکوجین بۆ کاتی پێویست، وەك(وەرزش وکاری قورس).

*1- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 155, 938.*

*2- Rital A & Others (1996). Hilgard introduction to Psychology. P: 364.*

*3- Gray AT& Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 51 4.*

*- Leslie JD. Endocrinology. P: 1/296 , 3/2132.*

*-Frances S& Gordon J. Basic& Clinical Endocrinology. P: 405,414.*

*-John WH, JR Human Anatomy&Physiology. P: 816.*

5- زیاد کردنی ژمارەی خڕۆکە سوورەکان، بەمەش توانای هەڵگرتنی ئۆکسجین لە ناو خوێن زیاد دەبێت.

ئەم سێ گۆڕانکاریانەی دوایی کاریگەری ئیجابی (پۆزەتیف)یان هەیە لەسەر توانای بەردەوام بوون لە سەر کاری جەستەیی قورس وچالاکی وەرزشی جۆراوجۆر. هەربۆیە نێرینە زیاتر گونجاوە بۆ کاری سەربازی وڕووبەڕوو بوونەوەو کاری قورس و وەرزشی توندو تیژو بەردەوام.

6- بە هاوکاریFSH لێپرسراوە بەرامبەر دروست کردن وبەردەوامی هێنانە بەرهەمی تۆوی نێرینە.

7- هۆکارە بۆ گەورە بوونی نێرە ئەندامی زاوزێ وپرۆستات وتۆواوە چیکڵدانە.

هۆرمونی نێرینە تیستۆستیرۆن ڕێژەکەی نەگۆڕە و گۆڕانکاری کورتی کاتی و جۆرا و جۆری بەسەرنایەت هەروەك لە مێینەدا دەیبینین، بۆیە کاریگەری ئەو هۆرمونە و توخمە هۆرمونەکانی تر زۆرە لەسەر پێکهاتەی جەستەیی و دەرونی ڕەگەزی نێرینە،ئەمەش وای کردووە کەوا نێرینە زیاتربەرەو سیفەتەکانی دژایەتی و بەربەرەکانی و چوونە پێش و ڕووبەڕوو بوونە بچێت و زیاتر ئارەزووی بەرەو لای جولانەوەو وەرزش و ململانێ پێش برکێ بڕوات. هەر ئەمەشە وای کردووە نێرینە کارەکانی بەردەوامتر بێ متمانەی بەخۆی بێ و زیاتر پشت بەخۆی ببەستێ.

### بڕگەی دووەم : توخمە هۆرمونەکانی مێینە(الهرمونات الجنسية للمرأة).

#### یەکەم : هۆرمونەکانی هێلکەدان(هرمونات المبيض)

هاندەرە هۆرمۆنی چیکڵدانەکان FSH . کە کونترۆڵی دروستکردنی هێلکە دەکات و هاندەرە هۆرمۆنی زەردە تەنLH کە هەردووکیان لە ڕژێنەی ژێر مێشکەوە دەڕژێن و کاردەکەنە سەر جووتە هێلکەدان بۆ ڕژاندنی هۆرمونەکی

سەرەکی کە ئیستریولە، ئەویش لە کۆتاییدا دەبێتە ئیستڕۆجین وپڕۆجستیرون، ئەمانەش لێپرسراون لە گەشەو پاریزگاری کۆئەندامی زاوزێی مێینەو گەشەی چیکڵدانەی گرافیان ودەرهاویشتنی هێلکە.[1]

1 - ئیستروجین

* لەتەمەنی منالیدا: لە سالی هەشتەمەوە ئاستی ئەم هۆرمونە دەست بە بەرز بوونەوە دەکات بەهۆی ماندانی هێلکەدانەوە لەلایەن ڕژێنی ژێرچوارپای بینین. لەتەمەنی 11-12 سالیدا بڕی ئەو ئیستروجینەی کەی هەردوو هێلکەدان دەیڕژێنن دەگاتە ئاستێکی بەرزو دەبێتە هۆکاری گەورەبوونی مەمکەکان ودروست بوونی کرداری بێ نوێژی.

* لە سووڕی مانگانەدا ئاستی ئیستروجین هەر لە بەرزبووندایە تا ماوەی 21 ڕۆژ چونکە ئەو هۆرمونە هۆرمونی پارێزەری هێلکەیە، ئافرەت لە ژێر کاریگەری ئەو هۆرمونە لەو ماوەیەدا هەست بە ئاسوودەیی وخۆشی ژیان و خۆشەویستی، هیوای دوارۆژی ڕوون، گەشبین بەرامبەر بە ژیان دەکات، چونکە ئەو هۆرمونە کاری هێمن کەرەوەی هەیە لەسەر دەرونی مرۆڤ(المهدء للأعصاب). گەر پیتێن نەبوو ئەوا ئاستی ئەو هۆرمونە دادەبەزێ وئافرەت باری جەستەیی ودەرونی بە پێچەوانە دەگۆرێ.

* لە کاتی سك پڕی و دووگیانیدا : ئەو هۆرمونە پاش پیتێنی هێلکە بە 6-8 ڕۆژ ئاستی بەرز دەبێتەوە، دەگاتە بەرزترین ئاست پاش تیپەڕ بوونی 60-90 بە سەر سك پڕیدا. دوای ئەم ماوەیە لە ڕۆژی 120 تاوەکو کۆتایی سك پڕی ئاستی ئەم هۆرمونە لە دابەزیندا دەبێت. سەرچاوەکانی ئەم هۆرمونە: لە سووڕی مانگانە لە هێکەدانەوە دروست دەبێت، لە دوای پیتێن وسەرەتای سك پڕی لە زەردە

1 – *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 155.*

تەنەوە دروست دەبێت، لەو دوای بەرەو پێشەوە چوونی سك پڕی ودروست بوونی وێلاش، ئەو هۆرمونە لە وێلاش و هێلکەدانەوە دروست دەبێت.

کەواتە هۆرمونی مێینە بەدەوام لە گۆڕانکاری دایە ولەبەرزی ونزمی دایە بەدرێژایی ژیانی مێینە. لەکاتی دروست بوونی چیکڵدانەی گرافیان ئاستی ئەو هۆرمونە لە خوێن دەگاتە 50-60 بیکوگرام/مل[3]، لە کۆتایی قۆناغەکانی زەردە تەن ئاستی دەگاتە 250-400 بیکوغرام/مل[3]، لە تەمەنی لەبێ نوێژی کەوتن دەگاتە نزمترین ئاست.

**کارەکانی ئەم هۆرمونە:**

* گەشەی ئەندامەکانی زاوزێی مێینەو گەشەی توخمە گلاندەکان.
* ئامادەکردنی دیواری ناوەوەی منداڵدان بۆ گەری سك پڕی.
* دەرکەوتنی سیفەتە دوەمی یەکانی مێینە وەك دەرکەوتنی مووی بن باڵ و خوارەوەی سك و نەبوونی لە شوێنەکانی تر و بچووك بوونەوەی قورگ وناسك بوونی دەنگ.
* دەرکەوتن وبەرزبوونەوەی مەمکەکان، فراوان بوونی حەوزو کلوت، باریکی سەر شانەکان (الكتف).[1]

**2- پرۆجیسترون**

لە نیوەی دووەمی سوڕی مانگانە ئەو هۆرمونە لە هێلکەدانەوە بۆ ناوخوێن دەڕژێت و پێ ی دەڵێن: هۆرمونی سك پڕی(هورمون الحمل)، لەو کاتەدا ئافرەت هەست بە ئاسوودەیەکی جەستەیی و دەروونی دەکات. لە نزیکەی ڕۆژی چواردەم هۆرمونی تیستۆستیرون دەگاتە بەرزترین ئاستی لە ناو خوێن بە تایبەتی کاتی هاتنەخوارەوەی هێلکە بۆ ناو منداڵدان وئافرەت هەست بە ئارەزوویەکی زۆری جنسی دەکات.

1_ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 786.*

پێش پێگەیشتنی هێلکە و هاتنە خوارەوەی، دەبینین ئاستی پرۆجیسترون لە ناو خوێن زۆر کەمە 0.25 -0.54 نانوگرام/مل$^3$، کاتی دروست بوونی زەردە تەن ئاستی دەگاتە 5-25 نانوگرام/مل$^3$، دوایی ئەگەر پیتێن نەبوو ئاستی ئەو هۆرمونە زۆر بەخێرایی دادەبەزێت وئەگەر پیتێن ڕوویدا ئەوا زەردە تەن سەرچاوەی سەرەکی ئەو هۆرمونە دەبێت تاوەکو 6-8 هەفتەی یەکەمی سك پڕی، لە پاشان وێڵاش شوێنی زەردە تەن دەگرێت وئاستی بەرز دەبێتەوەو دەگاتە 40 نانوگرام/ مل$^3$.[1] لەتەمەنی لەبێ نوێژی کەوتن ئاستی ئەو هۆرمونەش دەگاتە نزمترین ئاست و کەمتر لە ئاستی سروشتی خۆی.

**ئەو هۆرمونە ئەم ئەرکانە ئەنجام دەدات:**

* گەشەی گلاندەکانی شیر زیاد دەکات.
* لە گەڵ ئیستروجین هەردوو کرداری بێ نوێژی وسك پڕی ڕێکدەخەن.
* هاندەرە بۆ دروست بوونی وێڵاش لە کاتی سك پڕی.
* کاتی سك پڕی، کرداری هێلکە پێگەیاندن و دەرهاویشتنی ڕادەگرێت، تاوەکو نەبێتە سك پڕی یەك لە دوای یەك. هەر بۆیە کاتی سك پڕی گەر جووتبوونیش هەبێ لە نێوان هەردوو هاوسەر هەرگیز پیتێنەکی تر ڕوونادات.
* کەمێك پلەی گەرمی لەش بەرز دەکاتەوەو یەکسەر کاتی هاتنە خوارەوەی هێلکە لە هیلکەدانەوە.
* ئامادە کردنی دیواری ناوەوەی منداڵدان بۆ پێشوازی کردنی هێلکەی پیتێنراو، گونجاندنی بارێکی لەبار بۆ بەردەوام بوونی کرداری سك پڕی، وەك خاو کردنەوەی ماسولکەکانی منداڵدان بە گوێرەی گەشەی کۆرپەلە.[2]

---

*1_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 787.*

2_ مفيد حنون، أساسيات علم وظائف الأعضاء ، ص306.

*- Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 513.*
*- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 787.*

3- ئەندرۆجین

ئەندروجین لە مێینەدا نیوەی لە هێلکەدانەوە دێت و، نیوەکەی تری لە ڕژێنەی سەر گورچیلە گلاندەکانی پێستە دەرژێنریٚ بۆ ناوخوێن. ئەو هۆرمۆنەش بۆ دوو بەشی سەرەکی دەگۆردریٚ: بەشە زۆرەکەی بۆ تیستۆستیرون دەگۆڕدریٚ و چڕیەکەی لە خوێن دەگاتە 19-70 نانوگرام/100مل[3] ، بەشە کەمەکەشی بۆ (ئیندروستینیدیون وئەدیون) دەگۆردریٚ وچڕیەکەیان لە خوێن دەگاتە 40-240 نانو غرام/100مل[3].[1]

ئەندروجینەکان لێپرسراوی سەرەکین لە هەڵچوونی ئارەزووی جنسی لە مێینەداو چالاکی جنسی بەرقەرار دەکات کاتی هاتنە خوارەوەی هێلکەو پیتێن، کاریگەری ئەو هۆرمونە لە سەر چالاکی جینسی هەر دەمێنیٚ تاوەکو تەمەنی لە بیٚ نوێژی کەوتن، چونکە نیوەی ئەو هۆرمونە لە ڕژێنەی سەر گورچیلە دێت وکاری خۆی دەکات لە سەر چالاکی جنسی تاوەکو تەمەنی پیری، وەك هێلکەدان نیە پاش 45 سالٚ لەکار بکەوێت.[2]

4- ڕیلاکسین:

ئەو هۆرمونە لە پیاوان بە برێکی زۆر کەم هەیە، هەروەها لەو ئافرەتانەش کە سك پڕیان نیە ئەو هۆرمونە لە زەردە تەنەوە دروست دەبێت لەسەرەتاوە، دوایی لە وێلاش پاش چەند هەفتەیەك لە گەشەی کۆرپەلە. فەرمانەکانی ئەم هۆرمونە:

* ئەو هۆرمونە هەروەك لە ناوەکەی دیارە(ڕیلاکس- واتە خاوبوونەوەو کشان) هۆکارەکی گرنگە لە فراوانکردنی بۆشایی ناو منداڵدان ونەهێشتنی کرژبوونەوەی ماسولکەکانی منداڵدان تاوەکو کۆرپەلە بتوانیٚ بەبیٚ گیروگرفت تیایدا گەشە بکات.

* هاوکارە بۆ گەشەی مەمکەکان وبەرهەم هێنانی شیر لە ئافرەتی سك پڕ.

1- *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 786, 835.*
2- *Stuart C& Ash M. Gyaecology by ten teachers. P: 39.*

* لە کاتی منداڵبوون هاوکار بۆ خاوبوونەوەی ماسولکەکانی ملی منداڵدان و ناوچەی مەسلدانە بۆ ئاسانکردنی کرداری منداڵبوون.[1]

بڕی ئەو هۆرمونە دەگاتە بەرزترین ئاستی لە سێ مانگی یەکەمی سک پڕی، لەناو خوێن دەمێنێ بەدرێژایی مانگەکانی سک پڕی ودوای منداڵبوون بە سێ ڕۆژ بەیەکجاری وون دەبێت و نامێنێ.[2]

## دووەم: هۆرمونەکانی وێلاش( هرمونات المشیمة- Placental hormones )

1- ئیسترۆجین . لە پێشەوە باسمان کرد.

2- (هرمون القند HCG-Human chorion gonadotropin) : پاش 6- 8 ڕۆژ لە پیتێنی هێلکە وهەڵواسرانی بە دیواری منداڵدانەوە ئەو هۆرمونە دەرژێنرێ و ئاستی زیاد دەکات ودەگاتە لوتکەی بەرزی لە 60- 90 ڕۆژی سک پڕی، لە 120 ڕۆژدا دەست بە دابەزین دەکات وبەردەوام دەبێت لەو دابەزینە تاوەکو کۆتایی سک پڕی.[3] ئەو هۆرمونە کاردەکاتە سەر زەردە تەن تاوەکو بەردەوام بێت لەسەر بەرهەم هێنانی پروجیسترون، کە ئەویش بەرگری لە بەرهەم هێنانی هاندەری هێلکە FSH دەکات تاوەکو کرداری هێلکە دروست بوون ڕابگرێ لە هێلکەدانەکان بە درێژایی مانگەکانی سک پڕی.[4]

هەروەك باسمان کرد ئەو هۆرمونەیە پاش پیتێن بە 6-8 ڕۆژ لە ناو خوێن دیاردەکەوێت، دوو ڕۆژ دواتر لەگەڵ میزدا دەردەهاویشترێ، هەربۆیەش پزیشکان، ئەو ئافرەتانەی گومانی سک پڕیان لێدەکرێت دەنێرن بۆ تاقیگە بۆ ئەزمایشتی میز،

---

1ـ مفید حنون ، أساسیات علم وظائف الأعضاء ، ص307.
- *Leslie JD. Endocrinology . P: 3/2043.*
-*Sheldon HC (1991). Complication of Pregnancy. P: 923.*
*2ـ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 788.*

3ـ دیارکەوتنی ئەو هۆرمونە لەناو میز بەڵگەیە لەسەر بوونی سک پڕی، سوود لەو خاڵە وەردەگرین کاتی باس کردنی لەبارچوون.

*4ـ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 888.*

گەر ئەو هۆرمونە هەبوو لە ناو میز، مانای ئەوەیە پیتێن ڕوویداوەو ئافرەتەکە سکی پڕە، گەر ئەو هۆرمونە نەبوو واتە پیتێن نەبووە هەرچەندە گەر ئافرەتەکە بێ نوێژی نەشووشتبێ(واتە عادەی نوێی نەبووە).

**سێیەم: برۆلاکتین**(Prolactin hormone) **لە پێشەوە باسمان کرد.**

**برگەی سێیەم: هۆرمونە هاوبەشەکانی نێوان هەردوو رەگەز (الهرمونات المشترکة بین الجنسین)**

هەر هەمان ئەو هۆرمونانەن کە لە پێشەوە باسمان کردن، بەلام سەرچاوەو شوێنی دروستکردنیان جیاوازە، هەروەها برو ڕێژەیان زۆر جیاوازە لە نێرینەو مێینە.

**یەکەم: توخمە هۆرمونەکانی توێکلی ڕژێنەی سەر گورچیلە**

**1- ئەندروجین:**

ئەو هۆرمونە بە هۆرمونەێکی نێرینە دادەنرێت ودەگۆردرێ بۆ تیستۆستیرون. جووتە گون ڕێژەی 90٪ی هۆرمونی تیستۆستیرون دروست دەکات و ڕێژەکەی 10٪ کەی تریش لە ڕژێنەی سەر گورچیلەوە دروست دەبێت. هەندێك ئەندرۆجین لە نێرینە دەگۆردرێ بۆ ئیستروجین، بەلام لە ئافرەتان ڕێژەی50٪ ی ئەندروجین لە ڕژێنەی سەر گورچیلەوە دروست دەبێت و دەگۆردرێ بۆ تیستۆستیرون( کە بەرپرسی سەرەکی ئارەزووی جنسی مێینەیەو دەرژێ تاوەکو کۆتایی ژیانی مێینەو پەیوەندیەکی زۆر کەمی بە کۆئەندامی زاوزێ وە هەیە). بە کورتی فەرمانەکانی:

* پارێزگاری سیفەتە دوەمیەکانی نێرینە دەکات.
* جێگیری گەشەی جینسی یە لە تەمەنی منالی.
* کۆنترۆلی دروستکردنی پروتینی لەش دەکات.
* بەرپرسی سەرەکی ئارەزووی جنسی مێینەیە تاوەکو کۆتایی ژیانی(پاش گۆڕانی بۆ تیستۆستیرون).[1]

---

*1_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 938.*

2 - ئیستروجین وپرۆجیسترۆن

هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد کەوا دروستکردن وپژاندنی ئیستروجینەکان وئەندروجینەکان کەوتۆتە ژێر کۆنترۆلی هەردوو ماندەری زاوزێ (Gonadotropins)کە بریتین لە FSH و LH کە لە پلی پێشەوەی پژێنەی ژێر مێشکەوە دەرژێن. جووتە گون برێك لە ئیستروجین دروست دەکات، رۆژانە دەگاتە 10-15 مایکروگرام.[1]

3-ریلاکسین:

لە نێرینە بە رێژەیەکی زۆر کەم هەیە وهاوکاری جوولەی سپێرم دەدات.[2]

دووەم : رژێنەی پایموسی (الغدة الزعترية-The Thymus Gland )

ئەو رژێنەیە دەکەوێتە لای سەرەوەو پێشەوەی ناو بۆشایی سنگ. دەگاتە لوتکەی گەشەی تاوەکو ساڵی سێیەمی تەمەنی منداڵی، پاشان دەست بە پوکانەوە دەکات لە تەمەنی هەرزەکاریدا.[3]

ئەو رژێنە ژمارەیەك لە هۆرمونات دەردەدات لە گرنگترینیان هۆرمونی ثیموسینە (Thymossin) کە هاوکاری گەشەو جیاکاری خرۆکە سپیەکانە لە جۆری لیمفە خانە (T cells)، ئەوە هاوکاری کۆئەندامی بەرگری لەش دەکات.[4]

سێیەم : رژێنەی سنۆبەری(الغدة الصنوبرية- The Pineal gland)

بریتیە لە بارستە شانەیەك لە نزیك ناوەراستی دەماخ، لوتکەی گەشەی تاوەکو 7 ساڵیەو لەدواییدا بەرەو پوکانەوە دەڕوات. کاتێ کە گلاندەکانی زاوزێ دەبڕدرێن دەبینین ئەو رژێنەیە دەست بە ئاوسان دەکات، بۆیە وا گومان دەبردرێت کەوا

1_ Kenneth . Principle of Endocrinology. P: 938.
2_ Kenneth . Principle of Endocrinology . P: 988.
3_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1351,1559.
4_ Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 514.

پەیوەندی هەبێ لەگەل گلاندەکانی زاوزێ.[1]

پاش ئەوەی باسێکی تێروتەسەلمان کرد دەربارەی هۆرمونەکان وکارەکانیان و کاریگەریان لە سەر لەش وگەشەو ئارەزوو وزاوزێی ئادەمیزاد بە هەردوو رەگەزیەوە، بۆمان دەرکەوت کەوا ئادەمیزاد بریتیە لە هاوکێشەیەکی هۆرمونی و هەموو چالاکیەکانی جەستەیی ودەروونی ئەو بارستە گەورەیە کە ئادەمیزادە لە ژێر کاریگەرو کونترولی برێکی کەم وڕێژەیەکی دیاری کراوی ئەو هۆرمونانەیە هەر لە سەرەتای ژیانی کۆرپەلەوە تاوەکو تەمەنی منالی وهەرزەکاری وتەمەنی زاوزێ و پیری. لە بواری جینسی وزاوزێ ومندالبوون، کاریگەریان زۆر روون وبەرچاوە، کاریگەریان لەسەر سیفاتە دەرونیەکان وپێکهاتەی کەسایەتی، وەك: جورئەت و هەڵچوون ودژایەتی و دەمارگیری وبەرەنگاربوونەوەو داهێنان وبڕیاردان زۆر دیارەو شاردنەوەی بۆ نیە، هەروەها کاریگەریان لەسەر تووش بوون بە نەخۆشی جەستەیی ودەرونی بەهۆی کەمی وەیان زۆری ڕێژەی یەکێك وەیان هەندێك لەو هۆرمونانە زۆر زەق وبەرچاوە، هەروەك لە بەشەکانی داهاتوودا باسی هەندێکیان دەکەین.

---

*1_Leslie JD. Endocrinology. P: 1/240.*
*- John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 491.*
*- Frances SG & Gordon J. Basic& Clinical Endocrinology. P: 13.*

# باسی سێیەم

## جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە تەمەنی کۆرپەلەو منداڵی و هەرزەکاری و تەمەنی زاوزێ و وپیری و وکاریگەری ژینگە لەسەر پێگەیشتن وهۆکارەکانی مردن

بەندی یەکەم: جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە تەمەنی کۆرپەلەو دوای لەدایکبوون

بەندی دووەم: پێگەیشتن وکاریگەرو ڕۆڵی هۆرمونەکان

بڕگەی یەکەم: مانای پێگەیشتوو لە لایەنی پزیشکیەوە

بڕگەی دووەم: گۆرانکاریە جەستەیی ودەرونیەکانی تەمەنی پێگەیشتن

بڕگەی سێیەم: کاریگەری ژینگە لەسەر پێگەیشتن وهەرزەکار.

بەندی سێیەم: جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە تەمەنی هەرزەکاری و زاوزێ

بەندی چوارەم: جیاوازی لە هۆکارەکانی مردن لە نێوان هەردوو ڕەگەز.

بڕگەی یەکەم : ڕێژەی هۆکارەکانی توش بوون بە نەخۆشیە درێژ خایەنەکان و نەخۆشیە درێژ خایەنەکان لە هەردوو ڕەگەزو جیاوازیان

بڕگەی دووەم: هەردوو ڕەگەزو جیاوازی مردن.

بڕگەی سێیەم: ڕەگەزی نێرینە وهۆکاری مردنی زیاد

## بەنـدی یەکـەم: جیـاوازی نێـوان هـەردوو ڕەگـەز لـە تەمـەنی کۆرپەلـەو دوای لەدایکبوون

پاش ئەوەی کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا دەگاتە تەمەنی 10 هەفتە ئاستی هۆرمونەکانی ماندەری چیکڵدانەو ماندەری زەردە تەن زیاد دەکەن لە ناو خوێن و هانی گەشەی کۆئەندامی زاوزێی کۆرپەلە دەدەن.[1]

لە تەمەنی کۆرپەلە ئاستی هۆرمونی ئیستروجین لە هەردوو ڕەگەز یەکسانە بەڵام ئاستی هۆرمونی تیستۆستیرون لە کۆرپەلەی نێرینە زیاترە لە مێینە. کەواتە هۆرمونی تیستۆستیرون زۆر پێویستە بۆ جیاکردنەوەی نێرینە، لەبەرامبەر ئەوەش هۆرمونەکانی هێلکەدان (واتە مێینە) زەروری نیە بۆ جیاکردنەوەی مێینە. هەروەك باسمان کرد کەوا هۆرمونی نێرینە (تیستۆستیرون) جۆری ڕەگەز دیاری دەکات.

لە هەموو تەمەنی کۆرپەلەدا ئاستی هۆرمونی ماندەری چیکڵدانە FSH لە کۆرپەلەی مێیە زیاترە لە کۆرپەلەی نێرە، هەروەها بە هەمان شێوە لە گشت سالانی تەمەنی منداڵیدا. لە دوای لە دایکبوون بە چەند هەفتەیەك ئاستی هەردوو هۆرمونی LH, FSH زۆر بەرز دەبێتەوە، بە ڕێژەیەك لە هەموو تەمەنی منالیدا ناگاتە ئەو ئاستە. هەردەم ئاستی ئەو دوو هۆرمونە لە منداڵی مێینە بەرزترە لە منالی نێرینە، بۆیە زووتر گەشە دەکات وبالغ دەبێت.[2]

1- کۆرپەلەی نێرینە ماوەی 3- 5 ڕۆژ زیاتر دەمێنێتەوە لەناو سکی دایکیدا لە کۆرپەلەی مێینە. دوای لە دایکبوون کۆرپەی نێرینە زووتر گەشە دەکات تاوەکو 7 مانگی یەکەم، پاشان مێینە زووترو زیاتر گەشە دەکات تاوەکو کۆتایی ساڵی چوارەمی تەمەن.[3]

---

*1– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 741.*

*2– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 80, 741.*

3– الدكتورة سهام أحمد النجار، 55 سنة، أخصائية بأمراض النسائية والتوليد، مديرة مستشفى الولادة والأطفال/ أربيل، مستشفى الولادة والأطفال، بتاريخ:2004/8/4م. (تاوەکو خشتەکە گەورەنەبێ تەنها سەر ژمێری دوو مانگ وەرگیراوە)

2- ڕێژەی لە دایکبوونی کۆرپەی نێرینە بە 5٪ زیاترە لە مێینە، بەڵام ڕێژەکە یەکسان دەبێت کاتی گەیشتنە تەمەنی هەرزەکاری. ئەو ڕێژە زیادەیە باوە لە زۆربەی کۆمەڵگەکان، بەوەی بەرامبەر هەر100 مێینە 105 نێرینە لەدایك دەبێت، ئەوەش واتای ئەوەیە کەوا توانای پیتێنی سپێرمی هەڵگری کرۆموسومی نیشانەy زیاترە لە توانای کرۆموسومی نیشانە[1] x.

بە پێ ی سەرژمێری ساڵی 2004 لە نەخۆشخانەی لە دایکبوون لە شاری هەولێر بۆ ئەو منداڵانەی بە خۆیان لە دایك بوون، یان بە هۆی نەشتەرگەری، دەرکەوت کۆرپەی نێرینە ژمارەیان زیاترە.

خشتەی ژمارە 1: جیاوازی نێوان ژمارەی کۆرپەی نێرو مێ

| مانگ | جۆری منداڵبوون | نێرینە | مێینە |
|---|---|---|---|
| مایس | بە سروشتی خۆی | 534 | 566 |
| | بە نەشتەرگەری | 203 | 122 |
| حزیران | بە سروشتی خۆی | 639 | 630 |
| | بە نەشتەرگەری | 200 | 141 |
| کۆی گشتی | | 1576 | 1469 |

لە خشتەکەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا ژمارەی نێرینە 1576 بەرامبەر 1469 مێینە بووە ، کە دەکاتە ڕێژەی 6٪ ی نێرینە زیاترە لە مێینە. [2]

1 ــ أحمد كنعان، موسوعة الجسم البشري، ص31. والقصاب، عبد اللطيف ياسين، ص61-62.

2ــ كزال شاكر قادر، 32 سنة، معاونة طبية، معاونة رئيس قسم الإحصاء في مستشفى الولادة والأطفال في محافظة أربيل، مكان المقابلة: مستشفى الولادة والأطفال، بتاريخ: 2004/8/4م.

3- ڕێژەی مردنی نێرینە زیاترە لە مێینە لە هەموو قۆناغەکانی ژیان پاش تەمەنی پێگەیشتن ، دەگاتە 1/2 بۆیە دەبینین ژمارەی مێینە زیاترە لە نێرینە لە هەموو کۆمەڵگەکان بەبێ هەڵاوێران ( بدون استثناء).

4- کاتی لە دایکبوون، نێرینە درێژ ترە لە مێینە بە 5- 10 سم و کێشەکەشی 100- 150 گرامی زیاترە، ئەم جیاوازیە دەمینێ تاوەکو کۆتایی ژیان، بەوەی نێرینە درێژترو قورس ترن لە مێینە.[1]

لە نەخۆشخانەی لەدایکبوون لە هەولێر جیاوازی نێوان کۆرپەی نێرو مێیەیان نەبوو لە بواری درێژیدا، بەڵام لە کێشدا لەدایکبووی نێرینە 200-400 گرامی لە مێینە زیاتر بوو لە ناو راپۆرتەکانی ساڵی 2004.[2]

5- لە کۆرپەی تازە لە دایکبوو بڕی چەوری لە مێینە زیاترە لە نێرینە بەتایبەتی ناوچەی حەوزو ژێر پێستە، هەروەها ئەو جیاوازیە بەدی دەکرێت لەتەمەنی هەرزەکاری وپێگەیشتوودا، چونکە نێرینە ڕێژەیەك چەوری وون دەکات لە تەمەنی پێگەیشتندا، بەڵام لەلایەکی ترەوە بارستەی ماسولکەکانی گەورەتر دەبێ، بەمەش بەشێوەیەکی گشتی کێشی نێرینە لە مێینە زیاترە لەو تەمەنە.[3]

6- پەیوەندی نێوان هۆرمونەکانی دایك وکۆرپەلەی مێینە توندە، هەر ئەوەشە وای کردووە کە ڕێژەی مردنی کۆرپەلە لە ناو منداڵدان، تووش بوون بە نەخۆشیە زگماکەکان و مردنی دوای لە دایکبوون هەموویان لە مێینە کەمتر بێ، بە بەراورد لەگەڵ نێرینە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەی لەدایکبوونی نێرینە زیاترە لە مێینە هەروەك باسمان کرد.[4]

7- هەروەك باسمان کرد لە چەند شوێنی جیاجیا، کەوا توانای ووزە بەرهەم هێنان وچالاکی لە نێرینە بەرزترە هەر لەتەمەنی منداڵیەوە تاوەکو پیری، لەبەر جیاوازی نێوان دڵ وسیەکان وخوێن، هەروەها کاریگەری هۆرمونی نێرینە کە

---

1ـ أحمد كنعان، موسوعة الجسم البشري، ص31. والقصاب، الفروق بين الذكر والأنثى، ص146.

2ـ جيمن عثمان ، مسؤولة قسم الخدج في مستشفى الولادة والأطفال، بتاريخ: 2004/8/4م.

3ـ القصاب، الفروق بين الذكر والأنثى، ص146.

*4 – Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1017.*

تیستۆستیرۆنە. ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە دەبینین مێینە زووتر ددان دەردەکات وئێسکانەکانی زووتر گەشە دەکەن، زووتر دەتوانن دانیشن وگاگۆلە بکەن، تاوەکو هەرچی زووترە بگەنە تەمەنی زاوزێ، چونکە بەهەر شێوەیەك بێت لە 45- 50 تێپەڕ نادات.[1]

بەم شێوەیە دەبینین لە ڕووی جەستەیی یەوە نێرینەو مێینە جیاوازن لە قۆناغە جیاجیاکانی تەمەن، هەروەك لەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆکردووە لەسەر زاری دایکی مەریەم خوایان لێ ڕازی بێت، خوای گەورە دەفەرموویێ:﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾ آل عمران: 36.

## بەندی دووەم: پێگەیشتن (البلوغ- Puberty) و کاریگەرو ڕۆڵی هۆرمۆنەکان.

ژمارەیەکی زۆر لە گۆرانکاری فسیولوژی ڕوودەدات کاتی گەیشتن بە تەمەنی پێگەیشتن بەتایبەتی لە تەوەری ڕژێنەی ژێرپای بینین وڕژێنەی ژێر مێشك و ڕژێنەکانی زاوزێ(جووتە گون لە نێرینەو هێلکەدان لە مێینە). کرداری گەشەی ئەو تەوەرە هۆرمونیە لە سەرەتای ژیانی کۆرپەلەوە دەست پێدەکات وپێگەیشتن بە قۆناغی کۆتایی یەکەی دادەنرێ، ئەو قۆناغە نزیکەی 2- 4 ساڵی دەخایەنێت تاوەکو ئەو ژمارە هۆرمونە کاری خۆیان بکەن وبگەنە ئەنجامی سەرەکیان کە بریتیە لە گەشەو پێگەیاندنی هۆکارەکانی زاوزێ وسیفەتە دووەمیەکان وگۆرانکاریە جەستەیی و دەروونیەکانی هەردوو ڕەگەزە.

### برگەی یەکەم: مانای پێگەیشتن لە ڕوانگەی پزیشکی وشەرعی

پێگەیشتن لە ڕووی زمانەوە: بلغُ: گەیشتن بە شتێك: گەیشتن وکۆتای هاتن. پێگەیشتنی هەرزەکار: واتە گەیشتە کاتی توانای زاوزێ وکاتی ئەرك (التكليف) کەوتنە سەرو جێبەجێ کردنی.[2]

---

1ـ القصاب، الفروق بين الذكر والأنثى، ص147-148.
2ـ ابن منظور، لسان العرب، 486/1.

**یەکەم: پێگەیشتن و ئاستەکەی لە ڕوانگەی شەرعیەوە**

1- شافعیەکان[1] وحەنبەلیەکان[2] پێگەیشتن لە نێرینە بەوە دیاری دەکەن بە هاتنە خوارەوەی تۆوی شەوانە(الإحتلام) ودەرکەوتنی مووی زبر لە ناوچەی موسلدانە، لە مێینە هاتنە خوارەوەی ئاوی شەوانەو کەوتنە بێ نوێژی وتوانای سك پڕی.[3] بەڵام حەنەفی[4] ومالکیەکان[5] تەمەنی پێگەیشتن بە 17 ساڵ بۆ مێینەو 18 ساڵیش بۆ نێرینە، لەگەڵ بوونی مەرجەکانی سەرەوە دادەنێن.[6]

دکتۆر کامل موسی دەڵێ: لە لای زۆربەی زانایان، ڕای سەرجەمی زانایانیان پێ تەواوە کە دەڵێت ئەو پێگەیشتنەی کەوا حوکمی شەرعی دەکەوێتە سەر(البلوغ الحکمی) بریتیە لە 15 ساڵ بۆ هەردوو ڕەگەز، ئەو تەقدیرە کراوە لەو کاتەیدا کەوا پێگەیشتنی سروشتی وسیفەتە دووەمیەکان هەست پێنەکرێت. پێگەیشتنی سروشتی لە نێرینە بریتیە لە هاتنە خوارەوەی تۆوی شەوانە و، دەرکەوتنی مووی

---

1ـ الشافعي: ئەبو عەبدولا، موحەمەد کوڕی ئیدریسی المطلبي، لە گەورە زانایانی ئیسلامە، لە ساڵی 150ك لەغەززە لە دایك بووە، لە زۆر زانستدا بلیمەت و شارەزایی هەبووە، کتابی زۆری هەیە، لە میسر کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی 204ك . الذهبي، سير أعلام النبلاء ،5/10. والزركلي، الأعلام، 26/6.

2ـ أحمد بن حنبل: ئەبو عەبدولا، ئەحمەد کوڕی حەنبەلی شەیبانیە، لە ساڵی 164ك لە دایك بووە، پشگیری سونەتی کردووەو دژی بیدعە بووە، ئازاری گرت لەسەر بەند کردن ولێدان، کتابی زۆرە، لە ساڵی 241ك کۆچی دوایی کردووە. الذهبي، سير أعلام النبلاء ،177/11.

3ـ المقدسي، ابن قدامة، المغني، 166/2. والحنبلي، كشاف القناع عن متن الإقناع، 432/3. والفيروزآبادي، المهذب في الفقه الشافعي، 330/1.

4ـأبو حنيفة: نوعمان کوڕی ثابتی کوفیە، ئیمامی مەزهەبی حەنەفیە، موجتەهید وفەقیە بوو، لە کوفە گەشەی کردووە، قەزای وەرنەگرتووە، کتابی زۆرە، لە ساڵی 150ك لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە . الذهبي، سير أعلام النبلاء، 390/6.

5ـ مالك بن أنس بن مالك الأصبحي: لە ساڵی 92ك لە مەدینە لە دایك بووە، ئیمامی مەزهەبی مالکیە، کتابی زۆرە، لە ساڵی 179 کۆچی دوایی کردووە، مەزهەبی مالکی لە وولاتانی ڕۆژ ئاوای عەرەبی زۆر بڵاوە. الأصفهاني، حلية الأولياء وطبقات الأصفياء،316/6. والزركلي، الأعلام، 257/5.

6ـ ابن العابدين، حاشية رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار 107/5. والكاساني، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، 171/7. والدردير،الشرح الكبير على مختصر سيدي خليل، ومختصر سيدي خليل،293/3.

زیر لە ناوچەی موسلدانە، لە مێینە هاتنە خوارەوەی ئاوی شەوانەو کەوتنە بێ نوێژی و توانای سك پڕی هەبێت. لە 9 ساڵ کەمتر نابێت بۆ مێینەو 12 ساڵیش بۆ نێرینە.[1]

دووەم : پێگەیشتن لە ڕوانگەی پزیشکیەوە

زاراوەی پێگەیشتن(البلوغ - Adolesence) ووشەیەکی لاتینی یە لە (Adolescere) وەرگیراوە. زانایانی پزیشکی زۆر پێناسەیان بۆ کردووە وجیاوازن لە دیاری کردنی قۆناغی پێگەیشتن لە تەمەنی ئادەمیزاددا، پوختەی پێناسەکانیان بریتی یە لە: ئەو ماوەیە کە لە دوای قۆناغی منداڵیەوە دێت، تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە گۆرانکارە فسیولۆژی دیار ڕوودەدات، وەك: گەشەی خێرای جەستەیی و دەرکەوتنی سیفەتە دووەمیەکان و گەیشتن بە تەواوبوونی گەشەو توانای ماسولکەیی وفیکری و عاتفی، ڕوو دەدات لە ماوەی 2- 4 ساڵ بە بەشداری هۆرمونەکانی (گەشەو هاندەری چیکلدانەو هاندەری زەردە تەن).[2]

## برگەی دووەم: گۆرانکاریە جەستەیی ودەروونیەکانی تەمەنی پێگەیشتن

تایبەتمەندیەکانی گەیشتن بە قۆناغی پێگەیشتن بریتین لە: گەشەیەکی دیارو بەرچاو وبەردەوام بەرەو پێگەیوی لە لایەنی ڕوخساری کەسایەتی، بەرەو پێشەوە چوون وپێگەیوی جەستەیی وجنسی و عەقلی، پێگەیوی لەکارو کردەوەو سەربەستی هەڵسوکەوت، تێکەلاوی کۆمەلایەتی و وەرگرتنی بنەماکانی سلوك و پشت بەخۆ بەستان وهەستی لێپرسراویەتی، دروستکردنی پەیوەندی کۆمەلایەتی نوێ و هەڵسان بۆ چوونە ناو تاقیکردنەوەکانی ژیانی ڕۆژانە، دەرکردنی هەندێ

1ـ کامل موسى، أحكام المعاملات، ص66.

2ـ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 740.*

- *John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 874.*
- *Rital A. Hilgard introduction of Psychology. P:104.*
- ابو حامد، حسين سليم، مختصر الفسيولوجيا البشرية، ص607.
- سامي محمد ملحم ، علم نفس النمو، ص341.

بڕیاری چارەنوسی دەربارەی خوێندن و هەڵبژاردنی پیشەو هاوسەری ژیان و دانانی پلانی دواڕۆژ.

پێگەیشتن دەست پێدەكات لە نێوان 12- 13 ساڵ، بەرزترین دیاردەكانی گەشەی كۆئەندامی زاوزێ و زیاد بوونی قەبارەو دەركەوتنی كارەكانیان، دەركەوتنی سیفەتە دوەمیەكانە وەك: دەركەوتنی ڕیش وسمێڵ وزیاد بوونی چڕی موو لە لەش بەتایبەتی لەسەر سنگ وسك، كەم بوونی چڕی موو لەناوچەی پێشەوەی سەر، گۆڕانی دەنگ بەهۆی گەشەی قوڕگ ودرێژبوونی ژێیە دەنگیەكان، دەركەوتنی دەنكۆڵەی گەنجیەتی(حب الشباب)، فراوان بوونی ناوشان و وزیاد بوونی بارستەی ماسولكەكان. ئەو گۆڕانكاریانە گشتیان لە هەموو هەرزەكارێك دەرناكەوێت و هەمووشیان بەیەك كات دیارناكەون، بەڵكو لە نێوانیان ماوەیەكی تەواو هەیە، لەوانەیە بگاتە چەند مانگێك.[1]

هاوكات لەگەڵ ئەو گۆڕانكاریە جەستەیی یانە گۆڕانكاری سلوكیش ڕوودەدات وەك زیاد بوونی چالاكی جەستەیی، دیاركەوتنی نیشانەكانی پیاوەتی لە قسەو كردار، ئامادەكاری بۆ بەرەنگاری كێشەو ناخۆشیەكانی ژیان، ئامادەكاری بۆ خۆگرتن وئارامی، گرنگی دان بە ڕەگەزی بەرامبەر( كە پێشتر نێرینە زیاتر ئارەزووی بەرەو هاوەڵانی خۆی دەچوو لە هەمان ڕەگەز، بەڵام ئێستا زیاتر ئارەزووی بەلای ڕەگەزی مێینەیە، مێینەش بە پێچەوانەوە ئارەزووی بەلای نێرینە دەچێت).[2]

نێرینەو مێینە بەهەمان خێرایی گەشە دەكەن تاوەكو 10 ساڵی تەمەن، بەڵام مێینە 1- 2 ساڵ بە پێش نێرینە دەكەوێت لە گەیشتنە ئاستی پێگەیشتنی تەواو، چونكە هۆرمونی ئیسترۆجینی مێینە وادەكات كەوا كرکراگەی سەری ئیسكانەكان زووتر بە ئیسكانەكانەوە بلكێن، تاوەكو لە گەشە بوەستێ، ئەم كردارەش 5 ساڵی دەوێت.[3] لە ژێركاریگەری هەردوو هۆرمونی ئیسترۆجین وئەندرۆجین مەمكەكان

---

1– *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 748, 1444.*

2ــ البار، خلق الإنسان، ص50. وسامي ملحم ، علم نفس النمو، ص350-380.

3ــ حامد أحمد ، الأيات العجاب، ص58.

دەست بە گەورەبوون دەكەن لەماوەی 2- 5 ساڵ تاوەكو دەگاتە ئاستی گلاندێكی تەواو و بەرهەم هێنەر. دوای ئەمە بە 6- 12 مانگ مووی ناوچەی موسلدانە دیار دەكەون، پاشان گەشەیەكی خێرای ئەندامەكانی تری زاوزێ و كەوتنە بێ نوێژی و دەركەوتنی مووی بن باڵ و رەق بوونی ئێسكانەكان بەتەواوی.[1]

تێكرای ساڵانەی زیاد بوون لە درێژی باڵا 6.5- 10.5 سم/ ساڵە، لوتكەی زیادبوون لە درێژی باڵا لە تەمەنی11- 12 ساڵیەوەیە، زیادبوونی درێژی لە نێرینە زیاترە لە مێینە وبارستەی ماسولكەكانی نێرینەی50٪ ی زیاترە لە مێینە.[2]

بە شێوەیەكی گشتی درێژی باڵای ئادەمیزاد لە نێوان 130- 200 سم بۆ نێرینە، 120-187 سم بۆ مێینەیە.[3]

كێش پاش تەمەنی پێگەیشتن بە 5.5- 10.5 كیلوگرام زیاد دەكات، دەگاتە لوتكەی زیاد بوون لە تەمەنی 12- 13 ساڵیەوەیە. زیادبوونی كێش دەست پێدەكات لە گەڵ زیاد بوونی باڵا، یان ماوەیەكی كورت دوای ئەو دەست پێدەكات.[4]

دابەش بوونی مووی ناوچەی موسلدانە: ئەم دابەش بوونە تایبەتمەندی خۆی هەیە، لە نێرینە زیاد دەكات بەرەو سەرە بە ئارەستەی ناوكدا دەڕوات، بەڵام لە مێینە ئاسۆیی یە. مووی بن باڵ زۆربەی جار هەندێك دوا دەكەوێت لە دەرچوون.[5]

دابەش بوونی چەوری لەش: رێژەی چەوری لە لەشی مێینە20- 22٪ یە، لە لەشی نێرینەش15-18٪یە. دابەش بوونی زیاتر دیاردەكەوێت لە مێینە، وا دەكات شێوەو ئاكاری لەشی بگۆرێت، وەك بەرزبوونەوەی ناوچەی سنگ وخڕ دەركەوتنی مەمكەكان و ناوچەی حەوزو ران. واتە ئەو چەوریە وادەكات بە گشتی مێینە خڕو خەپە دیار بن.[6]

---

*1– Stuart C& Ash M. Gyaecology by ten teachers. P: 28.*

2– حامد أحمد، الآيات العجاب، ص58.

3– أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص62.

*4– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 748-749, 1444.*

5– أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص62.

*- Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 79,742-744.*

6– أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص62.

*- Gray AT & Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 138.*

هەروەك لە توێژینەوەیەك لە ئەمەریكا كراوە لەلایەن هەردوو پزیشك ( Brown nell & Rodin) لە ساڵی 1994 وبۆیان دەركەوت كەوا ڕێژەی قەلەوی لە پیاوان 35٪ ولە ژنان زۆر زیاترەو دەگاتە 55٪ .[1]

گلاندەكانی پێستە: هەر لەو كاتی مووەكانی ناوچەی موسلدانەو بن باڵ دەردەكەون گلاندەكانی پێستە زیاتر دەكەونە كار، ڕێژەی دەرهاویشتنی چەوری وئارەقە زیاد دەكات، بۆنێكی تایبەت بەو كەسەش لەگەل دەردراوەكان پەیدا دەبێت.[2]

پێویستی لەش بۆ پرۆتین زیاد دەكات و دەگاتە 12-15٪ كۆی گشتی ووزەی لەش.[3] بەكارهێنانی ووزە لە نێرینە زیاترە لە مێینە چونكە بە شێوەیەكی گشتی درێژی وبارستایی وكێشی نێرینە زیاترە لە مێینە.[4]

تووش بوون بەكەم خوێنی لە هەردوو ڕەگەز چاوەڕوان كراوە، لە نێرینە لەبەر زیادبوونی بارستایی ماسولكەی لەش بە شێوەیەكی خێرا ولە مێینە لەبەر دەست پێكردنی سووڕی مانگانە.[5]

شلۆقی باری دەرونی: گۆڕانی ژیان لە قۆناغی منداڵی بۆ قۆناغی هەرزەكاری كارێكی سادەو ساكار نیە، بەڵكو كۆمەڵێك گۆڕانكاری زۆر گرنگی جەستەیی و دەرونی یە، بەتایبەتی لە مێینە، بۆیە پێویستیان بە هاوكاری زۆر هەیە، چونكە خۆی بەبەناز دێتە بەرچاو، دڵی ناسك دەبێت، بە بچوكترین شت تورە دەبێت، هەڵسوكەوتی دژایەتیەكی پێوە دیارە، وا هەست دەكات ژینگەو دەوروبەر لێی تێناگەن، زۆر جار دەست دەكات بەگریان وەیان تورەبونێكی كاتی، ئارەزووی تەنیایی دەكات وهەست دەكات پێویستی بە هاوڕێیەكە لە ڕەگەزی خۆی كە

---

*1_ Rital A & Others. Hilgard introduction to Psychology. P: 350.*
*2_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 747.*
*3_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1034.*
*4_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1033.*
5_ أبو حامد، حسين سليم، مختصر الفسيولوجيا البشرية، ص304.
*- John WH, JR. Human Anatomy&Physiology. P: 874.*

متمانەی پێ بکات وئەو تەنیایی وبارە شلۆقە دەرونیەی بڕەوێننەوە.[1]

لێرەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت کەوا پێگەیشتن کۆمەڵێك گۆرانکاری گرنگی تیادا ڕوو دەدات لــە هــەردوو ڕەگــەزدا، دەتــوانین بڵــێین گــشت ئەندامــەکانی لەشــی دەگرێتەوە بە تایبەتی کۆئەندامی زاوزێ وکۆئەندامی دەمار. واتە گۆڕانە لە قۆناغی منداڵیەوە بۆ پیاوێکی تەواو وەیان ئافرەتێکی تەواو.

## بڕگەی سێیەم: کاریگەری ژینگە لەسەر پێگەیشتن و هەرزەکار

ژینگە لە لایەن ڕێکخراوی جیهانی بۆ زانست وڕۆشنبیری لە ساڵی 1976 پێناسە کراوە بە: ئەو بەشەیە لە جیهان کەوا ئادەمیزاد لەسەری دەژی وهەردووکیان کار لێك دەکەن، واتــە ئــەو بەشــەیە کــە ئــادەمیزاد بــەکاری دەهێنــێ وخــۆی لەگــەڵی دەگونجێنێ، ئەویش کار لە ئادەمیزاد دەکات.[2]

هەروەها لەلایەن زانایانی دەروونناسیەوە پێناسە کراوە بــە: هۆکارێکی دەرەکی ماددی وکۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری و شارستانی یە، کە کاریگەریی لەسەر مــرۆڤ هەیــە لەو کاتەی کــە هێلکــەی پیتێنــراوەو هۆکارەکــانی بۆمــاوەیی دیــاری کــراوە تــاوەکو کۆتایی ژیانی، واتە ژینگە لەگەڵ بۆماوە بەرپرسیارە لەبونیادنانی کەسایەتی تاك و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی لە ژیان.[3]

هۆکارەکانی بۆماوەییە بەرپرسی سەرەکی یە لە چــۆنیەتی بونیــادی جەســتەیی ئــادەمیزادو شــێوەو ئاکارەکــەی بــە ڕێژەیــەکی زۆر، هــەموو ئادەمیزادێــك لەســەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەی لە هۆکارەکانی بۆماوەیی هەیە کە لە دایك وباوکیەوە بۆی هــاتووە دروســت دەبێــت، لەگــەڵ هەنــدێك تایبەتمەنــدی خــۆی، بــەڵام هۆکــاری دەروبەریش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر ئەو ئادەمیزادە هەر لە ژیــانی کۆرپەلــەوە

---

1ـ ماري كلود، دليل المرأة الطبي، ص64. والبار، محمد علي، خلق الإنسان، ص54.
2ـ عصام عبد اللطيف، الإنسان والبيئة، ص10.
3ـ السامرائي، هاشم جاسم ، المدخل في علم النفس، ص49.
- شحاطة، عبد الله، رؤية الدين الإسلامي في الحفاظ على البيئة، ص7.

تاوەکو مردنی، وەك جۆری خواردن، ئاووهەوا، خۆشی وناخۆشی ژیان...هتد

دکتۆر محمد عزالدین دەڵێت: بێگومان هەردوو هۆکاری بۆماوەیی وژینگە کاریگەریان هەیە لە سەر دارشتنی کەسایەتی مرۆڤ [1]. لە دونیادا دوو کەس نییە بەتەواوی یەیەك بچن، چونکە لە جیهان دوو کەس نییە بە هەمان هۆکاری بۆ ماوەیی و هەمان ژینگە تێپەڕ بووبن. هۆکاری بۆماوەیی ئێمەی داناوە لەسەر ئەو شێوەی کە هەین، هۆکاری دەوروبەریش دامان دەنێت لەسەر ئەو شێوەی، کە دەبین لە داهاتووە و بە هیچ شێوەکیش ناتوانین بلێین ڕۆلی کامەیان گرنگترە، بەلام دەتوانین بلێین ڕۆلی هەردووکیان جیاوازە، لەهەمان کاتیشدا تەواو کەری یەکترن.[2]

پێویستە ئەوەش بزانین کەوا هەر ماددەیەك دەچێتە ناو لەشی مرۆڤ، جا چ لە ڕێگەی پێستە بێت وەك تیشکی ڕۆژ، یان لە ڕێگەی دەمەوە بێت وەك خواردن و خواردنەوە، یان لە ڕێگەی هەناسەوە بێت وەك هەوا، ئەوا بەشێك لەو ماددانە دەچنە ناو هەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ، بەو هۆیەوە ئەو ماددانەی چوونەتە ناو لەش کاردەکەنە سەر زیندە چالاکیەکان و کارلێکە کیمیاویەکانی ناو خانەی زیندوو، ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر بونیادی خانەو ئەو گۆرانکاریانەی ڕوودەدات لە ناو ئەندامەکانی لەش بە هەردوو ڕەگەزیەوە.

زانای فەرەنسی ئەلیکسیس کاریل دەڵێت: ئادەمیزاد لە خۆڵی سەر زەوی دروست بووە، بەو هۆیەوە جوگرافیای ئەو وولاتەی کەتیایدا دەژی و سروشتی ئەو گیانەوەرو ڕووەکانەی کە دەیخوات کاریگەری بەرچاوی هەیە لە سەر چالاکیەکانی فسیولوژی و عەقلی.[3]

---

1ـ کەسایەتی (الشخصیة): ڕێکخەرێکی دینامیکی یە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش (جەستەیی و دەروونی) هەموو تاکە کەسێك، شێوەیەکی دیاری کراوە لە سیفات و ڕەوشتی ئەو کەسە پاش گونجاوی لەگەڵ ژینگە. نجاتي، محمد عثمان، القرآن وعلم النفس، ص426.

2ـ توفیق، محمد عز الدین، دلیل الأنفس بین القرآن الکریم والعلم الحدیث. ص425.

3ـ ألیکسیس کاریل، الإنسان ذلك المجهول، ص 105.

دکتۆرألیکسیس کاریل: لە سالی 1873 لە شاری لیونی فەرەنسی لە دایك بووە، کولیژی پزیشکی تەواو کردووە، لە سالی 1905 چووەتە ئەمەریکا ، لە پەیمانگای لیون لە شاری نیویورك بۆ توێژینەوەی زانستی

چونکە ئادەمیزاد بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی وبەردەوامی ڕەگەزەکەی لە ژیاندا پشت دەبەستێت بە سەرچاوەکانی ژینگە وەك تیشکی ڕۆژ، زەوی (خاك)، ئاو، هەوا، سەرچاوەی کانزایی، ڕووەك، گیانەوەر، ناتوانێ بەبێ ئەوانە بژیت، جا چ لە تەمەنەکانی گەشەکردنی دابێت بۆ نەشونەما کردنی، یان لەتەمەنی دوای پێگەیشتن دابێت بۆ جێگە گرتنەوەی ئەو خانەو شانانەی کە ڕۆژانە دەمرن، هەروەها پاریزگاری مانەوەی خانە زیندووەکان.[1]

ئەو کاریگەریانەی کە ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ کار دەکەنە سەر ئادەمیزادو کرداری گەشەو پێگەیشتن ئەوانەن: بۆماوە، هۆرمونەکان، ڕەگەز، ژینگەی سروشتی پاك و ژینگەی پیس بوو. لە پێشدا باسێکی تەواوی ڕۆلی بۆماوەو هۆرمۆنەکان ورگەزمان کرد لە سەر پێگەیشتن، بۆیە لێرەوە تەنها باسی ڕۆلی ژینگە دەکەین لە سەر کرداری گەشەو پێگەیشتن.

**یەکەم : ژینگەی سروشتی (البیئة الطبیعیة )**

ئەویش دەکرێ بە چەند بەشێکەوە: جۆری ژینگەکە وپلەی ڕۆشنبیریان (شارستانیە یان لادێی یە)، باری تەندروستی وخواردنیان، پلەی گەرمای ژینگەکە.

**أ- جۆری ژینگەکە وپلەی ڕۆشنبیریان**

1- ژینگەی لادێی (البیئة القرویة): بەهۆی سادەیی ژیان لە هەموو بوارەکانی، کەمی پێداویستیەکانی ڕۆژانە، ئەو ئاسانکاریانەی کە خاووخێزان پێشکەشی دەکەن بۆ کوڕو کچەکانیان (وەك زوو بە شودان، دروستکردنی ژوور وەیان خانووەکی ئاسایی بە کۆمەکی هەموو لایەك و هەرەوەزی)، نەبوونی کێشەکانی ئابووری لەبەر بوونی زەوی و کێڵگەو دانەوێڵە، نەبوونی کێشەی تەواو کردنی

---

کاری کردووە بۆ ماوەی 30 ساڵ، هەر لەو ماوەیەدا لەساڵی 1912 (خەلاتی نۆبل)ی وەرگرتووە، پاشان گەڕاوەتەوە فەرەنسا. لەساڵی 1944 کۆچی دوایی کردووە.

1ــ الویردي، فرج الله ، عمر الإنسان وعلاقته بالغذاء والتغذیة، ص22.

- عز الدین فراج، تغذیة الإنسان في الصحة والمرض، ص10-21 .

خوێندن (چونكە ئەو دوو كێشەیە زۆر جار كرداری پێكەوەنانی خێزان دوا دەخات).[1] ئەو هەموو هۆكارانەی باسمان كرد كاریگەرێكی ئیجابییان هەیە لەسەر زووتر گەشەی هەردوو رەگەزو بیركردنەوە لە پێكەوەنانی خێزان، چونكە هەموو پێداویستیەكانی ژیانی هاوبەشیان لەبەر دەست وئامادەیە.

2- ژینگەی شارستانی (البیئة الحضریة- المدنیة):

هەرزەكار لە ناو شارەكان رووبەرووی چەندەها كێشە دەبێت گەر بیەوێت بیر لە پێكەوەنانی خێزان بكات، ئەو كێشەو گرفتانەش ئەمانەن: تەواوكردنی خوێندنی ئامادەیی وزانكۆو زۆر جاریش خوێندنی بالاّ، بەرز بوونەوەی مارەیی ئافرەت و پێداویستیەكانی ژیانی خێزانداری، كێشەی خانوو، یان كرێی خانوو، ئالۆزی ژیانی رۆژانەی ناوشارەكان بە هۆی هاتنە ناوەوەی ژمارەیەكی زۆر لە بیرو بۆچوونی دەرەكی وبیانی بۆ ناو شارەكان وكۆمەڵگەكان، بە ئاسانی دەست نەكەوتنی بژێوی رۆژانە.[2] ئەوانە هەمووی هۆكارن بۆ ئەوەی هەرزەكار پشت بە دایك و باوكی ببەستێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی لە ژیان، ئەوەش كاریگەری سەلبی دەبێت لە سەر گەشەو گەیشتنە قۆناغی پێگەیشتنی تەواو.

ب- باری تەندروستی و خواردن (الحالة الصحیة والطعام).

تەندروستی لەش وئاسوودەی دەروون، هەروەها جۆری ئەو خواردنەی كە هەرزەكار دەیخوات كاریگەریەكی زۆری هەیە لەسەر رژاندنی هۆرمۆنەكان و ئینزیمەكان بەگشتی ودەبێتە زووتر گەشەو نەشونمای جەستەیی وفیكری و گەیشتنە قۆناغی پێگەیشتن.

---

1ـ القرجتاني، كريم شريف علم نفس المراهقة والشباب، ص7-9 .
2ـ القرجتاني، علم نفس المراهقة والشباب، ص4.

ج- پلەی گەرمی ژینگە

لە وولاتە گەرمەکان قۆناغی پێگەیشتن زووتر دەست پێدەکات لەوولاتانی تری سارد.[1] بەلام کاریگەری بۆماوەش رۆلی خۆی دەبینێ لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی تر هەرچەندە لە یەك وولاتیش بژین.

هەروەها وەرزشی توندو تیژو گۆرانکاریە وەرزەیەکانی سالّ کاردەکاتە سەر چالاکی هێلکەدان. لە وولاتە ساردەکان کە تیشکی رۆژ بەلاری دەکەوێتە سەر زەوی و ماوەی شەو درێژترە لە رۆژ، تەنی سنۆبەری رێژەیەکی زۆرتر لە هۆرمۆنی میلانونین دەرژێنێ ئەمەش چالاکی هیلکەدان کەم دەکاتەوەو کەوتنە ناو بێ نوێژی دوا دەخات لەو کچانەی شویان نەکردووە، ئەوانەی شویان کردووە ئەگەری منداڵبوونیان کەمتر دەبێت. هەر بۆیە دەبینرێ کەوا رێژەی منداڵبوون لە وەرزی زستان و پایز کەمترە لە وەرزی هاوین لە وولاتانی ئیسکندیناڤیا (سوید، نــرویج، وفنلندا).[2]

مێینە لە 9 سالیەوە دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن لە ناوچە گەرمەکان، لە ناوچە ساردەکان لەوانەیە بگاتە 18 سالّ.[3]

ئیمامی شافعی(رحمه الله) دەفەرموویێ: کەمترین تەمەنی بێ نوێژی کە بیستوومە لە ناوچەی تهامە بووە کە لە 9 سالّ بووە، لەو تەمەنە کەمتر بە منداڵ دادەنرێ و منداڵیش بێ نوێژی نابێت.[4]

ئاماژەمان کرد بە ووتەکانی ژمارەیەك لە زانایانی زانستی پزیشکی وشەرعی

---

1ــ الرفاعي، أنس، الموسوعة الطبية الكاملة للأسرة، 930/2.

فؤاد غصن، الطب الشرعي وعلم السموم، ص583. والمحمدي، علي محمد، بحوث فقهية في مسائل طبية معاصرة. ص99. وطالو، محي الدين، تطور الجنين، ص49.

2ـ *Leon S & Others (1993). Clinical Gynecologin Endocrinology & Infertility .P: 202*

3ــ البار، محمد علي ، خلق الإنسان بين الطب والقرآن ، ص47.

4ــ الفيروزآبادي، المهذب في الفقه الإمام الشافعي، 121/2. النووي، المجموع شرح المهذب، 166/16.

دەرکەوت کەوا بۆماوەو ژینگەو ڕەگەز (نەتەوە) کاریگەریان هەیە لە سەر پێگەیشتن. هەروەك ئەبوو هورەیرە لە پێغەمبەری خوداوە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ((هەمو و کەسێك کە لە دایك دەبێت، لەسەر فیترەی ئیمان لە دایك دەبێت، بەڵام دایك وباوك وای پێ دەکەن کە ببێتە جولەکە، گاور، یان ئاگر پەرست...))[1] ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ژینگە کاریگەری هەیە لە سەر ڕووکەشکردنی فیترەتی باوەڕ هێنان و فیترەتی ئادەمیزاد لە ڕووی جەستەیی ودەروونیەوە لە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێدا.

**دووەم: ژینگەی پیس بوو( البيئة الملوثة ).**

لە دوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ژمارەی ماددە زیان بەخشەکانی دروست کراون لە کارگەکان ڕووی لە زیادی کردووە، بۆنموونە لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گەیشتۆتە نزیکەی 50000 جۆر. ئەو ماددە ژەهراویانە کار لە جەستەی مرۆڤ دەکەن بەگشتی، لە سەر کۆئەندامی زاوزێ وپڕژێنە گلاندەکان بەتایبەتی، جا چ بەڕێگەی ڕاستەوخۆ، وەك ڕێگە گرتن لە بەرهەم هێنان، یان زیاد ڕژتنی هۆرمونەکان، یان ناڕاستەوخۆ بێت وەك بەربەست نانەوە لە پێش شوێنی کارکردنی هاندەرەکان.

کاریگەری ئەو ماددە زیان بەخشانە لەسەر منداڵ و هەرزەکار زیاترە لە گەورەکان لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:[2]

* منداڵان هەرچەندە قەبارەیان بچوکترە، بەڵام جولەو چالاکیان زیاترە لە گەورەکان، بەمەش زیاتر دەخواو دەخواتەوەو هەواش زیاتر هەڵدەمژی.
* کۆئەندامی بەرگری هێشتا هەر ساوایە ناتوانێ بەرگری تەواو بکات.
* لەشی لە گەشەی بەردەوامە.

لەبەرئەو هۆیانەیە ژینگەی پیس بوو کاریگەری سەلبی هەیە لە سەر گەشەو دواکەوتنی بێ نوێژی، لەوانەیە هەرماددەیەکیش بە تاك کاریگەری خۆی هەبێت لە

1– پێشتر باسی کراوە لە پێشەکی.
2– *Office of Children's Health Center (2003). Americans Childern & The Environment. P: 7.*

سەر ڕژێنە گلاندەكان.[1]

## بەندی سێیەم: جیاوازی نێوان هەردوو ڕەگەز لە تەمەنی هەرزەكاری و تەمەنی زاوزێ

1- قۆناغی پێگەیشتن لە مێینە لە نێوان 10- 14 ساڵ دەست پێدەكات، لە نێرینە لە نێوان 12- 15 ساڵ، واتە مێینە بە 1- 2 ساڵ پێش نێرینە دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن.[2]

2- كچان دەگەنە لوتكەی گەشەی جەستەیی لە 17 ساڵیدا، بەڵام كوڕان لە 19 ساڵیدا. هەربۆیە كچ بە دوو ساڵ پێش كوڕ دەگەنە پێگەیشتنی فیكری وعاتیفی ولە دوای ئەو تەمەنە نێرینە دووبارە دەكەوێتە پێش مێینە لەبەر هۆكاری بۆماوە، كۆمەڵایەتی، پەروەردەیی.[3]

3- بە شێوەیەكی گشتی مێینە كورترن لە نێرینە، ئێسكانەكانی بچووكترە وبارستایی ماسولكەی كەمترە. ڕێژەی چەوری زیاترەو كۆبوونەوەی ئەو چەوریە لە هەندێ ناوچەی وەك سنگ ومەمك وحەوز وای كردوە زیاتر خڕو خەپە دیار بێت. قژی خاوو پێستەی تەنك وناسكترە.[4]

4- مێینە لە قۆناغی پێگەیشتن مەمكی گەورە دەبێت وناوچەی حەوزی فراوانتر دەبێت، لە نێرینەش ئەندامەكانی زاوزێی ناوەوەو دەرەوەی گەورەتر دەبن .

5- دابەش بوونی مووی ناوچەی موسلدانە جیاوازن هەروەك پێشتر باسمان كرد.

---

*1 _ Environmental Protection Agency (2000). Children's Environmental Health. P: 6, 84.*
*- Environmental Protection Agency (1998). Children's Environmental Health. P: 8, 33.*

2_ أحمد كنعان، موسوعة جسم الإنسان، ص32.

3_ المصدر نفسه، ص32.

*4_ Gray A& Kevin T. Anatomy& Physiology. P: 138.*

6- دەنکۆکەی گەنجیەتی "Acne Vulgaris" کە 40٪ ی گەنجەکان تووش دەبن لە تەمەنی نێوان 16- 18 ساڵیدا، هەموو نەتەوەیەکیش دەگرێتەوە بە پلەو رێژەی جیاجیا، مێینە زووتر تووش دەبێت لە نێرینە.[1]

7- رووتانەوەی مووی سەر(الصلع الـذكري-Alopecia ): هەموو رەگەزو نەتەوەیەك دەگرێتەوە بە پلەو رێژەی جیاجیا، لە نێوان 27- 50 ساڵیدا روودەدات لە نێرینە، بەڵام لە مێینە دوای لە بێ نوێژی کەوتن روودەدات. لە نێرینە: کەوتنی مووی سەر دەست پێدەکات لە پێشەوەی سەرو هەردوو تەنیشتەکانی پێشەوە (سەر ناوچەوانە ئیسك ولاجانگە ئیسك)، موو لە ناوچەی ناوەڕاستی سەر تەنك دەبێت، بەم شێوە رووتانەوەش دەڵێن(نموونەی هامڵتۆن) کە بە هێواشی و لەسەرخۆ ژمارەی موەکان کەم دەبنەوە لە ماوەی چەند ساڵێك. لە مێینە: ژمارەی موەکانی ناوچەی ناوچەوان وەك خۆی دەمێنێ، بەڵام بە گشتی مووی ناوەڕاستی سەر تەنك دەبێت وچڕی موەکان کەم دەبێتەوە، بەم شێوە رووتانەوەش دەڵێن: (نموونەی لودویغ). لەوانەیە لە قۆناغی یەکەم کەوتنی موەکان زۆر بێت بەڵام لە دواییدا تەنها دیاردەی چڕی کەمیان پێوە دیار دەبێت.[2]

8- یەکێك لە قۆناغەکانی کرداری میتابولیزمی هۆرمونی ئەندرۆجین وگۆرانی بۆ تیستۆستیرون لەناو چەوریە گلاندەکانی پێستەوە روودەدات، لەگەڵ بە ساڵاچوون ئەم گلاندە چەوریانە توانای پێشوازی کردنی هۆرمونی تیستوستیرونیان کەم دەبێتەوە، بەمەش پێستە چورچ ولۆچی تیا دەردەکەوێت. ئەم گۆرانکاریەی ناو پێستەو چورچ ولۆچیە لە مێینە زووتر روودەدات بەچەند ساڵێك پێش نێرینە.[3]

9- هۆرمونی نێرینە (تیستۆستیرون) کە هاندەرە بۆ زیاتر کرداری نیشتنی

---

1ـ صالح داود، الوجيز في الأمراض الجلدية، ص85.
2ـ صالح داود، الوجيز في الأمراض الجلدية، 198-199.
*3_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1363-1364.*

پـروتین لـەناو پێـستەو زیـاتر گەشـەی مووەکـان و دەردان ودەرهاویـشتنی زیـاتر چەوری و ئارەقە لە گلاندەکانی ناو پێستە، وای کردووە هـەردەم پێستەی نێرینـە تەڕ بێت و هـەردەم گەشـەو چالاکی ونـەرمی وگەنجیـەتی پێوە دیـار بێـت. بـەلام لەلایەکی ترەوە دەنکۆکەی گەنجیەتی زیاد دەکات.

هۆرمونی مێینە ئیستروجین هاندەرە بۆ زیاتر نیشتنی چەوری لە هەندێ شوێنی دیاری کراو(سنگ ومەمك وحەوز)، وا دەکات پێستەی مێینە تـەنك وناسـك بێـت، لـە هەمان کاتیش هەست بە گەرمیەك دەکرێت کاتی دەسـت لێدانی، ڕێـژەی هەسـتی پێستەش زیاد دەکات ودەگاتـە 10 جـار زیـاتر بـە بـەراورد لەگـەڵ نێرینـە. [1] بۆیـە ئافرەت ئارەزووی جنسی هەڵدەستێ بە دەست لێدان زیـاتر لـە پیـاوان، هـەر بۆیـە خوای گەورە مصافحەی قەدەغە کردووەو خۆداپۆشین و وپۆشاکی شەرعی لە سـەر ئافرەتاندا داناوە. لە بەرگی دووەم بە درێژی باسیان دەکەین بە پشتیوانی خوا.

10- ڕێژەو ئاستی هۆرمونی ئەندرۆجین لە نێرینە 10 جاری مێینەیـە، هەربۆیـە هێزی ماسـولکەو توانـای ئەنجامـدانی کـارە قورسـەکان وبەرگـە گرتنـی زیـاترە لـە مێینە. چونکە هۆرمونی ئەنـدرۆجین بارستەو هێـزو تونـدی ماسـولکەکان، ڕەقـی و چڕی ئێسکانەکانیش زیاد دەکات، بەهـەمان شـێوە توانـای بەربـەرەکانی وململانـێ وڕووبەڕوو بوونەوەش زیاد دەکات.[2]

11- هۆرمـونی نێرینـە تایبەتمەنـدی ئـەوەی هەیـە کـە چـالاکیەکەی بونیـادی- گشتگیرە- (واتە کار لەسەر زۆربەی ئەندامـەکانی لـەش دەکـات)، بـەلام هۆرمـونی مێینە- تایبەتە- بە کۆئەندامی زاوزێی مێینە.[3]

---

1ـ حامد أحمد، الأيات العجاب، ص55. والدكتور خالص بلال البقال،44 سنة، ماجستير في طب المجتمع، مكان المقابلة:عيادته الخاصة، تاريخ المقابلة: 2004/9/5م، مدة المقابلة: نـصف الساعة.

2ـ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 949, 997.*

3ـ حامد أحمد، الأيات العجاب، ص55.

12- دەربارەی جوولەو چالاكی: زیندەچالاكیەكان لە نێرینە زیاترە بەبەراورد لەگەڵ مێینە لە هەموو قۆناغەكانی ژیان لە منداڵیەوە تاوەكو پیری.[1]

13- ڕاهێنان ووەرزش هێزو تواناو میتابولیزم زیاد دەكات، بە هۆی ڕژانی بڕێكی زیاد لە هۆرمونی ئەندرۆجین. لە توێژینەوەیەكی پزیشكی كە لە ئەمەریكا كراوە، سەلمێنراوە كەوا وەرزشی بەردەوام وتوندو تیژی لە ڕادە بەدەر وادەكات بڕی ئەوهۆرمونانە زیاد بن لە ناو خوێن، وەك پرۆلاكتین وتیستۆستیرون وهاندەری ڕژێنەی سەر گورچیلەو ستیرۆیدەكان، لە هەمان ئەو جۆرە وەرزشانە ڕێژەی هۆرمونەكانی مێینە كەم دەكات، پشێوی جەستەیی ودەرونی دروست دەكات، ئەوپشێویەش كاریگەری سەلبی هەیە لەسەر سوڕی مانگانەی ئافرەت، لە وانە:[2]

أ- دواكەوتنی بێ نوێژی (Delay menarche) بۆ ماوەی 3 ساڵ یان زیاتر، ئەگەری ڕوودانی پشێوی بەردەوام لە ڕێسای(نظــام) سوڕی بێ نوێژی لە دواڕۆژ دروست دەبێت ئەگەر ئەو جۆرە وەرزشانە پیادە بكرێن لە تەمەنی منداڵیدا پێش پێگەیشتن، بەتایبەتی وەرزشی بالیە (سەمای سەردەم) ( Ballet-Modern Dancing).[3]

ب- كەم وكورتی لە ئەرك وفەرمانی زەردە تەن (Luteal dysfunction) لە نزیكەی 3/2 ی ئەو كچانەی خولیای وەرزشی توندو بەردەوامن.[4]

ج- لە بێ نوێژی كەوتن (انقطــاع الطمــث- Amenorrhea). هەركات وازی لەوجۆرە وەرزشانە هێنا و پشوویەكی باشی دا، ئەوا دووبارە دەكەوێتەوە سەر بێ نوێژی.[5]

د- كەم بوونەوەی ڕێژەی چەوری لەشی ئافرەت بە هۆی ئەو جۆرە وەرزشانە،

1ـ القصاب، الفروق بين الذكر والأنثى، ص147-148.
2ـ *Leon S. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 202.*
3ـ *Leon S. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 200.*
4ـ *Leon S. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 201.*
5ـ *Kenneth. Principle of Endocrinology.P: 71, 804.*

وا دەکات 10٪ توشی لە بێ نوێژی کەوتنی دوەمی بن.[1]

هەر بۆیە پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی وباری هۆرمونەکانی گونجاو نیە لەگەڵ ئەو جۆرە وەرزشانەو لەگەڵ کاری قورس وگران.

14- ئەگەر نێرینە تایبەتمەندی هێزی ماسولکەیی هەیە بەهۆی هۆرمونی ئەندرۆجین، ئەوا هۆرمونی ئیسترۆجین تایبەتمەندیەکی بایولوجی بە مێینە دەبەخشێ، ئەویش بەرزکردنەوەی ئاستی کولیسترولی چڕی بەرزە( High Density Cholesterol)، کە هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ تووش نەبوون وبەرگری کردن لە نەخۆشی ڕەق بوون و تەسك بوونەوەی خوێنبەرەکانی دڵ (خوێنبەرە ڕەقبوون). هەرکاتێك ئاستی ئەو کولیسترۆلە بەرزتر بوو لە 60 ملگرام/سم$^3$ ئەوە توانای پاراستی بۆرییەکانی دڵ زیاتر دەکات. نێرینە ئەو تایبەتمەندیە بایولوجیە فیتریەی نیە، هەر بۆیە ڕێژەی ئەو نەخۆشیانە لە نێرینە زیاترە، بەتایبەتی ئەوانەی کە جولانەوەیان کەمەو وەرزشی بەردەوام ناکەن. بەڵام نێرینە دەتوانێ ئەو جۆرە کولیسترۆلە بە دەستی بهێنێ بە وەرزشی بەردەوام وتوندو تیژ. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا خوای پەروەردگار چۆن هاوسەنگی دروست کردووە لە گشت کارەکانی، مێینە کاری دەرەوەو کاری قورس وتوندی بۆ دیاری نەکردووە لە ژیان، واتە جولانەوەی کەمە، بەڵام لە بری ئەمەوە هۆرمونی تایبەت بەمێینە کە ئیسترۆجینە ئەو بۆشاییە یەی پڕ کردۆتەوە و وا دەکات ئاستی ئەو کولیسترۆلە چاك و باشەکە بەرزبکاتەوە تاوەکو ئافرەت لە نەخۆشیەکانی خوێنبەرە ڕەقبوون ڕزگاری ببێ، ئەگەر ئەو میکانیزم وهاوسەنگیە نەبوایە زۆربەی ئافرەتان کاتی سك پڕی توشی ئەم نەخۆشیە کوشندەیە دەبوون. لەلایەکی ترەوە نێرینە ئەو هۆرمونەی بە ڕێژەیەکی زۆر کەم هەیە، بەڵام لە بری ئەوە کاری نێرینە کە بریتی یە لە جولانەوەی زۆرو کاری قورس وتوانای وەرزشی توندو تیژی هەیە، ئەمانە هەموویان هۆکارن بۆ زیاد بوونی ئاستی ئەو جۆرە کولیسترۆلە چڕی بەرزە.[2]

---

*1– Leon S. Clinical Gynecologin Endocrinology&Infertility. P: 201.*

2– حامد أحمد ، الأيات العجاب، ص60.

15- تەمەنی زاوزێ لە پیاوان لە پێگەیشتنەوە تاوەکو پیری یە، بەڵام لە ئافرەتان دەگاتە 40- 50 ساڵ.

16- پیاو دەتوانێت ڕۆژانە بە ملیونەها سپێرم دەربهاوێژێ، بەڵام ئافرەت لە هەموو تەمەنی تەنها 200- 400 هێلکەی پێگەیشتوو دروست دەکات و لەوانەش تەنها چەند دانەیەکیان دەپیتێنرێن.[1]

17- کارو چالاکی کۆئەندامی زاوزێی نێرینە کەم دەبێتەوە لەگەل کەوتنە ناو تەمەن، بەڵام زۆر بە هێواشی و بەدرێژایی تەمەن، تووشی تەمەنی کەوتنی زاوزێ نابێت( Male menopause-Climacteric) هەروەك لە ئافرەتدا ڕوو دەدات.[2]

18- هەندێ گۆڕانکاری نا سروشتی کە لە کرۆمۆسومەکان ڕوو دەدات، وەك نا یەکسانی کرۆمۆسومەکان(Aneuploidy) ، دەبینین بە ڕێژەی 26٪ لە کرۆمۆسومەکانی هێلکەدا ڕوو دەدات بەرامبەر بە 10٪ ی کرۆمۆسۆمەکانی سپێرم. هەروەك لە نەخۆشی (داون) (Down syndrome- trisomy21 ) دا دەبینین کەوا زیاتر ڕوو دەدات لەو ئافرەتانەی درەنگ شوو دەکەن ودرەنگ منالّیان دەبێت. بەڵام گەر پیاوی پیر هاوسەری هەبێ ومنداڵی ببێ ئەو نەخۆشیە لە نەوەکانی ڕوونادات. لەو نەخۆشیەدا دەبینین کرۆمۆسومەك زیادەبێت و دەبێتە(47 xx، یان 47 xy).[3]

پاش هەموو ئەو جیاوازیانە دەبینین بەگشتی ئەو گۆڕانکاریانەی، کە لە مێینە ڕوو دەدات هەر لە منداڵیەوە تاوەکو کۆتایی تەمەنی زاوزێ، بریتی یە لە جوانی ڕوکاری دەرەوە، ڕێك وبەرچاوی دیمەن، باریك وناسکی بەژن وباڵاو، گەشاوەی ڕوخسار، نەرمی پێستە، کێش کردنی بەرامبەر بۆ لای خۆی (نرى أن الهدف الأساسي الذي تسعى إليه كافة التغيرات عند الإناث، هو اكتمال جمال المنظر، وحسن البنيان، ورشاقة القوام، وبهاء الطلعة، ونعومة الملمس، ونضارة الأنوثة وقوة جاذبيتها).

---

*1- Gray A & Kevin T. Anatomy& Physiology. P: 115.*

*2 -Ganong WF (1980. Review of medical physiology.P: 340.*

3- حامد أحمد ، الآيات العجاب، ص190.

## بەندی چوارەم: جیاوازی لە هۆكارەكانی تووش بوون بە نەخۆشی ونەخۆشیە درێژخایەنەكان ومردن لە نێوان هەردوو رەگەز

### برگەی یەكەم: رێژەی هۆكارەكانی تووش بوون بــە نەخۆشــی و نەخۆشـیە درێــژ خایەنەكان لە هەردوو رەگەزو جیاوازیان

**یەكەم: رێژەی هۆكارەكانی تــوش بــوون بــە نەخۆشـیە درێژخایەنــەكان(العوامل المسببة للإصابة بالأمراض المزمنة)**

جیاوازیەكی زۆر بەدی دەكرێت لە رێژەی هۆكارەكانی توش بـوون بـە نەخۆشـی درێژ خایەن ورێژەی خودی نەخۆشیەكان لە هەردوو رەگەز، بەلام پێویستە ئەوەش بزانین كەوا رێژەی ئـەو هۆكارانـە جیـاوازە لـە وولاتێـك بـۆ وولاتێكـی تـر، هـەروەها جیاوازە لە نێوان وولاتە پێشكەوتوەكان بەبەراورد لەگەڵ وولاتانی جیهانی سێیەم و وولاتـانی دواكـەوتوو، یـان وولاتـانی هـەژار. لـە هەنـدێ وولاتانـدا رێـژەكان دوو بەرابەرە، بۆ نموونـە لـە كۆریـا جگـەرە كێشان وەـەی خواردنـەوە رێـژەكانیان لـە سەرووی 60٪، لە وولاتی تردا رێژەكان پێچەوانەن لە نێوان هەردوو رەگەزدا، بەلام هەرچۆنێك بێت رێژەكان لە نێوان هەردوو رەگەز جیاوازە. وەك لەم دوو خـشتەیەی خوارەوە روون كراوەتەوە.

خشتەی ژمارە 2: هۆكارەكانی توشبوون بە نەخۆشیە درێژخایەنەكان وڕێژەكانیان لە هەردوو رەگەز[1]

| هۆكارەكانی | ڕێژەكان % | |
|---|---|---|
| نەخۆشی | نێرینە | مێینە |
| جگەرە خواردن | ٪35 | ٪16 |
| مەی خواردن | ٪10 | ٪3.9 |
| وەرزش نەكردن | ٪82 | ٪72 |
| قەڵەوی | ٪28.4 | ٪41 |
| بەتەنهایی ژیان | ٪3 | ٪11 |
| كەوتن وشكان | ٪15 | ٪23 |

**دووەم: نەخۆشیە درێژ خایەنەكان (الأمراض المزمنة)**

جیاوازیەكی زۆر بەدی دەكرێت لە ڕێژەی نەخۆشیە درێژ خایەن لە هەردوو رەگەز، دووبارە دەبینین كەوا ڕێژەی ئەو نەخۆشیانە جیاوازە لە وولاتێك بۆ وولاتێكی تر، هەروەها جیاوازە لە نێوان وولاتە پێشكەوتوەكان بەبەراورد لەگەڵ وولاتانی جیهانی سێیەم و وولاتانی دواكەوتوو، یان وولاتانی هەژار. بۆ نموونە زۆر نەخۆشی هەیە لە وولاتانی پێشكەوتوو زیاترە وەك نەخۆشیەكانی دڵ وشەكرەو پرۆستات وشێرپەنجەی مەمك وقەڵەوی وخەمۆكی، بەپێچەوانەوە هەندێ نەخۆشی تر ڕێژەی بەرزە لە وولاتانی تر. هەروەها جیاوازی هەیە لە ڕێژەی ئەو نەخۆشیانە

---

*1– WHO& COST (2006). National survey for NCD risk factors for population age 25-65 years old / Iraq.*

ئەو ڕێژانە هەندێكیان بۆ كۆمەڵگەی عێراقیەو هەندێكیان بۆ وولاتانی پلۆ ئاولیە و زۆربەیان بۆ ئەوانەی تەمەنیان سەرووی 65 ساڵەوەیە.

لە ڕووی تەمەنەوە، زۆربەیان لە تەمەنی سەرەوەی 65 ساڵ زیاترە لە تەمەنەکانی خوارەوتر. هەرچۆنێك بێت ڕێژەی ئەو نەخۆشیانەو هۆکارەکانی توشبوونیان لە نێوان نێرینەو مێینە جیاوازە، هەروەك لەو خشتەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە.

خشتەی ژمارە 3: نەخۆشیە درێژخایەنەکان لە هەردوو ڕەگەز[1]

| نەخۆشیەکان | ڕێژەکانیان | |
|---|---|---|
| | نێرینە | مێینە |
| بەرزی پەستانی خوێن | ٪41 | ٪27 |
| شەکرە | ٪22.5 | ٪17 |
| خوێنبەرە ڕەقبوونی بۆریەکانی دڵ | ٪13 | ٪7 |
| پەککەوتنی دڵ | ٪10 | ٪6 |
| هەوکردنی سیەکانی درێژخایەن | ٪10 | ٪6 |
| تەنگە نەفەسی (الربو) | ٪5 | ٪11 |
| داخورانی ئێسکان | ٪27 | ٪44 |
| ڕۆماتیزمی جومگەکان | ٪1 | ٪2.5 |
| میز ڕانەگرتن | ٪15 | ٪30 |
| قەبزی | ٪16 | ٪26 |
| بەردی زەرداو | ٪7 | ٪20 |
| بەردی گورچیلە | ٪7 | ٪2.5 |
| ئاوی سپی | ٪34 | ٪48 |
| خەمۆکی | ٪5 | ٪10 |

*1— WHO& COST (2006). National survey for NCD risk factors for population age 25-65 years old / Iraq.*

ئەو ڕێژانە هەندێکیان بۆ کۆمەڵگەی عێراقیەو هەندێکیان بۆ وڵاتانی ڕۆژ ئاوایە.

هەرچەندە رێژەی هەندێك لە نەخۆشیەکان لە نێرینە زیاترە لە مێینە، بەلاّم لە هەردوو وولآتانی پێشکەوتوو، هەروەها وولآتانی جیهانی سێیەم رێژەی پەککەوتن و کەمی توانای کارکردن لە مێینە زیاترە لە نێرینە (19٪ بەرامبەر 11٪)، چونکە تەمەنیان درێژترەو پشێوی هۆرمونی و داخورانی ئێسکانەکان و رووداوی کەوتنیان زۆرترە. رێژەی تەمەنی ئافرەتان لە جیهان بەگشتی لە مێینە 2- 3 ساڵی زیاترە لە نێرینە، لە وولآتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا 5- 9 ساڵی زیاترە. هەربۆیە ژمارەو رێژەی مێینە لە نێرینە زیاترە لە گشت وولآتانی جیهان.

## برگەی دووەم : هەردوو رەگەزو جیاوازی مردن ( الوفاة وعلاقتها باختلاف الجنسين ).

لێکۆلینەوەیەکی پزیشکی کرا لە ئەمەریکا لەساڵی 1986 لە سەر رێژەی مردن و هۆکاری مردن و ئەو تەمەنەی کە هەردوو رەگەز پێی دەگەن ( life expectancy –Length of life ) گەیشتنە ئەو ئەنجامانە.[1]

رێژەی مردن: لە پیاوان زیاترە لە ژنان، تەمەنی مەزەندەکراو 78 ساڵە بۆ پیاو، 84 ساڵە بۆ ئافرەت، واتە ئافرەت 6–7 ساڵ تەمەنی درێژ ترە لە پیاو. هەروەها 75٪ ی پیاوان دەگەنە 65 ساڵ، بەلاّم 86٪ی ژنان دەگەنە 65 ساڵ.

جگەرە کێشان: کە هۆکاری سەرەکی تووش بوونە بە شێرپەنجەی سیەکان و نەخۆشیەکانی دڵەو بە 60٪ ی هۆکاری مردن دادەنرێ. رێژەی جگەرە کێشەکان لە ناو پیاوان 32٪، لەناو ئافرەتان 27٪ یە.

مەی نۆشین: خواردنەوەی مەی هۆکاری سەرەکی تووش بوون بە نەخۆشیە درێژ خایەنەکانی جگەرە، بەتایبەتی بەچەوری بوونی جگەر (تشمع الكبد). رێژەی مردن بەهۆی مەی خواردنەوە لە پیاوان دوو بەرابەری ئافرەتانە.

---

*1– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1015.*

مصدر المعلومات: المركز القومي للإحصاء الصحي 1986م المجلد الثاني: الوفيات ، واشنطن'DC ' مطبعة الحكومة الأمريكية، 1988م

ڕوداو، خۆکوشتن و کوشتن: 7٪ ی مردن بەو هۆکارانەوە دەبێت لە ئەمەریکا. لە پیاوان سێ بەرابەری ئافرەتانە.

شێرپەنجەکان: تووش بوون بە شێرپەنجە لە پیاوان هێندو نیوی ئافرەتانە.

خشتەی ژمارە 4: هۆکارەکانی مردن ورێژەکانیان لە هەردوو ڕەگەز.[1]

| جۆری نەخۆشی | نێرینە | مێینە |
|---|---|---|
| نەخۆشیەکانی دڵ | 238 | 124 |
| شێرپەنجەی کوشندە | 163 | 111 |
| شێرپەنجەی سیەکان | 59 | 22 |
| نەخۆشیەکانی کۆئەندامی دەمار | 33 | 29 |
| ڕووداوە جیاجیاکان | 52 | 18 |
| نەخۆشیە درێژ خایەنەکانی سیەکان | 27 | 12 |
| هەوکردنی سیەکان وئینفلونزا | 18 | 10 |
| نەخۆشی شەکرە | 9 | 9 |
| خۆ کوشتن | 19 | 5 |
| نەخۆشیە درێژ خایەنەکانی جگەر | 13 | 5 |
| ڕەق بوونی خوێنبەرەکان | 4 | 3 |
| نەخۆشیەکانی گورچیلە | 6 | 4 |
| کوشتن | 13 | 4 |
| کۆی گشتی | 654 | 405 |

1 _ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1016.

## بڕگەی سێیەم : ڕەگەزی نێرینە و هۆکاری مردنی زیاد

ڕێژەی مردن لە پیاوان زیاترە لە ژنان، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیانەی خوارەوە:

یەکەم : ئافرەتان زیاتر گرنگی دەدەن بە چاودێری تەندروستی و سەردانی پزیشك وبنکەکانی تەندروستی زیاتر دەکەن، ئەوەش کاریگەری زۆری هەیە لەسەر کەم بوونی ڕێژەی مردن لە ژنان. ئەو گرنگی دانە بە چاودێری تەندروستی سوودی زۆرە لەمانە:[1]

1 – دەتوانرێ نەخۆشیە درێژ خایەنەکان زووتر دیاری بکرێت پێش ئەوەی بگاتە بارێکی نالەباری چارەسەر نەکراو.

2- کاتی سك پڕی چەند جارێك سەردانی پزیشك دەکات بەمەش زۆر نەخۆشی تر گەر هەبێ دیاری دەکرێت وچارەسەری پێش وەختی بۆ دادەنرێ.

3- گرنگی دان بە چاودێری تەندروستی وا لە ئافرەت دەکات کە ڕابێت(یُعوَّد) لەسەر سەردانی پزیشك بە بەردەوامی وبە شێوەیەکی ڕێك وپێك.

دووەم: ئافرەت کاتێ نەخۆش دەکەوێت چالاکی وکاری ڕۆژانەی کەم دەکاتەوە، لە ماڵ دەکەوێت وسەردانی پزیشك دەکات، بەڵام پیاو زۆربەی واناکات لەبەر زۆری کاری ڕۆژانەی.

سێیەم: هۆکاری بۆماوەیی و هۆرمونی

1- کرۆمۆسۆمی XX لە مێینە بەرگریەکی باش دەبەخشێت دژی نەخۆشیە زگماکیەکان.

2- پەیوەندی نێوان هۆرمونەکانی دایك وکۆرپەلەی مێینە، هەندێ تایبەتمەندی

1– Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1017.

دەبەخشێ بە کۆرپەلەکە، لەوانە: ڕێژەی مردنی مێینە لەناو منداڵدان، نەخۆشیە زگماکیەکان، مردنی ڕاستەوخۆی دوای لەدایکبوون، ئەوانە هەموویان لە کۆرپەلەی مێینە کەمترە لە نێرینە.

**چوارەم:** بە هۆی بوونی ڕێژەیەکی بەرزی هۆرمۆنی ئیسترۆجین، ئاستی کولیسترۆلی چری زۆر زیاد دەکات، ئەوەش هۆکارێکی سەرەکی یە بۆ تووش نەبوون بە نەخۆشی خوێنبەرە ڕەقبوون پێش تەمەنی لە بێ نوێژی کەوتن.

**پێنجەم:** بوونی هەندێك سیفاتی بنەڕەت لە نێرینە وایان لێدەکات زیاتر بەرەو هەندێ جۆری یاری وەرزش وکاری ترسناك بڕۆن لەوانە: لێخوڕینی ئوتومبیل بە خێرایەکی زۆرو شێتانە (السرعة الجنونية)، مەلەوانی لە قوڵایی زۆر، بەکارهێنانی ماددە بێ هۆشکەرەکان و قەدەغە کراوەکان.

**شەشەم:** تێکۆشان وهەوڵدان وملململانێی بەردەوام بۆ گەیشتن بە ئامانج لە پیاوان، وادەکات تووشی زۆر گیروگرفت و باری تەندروستی نالەبار بێت، یان ماوەی نەبێت گرنگی بە تەندروستی خۆی بدات.

**حەوتەم:** تەنگژەکانی کۆمەڵایەتی وڕووداو زیاتر ڕوو لە نێرینە دەکات.

لە شاری هەولێر ژمارەی مێینە زۆر زیاترە لە نێرینە دەگاتە 1/4 بە گوێرەی سەر ژمێری ساڵی 1992، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین ژمارەی ئەو کەسانەی سەردانی نەخۆشخانەی فریاکەوتنیان کردووە لە هەردوو ڕەگەزدا نزیکن لەیەکەوە، ئەوەش مانای ئەوەیە کەوا نێرینە زیاتر تووشی کێشەو کارەسات و بریندار دەبێت لە مێینە،[1] ئەوانەش دەبنە هۆی ئەوەی ڕێژەی مردن لە نێرینە زیاتر بێت، بەمەش ژمارەی مێینە زۆرتر دەبێت بەرامبەر بە نێرینە، هەروەك دەبینین لە زۆربەی زۆری

1ـ فؤاد عثمان، 60 سنة، مدير الإحصاء في محافظة أربيل، مكان المقابلة: مديرية الإحصاء، تاريخ المقابلة: 2004/10/8م.

کۆمەڵگـەکانی جیهـان. خـشتەی ژمـارە 5: ژمـارەی ئـەو کەسـانەی سـەردانی نەخۆشخانەی فریاکەوتنیان کردووە لەساڵی 2004.[1]

| تەمەن | نێرینە | مێینە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| 1-4 ساڵ | 225 | 221 | 446 |
| 5-14 ساڵ | 1322 | 1433 | 2755 |
| 15- 49 ساڵ | 2899 | 3075 | 5974 |
| 50- بەسەرەوە | 2753 | 2981 | 5734 |
| کۆی گشتی | 7199 | 7710 | 14909 |

ڕێژەی مردن لە نێرینە بەرزترە لە گشت قۆناغـەکانی ژیـان و دەگاتـە 2:1 پـاش پیتێنی هێلکە تاوەکو تەمەنی پیری. هەر بۆیە ژمارەی ژنان لە هەموو کۆمەڵگەکانی جیهان لە پیاوان زیاترن.

دکتۆر زکریا إبراهیم دەڵێت: هێزی بـازوی مێینـە، ژمـارەی خڕۆکـە سـوورەکان، توانای هەناسەی کەمترە لە نێرینـە، ئەوانـە وایـان کـردووە کـەوا توانـای ڕاکـردن و وەرزشی توندیان کەمتر بێت وەك هەڵگرتنی کێش وقورسایی وململانێ، واتە لە هیچ وەرزشێك ناتوانن بەربەرەکانی و ململانێی نێرینـە بکـەن، بـەڵام لـە لایـەکی تـرەوە دەبینین ئەو خاڵە لاوازانە بەستراون بە خاڵێکی بەهێز، ئەویش ئەوەیە کاتی هـاتنی نەخۆشیەکی بەربڵاو دەبینین مێینە کـەمتر تـووش دەبـن، هەرچـەندە مێینـە بـاری تەندروستی خۆی کەمێك لار دەبێت بە هۆی بێ نوێـژی وسـك پـڕی. ڕێـژەی مردنـی منداڵ لە نێرینە زیاترە لە مێینە.[2]

1ـــ الدكتور هيمن أحمد عقراوي، 40 سنة، معاون مدير مستشفى الطوارئ، ممارس عـــام، 2004/8/7.

- دارا أكرم سعيد، وطيب طه، مسؤولا شعبة الإحصاء في مستشفى الطوارئ.

2ـــ زكريا إبراهيم، سايكولوجية المرأة ، ص24.

ئەو جیاوازیانەی هەیە لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە لە زۆر بوواردا تاوەکو ئێستا لێکدانەوەو تەفسیرەکی زانستی وڕاستەقینەی بۆ نیە، وا گەمان دەبردرێت کە پەیوەندی زۆری هەبێت بە هۆرمونەکان و باری ژینگە، بۆیە پێویستیمان بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی بەردەوام وپێشکەوتووتر هەیە.[1]

1—*Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1017.*

# بەشی سێ یەم

## جیاوازیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەزکە پەیوەستن بە دەرون و عەقل ودەمارگیریەوە، هەندێك لە نەخۆشیە دەرونیەکان

باسی یەکەم: جیاوازیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەزکە پەیوەستن بە دەرون و عەقل و دەمارگیریەوە

باسی دووەم: هەندێك لە نەخۆشیە دەرونیە باوەکان و نەخۆشیە جەستەییە دەرونیەکان

**دەروازە:**

پێکهاتەی دەرونی ئادەمیزاد زۆر قول وئالۆزە، هەروەها هەندێ زاراوەی کە پەیوەندیی تەواوی هەیە بە دەماخ، وەك: سۆزو ئارەزو خەو بەزەیی و تورەیی و زۆری تر، تاوەکو ئێستا ئادەمیزاد نەیتوانیوە نهێنیەکانی بە ڕاستی و ووردی و تەواوی بزانێ، لەگەڵ پێشکەوتنێکی بەرچاوی زانستی پزیشکی وفیزیاوی وتەکنۆلۆژی. ڕۆژ بە ڕۆژ سەنتەری نوێ لەناو مێشك، هەندێ ووردەکاری لە کارو فەرمانی هەندێ ئەندام، ژمارەیەك هۆرمون وئینزیم دەدۆزرێتەوە، ئەوەش ڕاستی مانای ئەو ئایەتەمان بۆ دیاری دەدات. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: 53. واتە بەڵگەو نیشانەکانمان لەناو بوونەوەرو دەرونیان لە ڕۆژانی داهاتوودا نیشانیان دەدەین تاوەکو بۆیان ڕوون دەبێتەوە ئەوەی بۆمان ناردوون حەق و ڕاستی گومان لێ نەکراوە، ئایا خودای گەورەش بەتەنها بەس نیە بۆ ئەوەی لەسەر هەموو شتێك شاهید بێ؟

پروفیسۆر ئەلیکسیس کاریل دەڵێ: لە ڕاستیدا مرۆڤ تواناو جوهەدێکی زۆری بەکارهێنا بۆ ئەوەی خۆی بناسێ. زانایان (زاناو داناو فەیلەسەف وروحانیەکان وهونەرمەندو شاعیران) لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا خەزێنەو گەنجینەیەکی زانیاری زۆریان کۆکردۆتەوە لە کات وساتە جیاجیاکان وشارستانیە یەك لەدوای یەکەکان، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا تەنها توانیمانە هەندێ لایەنی دیاریکراو لە نەفسی خۆمان تێبگەین، بەڵام ناتوانین لە ئادەمیزاد تێبگەین لە هەموو لایەنەکانیەوە. تەنها زانیومانە کە پێکهاتووە لە چەند پارچەیەك وخۆمان ناومان لێناوە. هەر یەك لە ئێمە لە کۆمەڵێك (موکب) ئەشباح پێکهاتووەو لە ناوەڕاستیەوە ڕاستیەکی نادیار و شاراوە هەیە).[1]

---

1ـ ألیکسیس کاریل، الإنسان ذلك المجهول ، ص33.

هەروەها دەڵێت: ئێمە دەزانین کەوا ئێمە پێکهاتووین لە شانەو ئەندام وشلە، هۆش و بیرو ئەندێشە، بەلام پەیوەندی نێوان دەماخ وشعور تاوەکو ئێستا شاراوەیەو مەتەڵە، پێویستیمان بە زانیاری تەواو هەیە لەسەر کاری خانە دەمارەکان، تاوەکو چ رادەیەك ئیرادە کاریگەری لەسەر جەستەی مرۆڤ هەیە ؟ هەروەها نازانیّ کەوا ئەو سیفەتە بۆماوەیانەی ئادەمیزاد وەری گرتووە لە باوانیەوە تا چ رادەیەك دەگۆریّ بە گۆرانی ژینگە، وەك ماددە کیمیاویەکانی ناو خواردن و کەش وئاوهەواوو باری دەرونی وچۆنیەتی پەروەردە کردنی.[1]

کۆئەندامی دەمار زاڵە بەسەر هەموو کاروکردەوەی مرۆڤ ولە هەمان کاتدا رێکخەری ئەو کاروکردەوانەیە، هەموو هەستە جۆراوجۆرەکانی لەش (دەرەکی و ناوەکی) دەگوازرێنەوە بۆ کۆئەندامی دەمارو لەوێوە ئەو هەستانە شیّ دەکرێنەوەو تەفسیری بۆ دادەنریّ وکاردانەوەی گونجاویش بەگوێرەی ئەو تەفسیرانە دەداتەوە. هەروەها کۆئەندامی دەمار زاڵە بەسەر کۆئەندامی هەناسەو دڵ وئەندامەکانی تر بە هۆی بوونی ناوەندی تایبەت بۆ ئەو ئەندامانە لەناو مێشك.

---

1ـــــ أليكسيس كاريل، الإنسان ذلك المجهول، ص34.

# باسی یەکەم

## جیاوازیەکانی نێوان هەردوو ڕەگەز پەیوەست بە دەروون و عەقل ودەمارگیریەوە

بەندی یەکەم: توانای زانستی وفیکرو بیرکردنەوە،داهێنان، جولەو دژواری، توانای زمانی

برگەی یەکەم: توانستی زانستی وفیکرو بیرکردنەوە

برگەی دووەم: داهێنان

برگەی سێیەم: جولەو دژواری

برگەی چوارەم: توانای زمانی

بەندی دووەم: هەستەکان

برگەی یەکەم: توانای هەستی بیستن وبینین

برگەی دووەم: هەستی بەرکەوتن

برگەی سێیەم: هەستی بۆن کردن

برگەی چوارەم: هەستکردن بە ئازار

بەندی سێیەم: چاودێری ولەخۆگرتن، خۆنەویستە بەرەولاچوون ، متمانە بەخۆ بوون، خووڕەوشت.

برگەی یەکەم: چاودێری ولەخۆگرتن

برگەی دووەم: خۆنەویستە بەرەولاچوون

برگەی سێیەم: متمانە بەخۆ بوون

برگەی چوارەم: خووڕەوشت

جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان هەردوو ڕەگەز لە بواری بیرو هۆش وزیرەکی و ئارەزوو ئاراستەو زۆری تر لە پێکهاتەکانی کەسایەتی مرۆڤ.

لە کاتی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەم، شتێکم بەدی کرد ئەویش ئەوەبوو کەوا زۆربەی پەڕاوەکانی پزیشکی کە لە وولاتانی ڕۆژئاوادا دەرچووە زۆر بە ووردی نەچوونەتە ناو جیاوازیە دەروونی وعەقلیەکانی هەردوو ڕەگەز، هەروەك زۆربەی زانیاریەکانی تر تاوەکو قوتابیانی خوێندنی بالاَو خەڵکانی تر سوودیان لێ وەربگرێت. بەڕای من ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی: یەکەمیان، لەوانە تاوەکو ئێستا نەگەیشتبن بە ڕاستەقینەیەکی زانستی لەو بوارەوە، لەبەر ئالۆزی و ووردی ناوەندەکانی ناو مێشك کارو فەرمانی خانەکان و کاریگەری هۆرمۆنەکان وئینزیمەکانی ناو دەماخ بەگشتی. هۆکاری دووەم، فەلسەفەی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەوەدایە کەوا هەردوو ڕەگەز هیچ جیاوازیەکیان نیەو پێویستە یەکسان بن لە گشت شتێکدا، جا ئەوە بگونجێ لەگەل پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی هەردوو ڕەگەز یان نەگونجێ، بەڵکو گرنگ لای ئەوان ئەوەیە بگەنە ئەو ئامانجە شاراوەی بەدوای ئەو بانگەوازەوەیە. نێرینە چی کرد، مێینە لاسایی بکاتەوەو ڕکەبەری بکات هەرچەندە گەر لەو کارانە سەرکەتووش نەبێت، یان کۆمەڵگە تیایدا سوود مەند نەبێت و خێزان وکۆمەڵگەش هەڵبوەشێتەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا ئەوان تەنها دەیانەوێت ئەو بیرو بۆچوونەی هەیانە بڵاوی بکەنەوە بە هەر شێوەیەك بێت، بگەنە ئەو ئامانجانەی دیاریان کردووە و بەرنامە ڕێژیان بۆ کردووە. جا ئەگەر ئەوان ئەو جیاوازیانە بخەنە ڕوو بە شێوەیەکی زەق و لە پەڕاوەکانی پزیشکی بلاَوی بکەنەوە ئەوا پێچەوانەی بانگەوازەکانیانە، کەوا چەندەها ساڵە بۆی هەوڵ دەدەن و بەمەش ئامانجەکانیان ناهێتە دی بەو شێوەی خۆیان دەیانەوێت.

لەو باسەماندا هەندێ لێکۆلینەوەمان باس کردو ئامارەش بە هەندێکی تر دەکەین لەو بوارەوە، بەڵام پێویستمان بە زۆری تر هەیە تاوەکو بە تێرو تەسەلی لە ڕاستیەکان بگەین.

لەو بەشەدا بەپێی توانا باسی ئەو جیاوازیە دەرونی وعەقلیانە دەکەین لە نێوان هەردوو ڕەگەز هەیە، تاوەکو بەرچاویان ڕوون بێت وڕاستیەکان بزانن وهەریەکیان شوێن وجێگەی کاری خۆی بزانێ کە گونجاوە لەگەل باری جەستەیی و دەرونی، تاوەکو هەردوولا ڕۆلی خۆیان بگێرن لە ژیان وپێکەوەژیان بە سەرکەوتوویی تەواو بۆ خزمەت کردنی کۆمەلگە، بێ ئەوەی کاردانەوەی نیگەتیفی هەبێ لەسەرپێکهاتەی جەستەیی ودەرونی هەرتاکێك، هەروەها لەسەر خێزان و کۆمەلگە.

## بەندی یەکەم: توانــای زانــستی هــزری (فیکــر وبیرکردنــەوە)، داهێنــان، جولەودژواری، توانای زمانی

### برگەی یەکەم: توانای زانستی و فیکرو بیرکردنەوە (القدرات العلمية والفكرية)

ئەو باسە بریتی یە لە باسە ئالۆزەکان، کە تاوەکو ئێستا زانایان نەیان توانیوە زۆربەی لایەنە شاراوەکانی بزانن، هەر بۆیە زانیاری لەو بارەیەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە. ئەو زانست وبیرو هۆشەی ئادەمیزاد کە توانیویەتی چەندەها شارستانیەت دروست بکات و چەندەها شارستانیەت یەکتری لەناو ببەن بە دانانی پیلانی رامیاری وسەربازی دژی یەکتری وتوانیویەتی چەندەها جیهانی نوێ بدۆزێتەوە لە ناو ئەو بوونەوەرە فراوانە، هەنگاوی زۆر گرنگی ناوە لە بوارە زانستە جیاجیاکان بەگشتی. ئەو زانست وبیرو هۆشەی ئادەمیزاد کە توانیویەتی ئەو هەموو گۆرانکاریانە لەسەر زەوی بهێنێتە دی بێ ئەوەی داوای برێکی چالاکی و ووزەی زۆربکات لە ئادەمیزاد، بەڵکو بۆ ئەو هەموو کارە گرنگانەی تەنها پێویستی بە برێك لە ووزەو چالاکی هەیە بە ئەندازەی ئەو برە ووزەی پێویستە بۆ جولانەوەی یەك ماسولکە بۆ ئەنجامدانی کارێکی ئاسایی وسادە. هەر بۆیە زانایان سەریان سوورماوە لەکاری مێشك و بیرو هۆش وعەقل وتوانای زانستی مرۆڤ.[1]

کۆکردنەوەو داکردنی زانیاری(بیرەوەری) بەشێکە لە فێربوون (التعلّم)، ئەو هۆرمونانەی ئەو کاروکردەوانە رێکدەخەن بریتین لە هۆرمونی پەستان

---

1ـ زیرەکی(الذكاء): هەموو چالاکیەکی عەقلی رەمەعریفەتە کە دوو هۆکار لەخۆ دەگرێت، یەکەمیان: هۆکارێکی گشتی کە دادەنرێت بە هاوبەشە هۆکار لە نێوان گشت لایەنەکانی چالاکی عەقلی ومەعریفی (النشاط العقلي والمعرفي)، دووەمیان: هۆکارێکی تایبەتە بە بوونی توانای تایبەت وەك توانای زمانەوانی وبیرکاری و داهێنان ...هتد. هەرچەندە زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکرێت کە زیرەکی هۆکارێکی بۆماوەیە، بەلام لێکۆلینەوەکانی تاقیگەیی (الدراسات التجريبية) دەری خستووە ئەوانەی رێژەی زیرەکیان زیاترە دەتوانن زیاتر سوود وەربگرن لەو هەلانەی بۆیان دەرەخسێت بۆ خوێندن و وەرگرتنی پسپۆریی، جینەکانی بۆماوەیی ئاستی زیرەکایەتی دەست نیشان ناکات بەلکو پسپۆریی و ژینگەو هۆکاری شارستانیەت کاریگەری زۆری هەیە لەسەر رێژەی زیرەکی. السامرائي، هاشم جاسم، المدخل في علم النفس، ص118.

بزوێن(Vasopressin) وهۆرمونی ماندەری خانەی ڕەشیەتی (Melanocyte Stimulating Hormone- MSH)، ئەو هۆرمونەی دوایی MSH بریتی یە لە ماندەرێك كار دەكاتە سەر هەندێ خانەی تایبەتی ناو چینی ژێرەوەی پێستە تاوەكو ماددەیەكی ڕەش دەربدات بەناوی میلانین، كە ڕەنگی پێستە ڕەشتر دەكات ولە هەمان كاتیش بەرگری پێستە زیاد دەكات دژی تیشكە زیان بەخشەكانی خۆر بە تایبەتی لە ناوچە گەرمەكانی ئەفریقیا. ئەو هۆرمونە كاریگەری هەیە لەسەرچاو بۆ دۆزینەوەو ناسینەوەی خاڵە ڕەشە وردو لێك نزیكەكان كاتی تەماشا كردن، كاریگەری هەیە لەسەر ناوەندە جیاجیاكانی ئازار، لە نێوان هەردوو ڕەگەزیش جیاوازی هەیە، بەڵام چۆنیەتی ئەم كارە نەزانراوە. لەم چەند ساڵەی دوایی زانایان هۆكارێكی تریان دۆزیەوە بەناوی مێشكە هۆرمون (الدماغین- Encephaline)، هەروەها هۆرمونەكانی پیپدیدیەكان كە هەردووكیان كاردەكەنە سەر فێربوون وبیركردنەوەو ناوەندەكانی ئێش وئازار.[1]

دەماخ لە دوو نیوە پێكهاتووە وهەرلایەكیشیان كاروفەرمانی جیاوازە، نیوەی چەپ بەرپرسیارە لە بیركردنەوەی عەقلانی (التفكیـــر العقلانـــي) ، وەك: لۆجیك و گونجاوی (المنطق)، ڕاستی ودروستی(الصواب)، گەیشتنە دەرەنجام(الاســـتنتاج) ، شی كردنەوە (التحلیل). بەڵام نیوەی لای ڕاست پەیوەندی دارە بە هەستی سۆزو بەزەیی(المشاعر العاطفي)، وەك: زانستەكاتی بینین (المعلومات البصرية)، هەست كردن بە هەستە جیاجیاكان (الإدراك الحـــسي)، هەست بزوێن بەرامبەر شتە شاراوەكان (الحدس)، ئەندێشە (الخیال).

هەروەك دەركەوتووە كەوا نیوەی چەپ لە پیاوان پێشكەوتووترە، بەڵام هەردوو نیوە یەكسان وهاوسەنگن لە ئافرەتان، دەتوانن هەردوو نیوە بەكار بهێنن لە یەك كاتدا، ئەوەش كارێكە پیاوان ناتوانن ئەنجامی بدەن بەئاسانی، هەر بۆیە دەبینین توانای ئافرەتان بۆ داكردنی سۆزو بەزەیی، هەڵچوون، خێرایی وەڵام دانەوەی

1 – Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 104, 228, 1474.

کاریگەرەکان، ئارەزووی گۆرانکاری بەردەوام، توانای وەرگرتنی هەست بە ئامازەکردن(الایحاء) زۆر زیاترە لە پیاو دەگاتە رێژەی 10-15 ٪، ئەمەش وای کردووە کرداری ڕیکخەری مێشك لە ئافرەتان باشتربێ لە پیاوان.[1]

زۆربەی زانایانی توێکاری وفسیۆلۆژی یەکدەنگن لە سەر ئەوەی دەماخی پیاو بۆتە بەش بەش لە ڕووی کارکردنەوە هەربۆیەش تەنها یەك کار ئەنجام دەدات لە یەك کاتدا، ناتوانێ چەند کارێك لە یەك کاتدا ئەنجام بدات، بەلام ئافرەت دەتوانێت هەردوو لا مێشکی لەیەك کاتدا بەکاربهێنێ وکارەکانیان لێك گرێ بدات و بەیەکەوەیان ببەستێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ ماندوو بوون و ووزە بەفیرۆ دانی تیابێ. لە لایەنە باش و پۆزەتیڤەکانی ئەو تایبەتمەندیە ئەوەیە کەوا ئافرەت توانای ئەنجامدانی چەند کارێکی هەیە لە یەك کاتدا، وەك: قسەکردن بە تەلەفۆن، ئامادەکردنی خواردن، چاودێری منداڵەکەی کە لەتەنیشتیەوە وانە دەخوێنێ، لە کاتی هەڵچوون وئاژاوەدا دەبینین دەگرێی وجوێن دەدات وپارێزگاری وبەرگری لە خۆشی دەکات لە یەك کاتدا، بەڵام لایەنە سەلبی ونیگەتیڤی ئەم دیاردەیە ئەوەیە زۆر جار لە ناوەراستی ڕێگە خۆی لەبیر دەچێت و وون دەبێت ونازانێ بەتەواوەتی ویەقینی چی ڕوویداوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەو هەندێ هۆکاری تری دەروونی وای کردووە هەندێ لە زانایان شایەدی دوو ئافرەت بە شایەدی یەك پیاو بڕیار بدەن لە هەندێ بارو دۆخی تایبەتدا وەك سزاکان ومامەڵەی مالی (الحدود و المعاملات المالية).[2] بە درێژی لەو باسانە دەدوێین لە بەرگی دووەم.

هەروەها دەبینین کەوا نێرینەی گەنج و پیاوان کە بواری میکانیکی و لێخوڕینی ئۆتۆمبیل و توانای بیرکاری ودیزاینی تەلارو تاقیکردنەوەکانی بینینی زۆر لە پێش ئافرەتانن، بە گشتی نێرینە دەستی گرتووە بەسەر زۆربەی بوارەکانی زانستی و داهێنان وفەلسەفە، هەرە زۆرینەی بلیمەتەکان (العباقرة) لە ڕەگەزی نێرینەن،

1ـ الخشت، محمد عثمان، وليس الذكر كالأنثى، ص60-62. والقصاب، الفروق، ص151.
2ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق ، ص164-180.

چونكە زۆربەی چالاكی نێرینە بەگشتی جولەو داهێنانە.[1]

لەلایەكی تـرەوە مێینـە توانـای ئـەوەیان هەیـە، كـە خێراتـر شـتە لێكچووەكان بناسـنەوە، لـە ڕووی زمانەوانیـەوە كراوەتـرن، لـە بیركردنـەوەی كـورت خایـەن، ناسـینەوەی دیاردەكـانی ڕێگـە، هەنـدێ كـاری دەسـتی وورد باشـترو خێراتـرن لـە نێرینـە. ئەوانـەش ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەكاتـەوە كـەوا هۆرمونـەكان كاریگـەری سەرەكیان هەیە لەسەر جەستەو دەرون.[2]

## بڕگەی دووەم: داهێنان (الإبداع)

داهێنان چی یە؟ مامۆستا جاسم كریم وەلامی ئەم پرسیارە دەداتـەوەو دەڵێـت: بریتیە لە وەلامدانەوەی دەمارە خانەكانە بۆ هەستە جیاوازەكان كە پێـشتر لـە نـاو مێشك جێگیر بوونـەو چەسـپاون، لە ئـەنجامی تـاوتۆ كـردن وپاككردنـەوەو گـۆڕین وگونجاندن وپێكەوە لكانی زانیاریـەكان لـە نـاو مێشك، وەك زانیـاری نـوێ خۆیـان دەنـوێنن، كـاتێ ئـەو وەلامانـە لـە مێـشكەوە دەنێـردرێن بـۆ ئەندامـە پەیوەنـدی دارەكانی لەش دەبێتـە سـلوكی داهێنـەر. سـلوكی داهێنـەر بـۆ ئـەو كەسانەیە كـە ئارەزوویـان بـەلای زانـست وهونـەرەو گرنگـی پێـدەدەن، فكـری داهێنـەر بـۆ ئـەو كەسانەیە كە گرنگی بە لایەنی ئەدەب و فەلسەفەوە دەدەن.[3]

هەرچەندە زۆر لە كچان لە بواری بەدەست هێنانی پلەی زانـستی لـە پێـشەوەی كوڕەكانن، بەلام بەرهـەمی ئافرەتـان لـە بـواری داهێنـان ودۆزینـەوەی زانـستی زۆر كەمە بەبەراورد لەگـەل پیاوانـدا. زانایـان ئـەو دیاردەیـان گێڕاوەتـەوە بـۆ ئـەوەی: ئافرەتان ناسراون بە كەمی خۆڕاگری، كـەمی توانـای لەسـەر تونـد كردنـی جلـەوی نەفسی خۆی، بەردەوام نەبوونی لەسەر چالاكیەكانی كە ئەنجامی داوە. ئەمانە وای كـردووە كـەوا هەنـدێ لـە زانایـان بڵێن: كـەوا كـۆنترۆلی ئافرەتـان لەسـەر جیهـانی

1ــ سیرل بیرت وآخرون، كیف یعمل العقل ،ص156. والقصاب، الفروق، ص164–180.
2ــ القصاب، الفروق، ص164–180.
3ــ جاسم كریم، رسالة في تفسیر سلوك الإنسان، ص55.

دەرەوە زۆر دیاری كراوەو(محدد) بەرفراوان نیە. چونكە لە توانای نیە پرۆژەكانی ئەنجام بدات بە گیانێكی چەسپاوو توندو تۆڵ وبەردەوام.[1]

هەندێكی تر لەزانایان وەك هیمانز "Heymans" دەڵێ: بیر كردنەوەی ڕووت و سارد بە شێوەیەكی گشتی ئافرەتان دڵیان پێی خۆش نیە. بەڵكو ئارەزوو و ڕەزامەندی بەوەیە كە پێداویستیەكانی ویژدانی وسۆزە سروشتیەكەی تێر بكرێت. نازانین تاوەكو چ ڕاددەیەك بڵێین كەوا سۆزو عاتیفە لە تایبەتمەندیەكانی دووەمی ئافرەتانە بە شێوەیەكی گشتی ولە ڕاستیش دوور نابین گەر بڵێین كەوا دایكایەتی وای كردووە ئافرەت هەردەم بە سۆزتر بن لە پیاوان وخێراتر وەڵامی كاریگەرەكانی ویژدانی بدەنەوە.[2]

ئافرەتان هەر لە پێكهاتەی عەقلیانەوە ناسراون بە سیمەتی قەبولكردن وقابل بوون (سمة التقبلية)، بە شێوەیەك ئەوان بەلایەنی وەرگرتنی زانیاری وزانست ، هەروەها بە لایەنی شێوەسازی وپێكهێناندا دەڕۆن (التشكيل و التكوين) – هەروەك ئاماژەمان پێكرد لە چالاكی هێلكەی ئافرەت– وئارەزوویان بە لای داهێنان و دۆزینەوەدا ناڕوات هەروەك لە پیاودا بەدی دەكرێت.

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كەوا بۆچی ئیسلام ئەركی دایكایەتی(الأمومـــة) بە ئافرەت سپاردووە، هەروەها پەروەردەو لە ئامێزگرتنی (الحضانة) تایبەت كردووە بە ئافرەت.

## بڕگەی سێیەم: جوڵەو دژواری (الحركة والعدوانية)

كاتی ڕوودانی كێشەیەك لە نێوان دوو مرۆڤدا، نێرینە لە لایەنی بیولوجیەوە زیاتر بەلای هۆكاری جوڵەدا دەڕوات، وەك دژایەتی جەستەیی ولێدان (الاعتـــداء الجسماني)، بەلام مێینە زیاتر بەلای وەڵامدانەوەی هەیە بە قسە پێ ووتن. واتە نێرینە زیاتر بەلای شەڕو ڕووبەڕو بوونەوەن (الـــشجار) ومێینەش بەلای

1 ــ زكريا إبراهيم، سايكولوجية المرأة ، ص22.
2ــ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص162. والقصاب، الفروق، ص29.

هەراودەنگەدەنگ(الثرثرة). لەو جۆرە بارودۆخانەدا مێینە هێلكاری دەم وچاوی توڕە بوونی پێوە دیارەدەبێت و ڕەنگی دەگۆڕێ، بەڵام كەم جار هەیە هێرش بكات و لێدان بەكاربهێنێ، ئەو پاڵەپەستۆیە دەرونیەی لەناو ناخیەتی دەری دەبڕێ بە شێوەی قسە پێ ووتن. لەبەر ئەوەی ئافرەت توانای بەكارهێنانی هەردوو لای مێشكی هەیە لەیەك كاتدا بۆیە دەتوانێ لەو كاتانەدا قسە بكات و بیریش بكاتەوە بۆ چارەسەر، بەڵام نێرینە كاتی ڕووبەڕوی ئەو كێشانە دەبێت بە ووردی وخێرایی لە هەموو لایەنەكانی كێشەكە دەكۆڵێتەوەو هەموو توانای بەكاردەهێنێ بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو، پێویستی بە قسە كردن نیە لەوكاتانەدا، واتە بیردەكاتەوە بەبێ ئەوەی قسە بكات، چونكە مێشكی نێرینە ناتوانێ زیاتر لەیەك كار ئەنجام بدات لەیەك كاتدا. ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ كاریگەری بوونی سیفەتی دژواریەی لە هۆرمونی تیستۆسیتیرۆنی نێرینەو بوونی سیفەتی هێمنكەرەوە لە هۆرمونەكانی مێینە ئیسترۆجین و پرۆجیسترۆن.[1]

لە لێكۆلینەوەیەك كە ماك بای وجاكلین (Maccby&Jacklin) لە ساڵی 1974 كردوویانە بۆیان دەركەوت كەوا: نێرینە زۆر لە مێینە دژوارترن، هەر بۆیە باوك و دایك پێداچوونەوەو سەرزەنشتی منداڵە نێرینەكان زیاتر دەكەن، پێویستیان بە زیاتر چاودێری توند هەیە لەلایەن باوك ودایكیانەوە.[2]

لە لێكۆلینەوەیەك كە لوریا و روبین(Lurian&Rubin) لە ساڵی 1974 كردیان بۆیان دەركەوت كەوا نێرینە بەم سیفەتە بۆماوەیانە ناسرلوە: (توندو ڕەق، زبر، بەهێز، گەورە لە بارستەو كێش وڕوكاری دەرەوە). بەڵام مێینە ناسراوە بە: (ناسك، نەرم ونیان، هەستیار، ڕوكار ئاسوودە). أن الذكر يتصف بالصفات الآتية:(إنه شديد، غليظ، قوي، كبير، عظيم الهيأة والمعالم، وأما الأنثى: فرقيقة، مرهفة الحس، مريحة الهيأة، وغير قاسية).[3]

1ـ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص162. والقصاب، الفروق، ص203.
2ـ Rital.A et al . Hilgard introduction to Psychology. P: 97.
3ـ Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 97.

لە لێکۆڵینەوەیەکی تر کە ئیرن (Eran) لە ساڵی 1987 کردوویەتی بۆی دەرکەوت کەوا سیفەتی دژواری پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ئاستی هۆرمونی تیستۆستیرون لە ناو خوێن. ئەو لێکۆڵینەوە لە سەر 4400 نێرینە کرا ودەرکەوت کەوا: هەرکاتێك ئاستی تیستۆستیرون بەرزکرایەوە سیفەتی دژواریەتی ولادان لە یاساو ڕێساکانی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات بە تایبەتی لەو کوڕە گەنجانەی کەوا پێشتر زۆر سەرزەنشت کراون لەلایەن باوکیانەوە لە تەمەنی منداڵی.[1]

دەمارگیرو سەرپێچی ویاخی بوون و کێشە نانەوە زیاتر لە نێرینەیە، بە پێچەوانەوە مێینە ئاسوودەترن لە سلوك، زۆر لە کێشەکان لە ناخیان دەهێڵنەوە، هەربۆیە زیاتر تووشی کێشەکانی دەرونی دەبن وەك: ترس و پەشێوی ودامان و خەمۆکی (کالخوف و القلق و الاکتئاب).[2]

هەروەها لەبەر بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە هۆرمونی ئەندرۆجین لە نێرینە دەبینین زیاتر ئارەزووی یاری توندو زبرو ململانێ و بەربەرەکانی هەیە، هەروەك هەردوو لێکۆلەرەوەأ.أ.أهاردت" لە زانکۆی کولومبیاو ج.أ.رینش لە دەزگای(مـن کنزی) سەلمانیان کەوا: ئەو کچانەی برێکی زۆر هۆرمونی نێرینە لە ئەندرۆجین وەردەگرن سیفەتی نێرینەو دژایەتیان بە ئاشکرا پێوە دیاردەدات، هەروەك خۆیان (کچەکان) ئاماژەیان پێوە کرد بوو لەو فۆرمانەی پێیان درابوو، یان لەو چاوپێکەوتنانەی کرابوو لەگەل دایك وباوك، یان مامۆستاکانیان لەو قوتابخانەو زانکۆیانەی کە لێکولینەوەکەی تیادا ئەنجام درابوو.[3]

لە ئەنجامی ئەو لێکولینەوانە بۆمان دەردەکەوێت کەوا: دژایەتی ودژواری سیفەتەکی نەگۆرە وجێگیرە لە نێرینە و زالە بەسەریەوە. هەرچەندە هۆکاری دەرەکی وەك: ژینگەو کۆمەڵایەتی ورۆشنبیری کاریگەری هەیە لەسەر ئەو سیفەتە بەڵام هەرچۆنێك بێت هۆکاری بۆماوەیی و هۆرمونی زاڵە بە شیوەیەکی گشتی.

---

1 — *Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 399-401.*

2 — القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق، ص161-162.

3 — القصاب،عبد اللطيف ياسين،الفروق،ص155.وسيرل بيرت،كيف يعمل العقل،ص162.

### بڕگەی چوارەم: توانای زمانی- دواندن (القدرة الكلامية)

مێینە پێش نێرینەو جوانتر فێری قسەكردن دەبێت، بەردەوام مێینە لە پێشەنگ دایە لە هونەرەكانی زمانەوانی وەك حینجە كردن (هجاء الكلمات) و دانانی خاڵ و فاریزە بۆ ڕوونكردنەوەی مانای ڕستەكان، هەروەها لە سووكی دەربڕین (طلاقـة التعبير). پێشكەوتن لە دواندن مانای ئەوەنیە پێشكەوتنی عەقل وبیرە، بەڵكو هۆكاری دەگەڕێتەوە بۆئەوەی كەوا ئەو ناوەندی(المركز) ناو مێشك كە پەیوەستە بە دواندن لە نیوەی دەماخی چەپدایە لە نێرینە، بەڵام لە مێینە دابەش بووە لە هەردوولای دەماخیداو كاری دەكرێتە سەر (يتأثر) بە هۆی سۆزو لۆجیكەوە لەیەك كاتدا. هۆكاری ئەو پێشكەوتنە زمانی دەگێڕنەوە بۆ كاریگەری هۆرمۆنی مێینە ئیستروجین.

ئارەزووی مێینە بەلای دواندن وزمانەوە بە شێوەیەكی خێرا گەشە دەكات، لەوانەشە بەهۆی زیاتر گرنگی دانی دایكەكانەوە بێت بە كچەكانیان لەوبارەوەیە (بەڵام ئەوە بەبێ مەبەستە و خۆنەویستە)، هەروەك دەبینین دایكان قسە لەگەڵ كچەكانیان زیاتر دەكەن نەوەك كوڕەكانیان. حیكمەت لەو جیاوازیە ئەوەیە كەوا ئەو دایكە پێویستە منداڵەكانی فێری زمانی دایك بكات(لغــة الأم)، ئەو كچەش گەورە دەبێت ومنداڵی دەبێت هەمان ئەركی لەسەرە، هەروەها لەبەر ئەوەیە ئافرەت زیاتر گرنگی دەدات بە پەروەردەكردن وئاراستە كردن وپەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكان و پێگەیاندنی منداڵ.[1]

### بەندی دووەم: هەستەكان (الحواس)

هەستە جیاجیاكانی لەشی مرۆڤ وەك دەروازەیەك وایە كەوا جیهانی سروشتی دەگوازێتەوە بۆ ناو لەش، هەر بۆیە ڕەوشت وسیفەتی هەركەسێك تا ڕاددەیەك پەیوەستە بەو دەوروبەرەی كە تیایدا دەژیت، مێشك گەشەو پێكهاتنی لەسەر ئەو نامە دەرەكیانە بەندە كە بەهۆی هەستەكانەوە بۆی دەڕوات. هەستەكان دەروازەی

---

1ـ القصاب، الفروق ، ص235. وسيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص160.

کراوەن و ڕاستەوخۆ فەرمان دەگوازنەوە بۆ ناو مێشك، کەواتە بەشێکی گرنگن لە لەشمان پێویستە گرنگی پێ بدەین.

هەستەکان بریتین لە میکانیزمی گۆڕانی ووزەی بزوێنەر (المثیـرات) بۆ ووزەی دەماری وئەوانیش بریتین لە : هەستی بیستن وبینین و بۆن کردن وتام وچێژ و بەرکەوتن و جولەو لەنگەرگرتن.[1]

## بڕگەی یەکەم: توانای بیستن وبینین (المقدرة السمعیة والبصریة)

هەردوو هەستی بیستن وبینین دوو هۆکاری زۆر گرنگن بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بتوانی بە هۆیانەوە پەیوەندی بکات بە دەوروبەرو جیهانی دەرەوە بە گشتی، بەهۆی ئەوانەوە شتە هەست پێکراوەکان وەردەگرێت (یتلقی المـدرکات) وجیایان دەکاتەوەو ئاشناییان لەگەڵدا پەیدا دەکات.

لە باری ئاساییدا گوێچکەی مرۆڤ توانای بیستنی (Hearing Threshold) لە نێوان لەرەلەری 250 تاوەکو 8 هرتز، توانای بینینی شەپۆلی ڕووناکی نێوان 400-700 نانۆ متری هەیە.

لە لێکۆلینەوەیێك کە لە زانکۆی سەلاحەددین کراوە لە ساڵی 2004 دا، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کەوا توانای بیستن لە ئافرەتان زیاترە لە پیاوان، تەنها لە چەند لەرەلەرێك نەبێت، 250، 500، 8000 هرتز.[2]

لە چەند لێکۆڵینەوەیەکی تر کە لە ئەمەریکا کراوە لە نێوان ساڵانی 1963-2000 دەرکەوتووە کەوا وەڵامدانەوەی ئافرەت بۆ بزوێنەرە دەنگیەکان پێشکەوتوو ترو خێراترە لە پیاوان لە چەند لەرەلەری جیادا.[3]

---

1ـ طلعت منصور وآخرون، أسس علم نفس العام، ص484.

2ـ روناك طاهر علي، دراسة تحدید الحد السمعي الطبیعي لأهالي كردستان/ العراق، رسالة ماجستیر، مخطوط، جامعة صلاح الدین- كلیة الطب وكلیة العلوم، 1424هـ/2004م، ص2.

3ـ روناك طاهر علي، دراسة تحدید الحد السمعي الطبیعي لأهـالي كردسـتان/ العـراق، ص68.

لە هەموو تەمەنەکاندا مێینە وەڵامی بزوێنەرە دەنگیەکان، جیاکردنەوەی ودەنگەکان، پۆلێن کردنیان، دیاری کردنی شوێنەکانیان پێشکەوتووترو خێراتر دەداتەوە. لەگەڵ ئەو خێرا وەڵامدانەوەی بزوێنەرە دەنگیەکان ئافرەت دەتوانێ بەردەوام قسە بکات وبەدوای قسەکانی بڕوات ولەهەمان کاتیشدا دەتوانی تیشکی چڕ بخاتە سەر وێنەو شێوە وسەیر کردنی بەرامبەری. بەڵام نێرینە زیاتر وەڵامی بزوێنەرە بینینەکان دەداتەوە و زیاتر بە بزوێنەرە بینینەکان پەیوەست دەبن وەك بینینی فلیمە تەلەفزیونیەکان ، هەربۆیە پێشکەوتوون لە جیاکردنەوەی شێوە و ئاکارەکان(الأشكال و الهيئات).[1]

لەو بارەیەوە دکتۆر عبد اللطيف یاسین دەڵێت: پیاوان تێڕوانینی جوانیان کەمە، چاو دەپۆشن لەو کەل وپەلانەی کە بڵاوبوونەتەوە لە دەوروبەریان، بەڵام ئافرەتان بە پێچەوانەوە زۆر چڕی دەخەنە سەر هەموو ئەو شتانەی لە دەورو بەریان دانراوەو لە بچوك وگەورەی، واتە تەماشاکردنی ئافرەت بۆ دەوروبەر زۆر واقیعی ترە. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا ئافرەت هەست بە ڕۆلی سەرەکی خۆی دەکات کە خۆی دەنوێنێ لە بەرپرسیەتی ناوماڵ و خێزان وهێمنی ئارامی ورێك وپێکی کەل وپەلەکانی.[2]

## بڕگەی دووەم : هەستی بەرکەوتن (حاسة اللمس)

پێستی مرۆڤی ئاسایی نزیکەی 3.5 ملیون شوێنی پێشوازی هەستی هەیە، لەوانە 2.8 ملیون تایبەتە بە هەست کردن بە ئازارو ئەوی تریش بۆ هەستی بەرکەوتن. ئەستوری پیستە لە نێوان 0.05 سم – 0.3 سم، پێستەی پیاو ئەستور ترە بە ڕێژەی15٪، بەستەرە شانەی پیاو بەهێزترو توندترە لەوەی ژنان.[3] تەنکی و

1ـ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص157.
- *Rital. A et al . Hilgard introduction to Psychology. P: 124, 138, 404.*
2ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق، ص238-239.
*3_ Gray AT& Kevin TP. Anatomy& Physiology. P: 160 .*

نەرمی وناسکی پێستەی ژنان هاوڕێك وگونجاوە لەگەڵ سیفاتی مێینە- ژنایەتی (الأنوثة) وخۆشەویستی بۆ جوانی وخۆ پۆشتەکردن.

پێستەی ژنان تەنك وناسك ونەرمترە بۆیە هەستی زیاترە. بە هۆکاری دەرەکی وەك شەکەتی وماندوبوون، پاڵەپەستۆی دەرونی، کەم خەوی، خەم وپەژارە زیاتر دەشێوێ وپیرێوەی دیارە دەبێت.[1] بەرامبەر ئەوەش پێستەی نێرینە لەبەر بوونی هۆرمونی تیستۆستیرون، کە هۆکاری زیاد دەرکەوتنی مووی پێستەیەو، بزوێنەرو هاندەری دەردانی چەوری وئارەقەیە، وا دەکات هەردەم پێستەی نێرینە تەڕو چالاك وله گەشە دابێت، دیاردەی گەنجیەتی زیاتر پێوە دیار بێت.[2]

تیشکی سەروی وەنەوشەیی کاریگەری سەلبی نزیکی هەیە لەسەر پێستە وەك: رۆژ بردن، سووتانە، هەڵدانی پێستە، پشێوی لە دروستکردنی ڤیتامین D، کەمکردنەوەی کرداری بەرگری پێستە. کارگەریە درێژخایەنەکان وەك: زبریوون و ئەستوربوونی پێستە، دروست بوونی شێرپەنجە.[3] لەبەر ئەوەی پێستەی ئافرەت تەنکترە، زیاتر کاریگەری ئەو تیشکە سەروی بنەوشەییەی پێوە دیارە، هەرچەندە گەر بڕی بەرکەوتنەکە کەمیش بێت. هەربۆیەش ڕێژەی نەخۆشیەکانی پێستە لە ئافرەتان زیاترە لە پیاوان بەتایبەتی لە شوێنە گەرمەکان.[4]

### بڕگەی سێیەم: هەستی بۆنکردن (حاسة الشم)

لە لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی کە کاین(Cain) لە ساڵی 1988 لە ئەمەریکا کردوویەتی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێت: ئادەمیزادی دروست دەتوانێ 40000-10000 جۆری بۆن، بۆن بکات وجیایان بکاتەوە، توانای ئافرەت بۆ ئەم جیاکردنەوە خێراترو بەهێزترە لە پیاو، بەلام پیاو ووردترن لە جیاکردنەوەی

---

1ــ سیرل بیرت، کیف یعمل العقل، ص157. و القصاب، الفروق، ص241.

2 — *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1362.*

3ــ صالح داود، الوجیز في علم الأمراض الجلدیة، ص35.

4ــ المصدر نفسه، ص118-119.

سیفەتی ئەو بۆنانە.[1] ئەو زیادە هەستەی ئافرەت بۆ بۆن کردن دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی هۆرمونی ئیستروجینی ناو خوێن.[2]

## بڕگەی چوارەم: هەستکردن بە ئازار (الألم)

زانایان گەیشتنە ئەوەی سێ ناوەند لەناو دەماخ و درکە مۆخدا کە پەیوەستن بە ئازاری قوڵ و ڕوکەش، ئازاری کورت ودرێژخایەن. ناوەندەکانیش ئەمانەن:[3]

1- ناوەندی جۆگەی دەورەدراوی خاکی دەکەوێتە ناو دەماخی ناوەڕاست (مركز قناة المحيط السنجابي- Periaqueductal gray).

2- ناوەندی ناوەڕاستی سکوڵەی دەنوکی (مركز المتوسط البطيني المنقاري- Rostral ventromedial ) دەکەوێتە ناو لاکێشە دەماخ.

3- ناوەندێکی تر دەکەوێتە چینی دەرەوەی قۆچە پشتی دڕکە پەتکە (القرن الظهري- Dorsal horn).

توانستی کۆسپەی ئازار(عتبة الألم- Pain threshold)، بەرکەوتن لە ئافرەتان نزمترە لە پیاوان، بەمانای ئەوەی کەوا ئافرەتان زیاتر هەست بە ئازار وهەستی بەرکەوتن دەکەن، ئەو سیفەتەش هەر لە تەمەنی کۆرپەوە لەگەڵ ڕەگەزی مێینەدا هاتووە. هەربۆیە مێینە لە تەمەنی منداڵی وپێگەیشتوویی کاردانەوەی بۆ خوراندنی پێستەو دەست لێدان زیاترە، وەك لە کاتی خۆشووتن، یان بەرکەوتنی تەوژمەکی کارەبای نزم. بە شێوەیەکی گشتی نێرینە زیاتر بەرگەی ئێش وئازار دەگرێت لە مێینە. یەکێك لە خاڵە ڕۆزەتیڤەکانی ئەو جیاوازیەش ئەوەیە کەوا ئافرەتان زووتر بەدەنگ ئازارەکانیان دەچن وسەردانی پزیشك دەکەن وزووتر نەخۆشیەکەیان چارەسەر دەکرێت. لەلایەکی ترەوە ئافرەت بەرگەی ئازاری

1_ *Rital.A et al ,Hilgard introduction to Psychology. P: 144-150.*

2_ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص157.

3_ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1479.*

درێژخایەنی زیاترە لە پیاوان بە هۆی بوونی خیبرەیەکی زۆری ئازارەکانی بێ نوێژی و سك پڕی ومنداڵبوون .[1]

زانایانی دەروونناسی دەڵێن: جێی گومان نیە کەوا مێینە توانای بەرگەی ئازارە درێژ خایەنەکانی زۆر زیاترە لە نێرینە هەروەك دەبینین لە سیفەتی ماشوزی[2]. ئەو بەرگە گرتنەی مێینە تەنها لە کاتی سك پڕی ومنداڵبوون نیە، بەڵکو لە زۆر بۆنەی ترەوە دەبینین وەك لە کاتەکانی شەڕوشۆڕ. لە وانەیە ئەو توانایەی ئافرەت بۆ ئەو بەرگە گرتنە پەیوەست بێت بە لایەنی بایولوژی خودی ئافرەت، یان لەوانەیە شتێکی مەعنەوی بێت، جا هەریەك بێت لەو دوو هۆیە ئەو بەرگەگرتنەی ئافرەت بۆتە شتێکی دامەزراو ڕاستەقینەو واقیع. هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان خۆیان بەخت دەکەن لە پێناوی هەندێ خزمەت گوزاری کۆمەڵایەتی وەکو خزمەتکردنی برینداران لە کاتی شەڕدا، واتە خزمەتی ئافرەت تەنها پەیوەست نیە بە منداڵی خۆی و خێزانەکەیەوە، بەڵکو لەو بەربەست وناوبڕەیە دەچێتە دەرەوە بۆ بازنەیەکی گەورەتر کە خزمەتی کۆمەڵگەیە، هەر لەبەر ئەمەشە هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەو پێکهاتە دەرونیەی ئافرەت وئەو تایبەتمەندیە وا دەکات بڵێین ئافرەت زۆر گونجاوە بۆ دایکایەتی و گونجاوترە بۆ پەروەردەو چاودێری وخزمەت کردن بۆ هێنانەدی خۆشی کامەرانی بۆ خەڵکی تر – هەرچەندە گەر پەیوەندی خوێنیش نەبێ لە نێوانیان– بێ گوێدانە ماندوبوون، لەسەر حیسابی ئارامی و ئیستراحەتی خۆی.[3]

کاتێك ئافرەت توشی ئێش وئازارێك دەبێت وا بە ئاسانی لە یادی ناچێت، هەرکاتێکیش ئەو ئازارەی بیر بکەوێتەوە دووبارە ئازاری پیدەگاتەوە، هۆکاری

---

1ـ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص157. والقصاب، الفروق، ص168. والدكتور ديـار حسين، 36سنة، أخصائي بأمراض النفسية والعصبية ورئيس القسم ، جامعة صلاح للدين، مكان المقابلة:كلية الطب، تاريخ المقابلة: 2004/11/5م.

2ـ الماشوزية: لەزەت وخۆشی وەرگرتن بە خۆ ئازاردان. زكريا إبراهيم، سايكولوجية المــرأة، ص24.

3ـ زكريا إبراهيم، سايكولوجية المرأة، ص25.

تەنها بۆ ڕزگار بوون لەو کێشەیە ئەوەیە کە ماوەی بدرێتی زۆر بە ووردی وبە درێژی وبە قوڵی باسی ئەم ڕووداوە بکات کە ئازاری پێ گەیاندووە، بەتایبەتی لای یەکێکی خۆشەویست و دڵسۆز بۆی، ئەگەر ئەم کارە نەکات ئەوە ئەو یادە هەر بە هەڵواسراوی لەناو ناخی دەروونیەوە دەمێنێ و پاڵەپەستۆ دەخاتە سەردڵ وسنگی و لەوانەیە توشی خەم و پەژارەی درێژخایەنی بکات، بەڵام گەر بواری درا ئەم ڕووداوە باس بکات ئەوا ئەو پاڵەپەستۆیە دەروونیە نامێنێ و بەتاڵ دەبێتەوە.

بەڵام نێرینە کاتی توشی ئەم جۆرە ڕووداو ئازارە دەروونیانە دەبێت، زۆر بە قوڵی وووردی بیر لە هەموو لایەنەکانی ئەم ڕووداوە دەکاتەوەو بەخێرایی، تاوەکو چارەسەری گونجاوی بۆ دابنێ، لەهەمان کاتیش پێویستی بەوە نیە باسی بکات لە کاتی دانانی بەرنامەکەی.[1] پێویستە ئەوەش بزانین کەوا زۆر قسەکردن وگێڕانەوەی ڕووداوە ئازار بەخشەکان ڕەوشتێکی زۆر پەسەند نیە بۆ ئادەمیزاد بەتایبەتی ئەوانەی گەیشتوونەتە ئاستی بەرزی پۆستی بەڕێوەبەرایەتی چونکە زۆر نهێنیەکان تیایدا ئاشکرا دەبن، هەرئەوەیە بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی کە وای لە هەندێ زانایان کردووە بڵێن ڕەگەزی مێینە بۆ پۆستە بەرزەکانی بەڕێوەبردنی وڵات ناشێن.

لە کۆتایی ئەو بڕگەیە دەڵێین لەبەر ئەوەی ڕێژەی چەوری لەشی ئافرەت لە چەوری پیاوان زیاترە بۆیە زۆربەیان بەرگەی سەرما زیاتر دەگرن، هەرچەندە پێستەیان تەنکترە.[2]

1ــ عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص203.
2ــ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص157.

## بەندی سێیەم: چاودێری ولەخۆگرتن، خۆنەویستە بەرەولاچوون ، متمانــە بەخۆ بوون، خووڕەوشت.

### بڕگەی یەكەم: چاودێری ولەخۆگرتن (الرعایة والاحتواء)

هەروەك پێشتر باسمان كرد، كە ووزەی هێلكەی مێینە ووزەیەكی شاراوەیە، هەر بۆیە چالاكیەكەی ناوەكیە، تواناكەی پێكهێنان و شێوەكاریە. لەبەر ئەم هۆیەشە هەردوو سیفاتی چاودێری و لەخۆگرتن لە ژیانی ئافرەتدا زۆرگرنگەو بۆتە شتێكی بۆماوەیی هەروەك دەبینین لە كاتی سك پڕی و لە ئامێزگرتنی منداڵ و چاودێری هەموو ئەندامەكانی خێزان هەر لە كۆرپەلەوە تاوەكو هاوسەرو زۆرجاریش خزمانی نزیك ودووریش دەگرێتەوە. ئافرەت گشت پێداویستی و داواكاریەكانیان جێبەجێ دەكاو ئارەزووەكانیان دابین دەكات.

گەر تەماشای ژیانی مێینە بكەین هەر لە هێلكەوە تاوەكو دایكایەتی دەبینین سیفەتی(ژیانی) پێوەلكاوە. هێلكەی پیتێنراو ژیانی لەسەر ئەو ووزە شاراوەیە كە لەناو هێلكە دایە تاوەكو دەگاتە قۆناغی خۆ هەڵواسین بە دیواری منداڵدان، هەر بۆیە دەبینین هێلكە قەبارەی زۆر گەورەترە لە سپێرم. كۆرپەلە تەواوی ژیانی لەناو سكی دایكە، دوای هاتنە دەرەوەی بەهەمان شێوە شیر خواردن، چاودێری وپاراستن، گەشە، ئارامی وخۆشی هەر باوەش وئامێزی گەرم وسۆزی دایكیەتی. پێكهاتەی جەستەیی ودەرونی و شێوەو ئاكارو ڕوو ڕوخساری دایك هەمووی مانای ژیان دەبەخشێ بۆ كۆرپەلەو منداڵەكانی ترو تاوەكو هاوسەرەكەی. ئافرەت هۆكاری سەرەكی ئامادەكردن وپێدانی خواردنە بۆ گشت ئەندامانی خێزان لە ناو گشت بوونەوەردا جیا لە هەموو دروستكراوەكانی تر. واتە ئافرەت هەموو جولەو جەستەی ژیان بەخشە، بەبێ بوونی ئەو لەناو ماڵ وخێزان ئەو ژیانە ڕێك وجوانە بە شێوەیەك لە شێوەكان تووشی پەشێوی دەبێت.[1]

1ــ ماري بونابرت، سايكولوجية المرأة، ص151.

ئافرەت لە پیاو پێشکەوتووترە لە دواندن و زمانی، سووکی نواندنی دەربڕین (طلاقة التعبیر). هەستکردنیان بۆ دەورووبەرو دیاردەو ڕووداوەکان بە شێوەیەکی وەسفی(الطرائق الوصفیة)، زیاتر چاودێرو ڕێزی نەریت وبەها کۆمەڵایەتیەکان دەگرن(الأعراف و التقالید)، شارەزا ترن لە خوێندنەوەی نیشانەکانی ڕوخسارو شێکردنەوەیان. ئەو سیفەتانە وای کردووە ئافرەت گونجاوتر بێ بۆ پەروەردەکردنی منداڵ. منداڵ لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانی پێویستی بەوە هەیە کە فێری زمان ببێت، چۆن بتوانێ تێڕوانینی دروست فێر بێت بەرامبەر دیاردەو ڕووداوو شتەکانی دەوروبەر، فێری خوو ڕەوشت وبەها جوانەکانی ناو کۆمەڵگە بێت و چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات. بوونی ئافرەت وەك دایك و سەرپەرشتیار ومامۆستاو پەروەردەکار لە قۆناغە سەرەتاکانی ژیان هۆکارێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ دروستکردنی کەسایەتی کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری، فێربوونی زمان و گەشە پێدانی ئاستی زانیاری منداڵ. ئەوەش دیارە ترسناکترین و گەورەترین کارە کە ئافرەت دەیکات، چونکە ئەوە کاری دروستکردن وبونیادنانی ئادەمیزادی دوا ڕۆژە، زۆر بەرزترە لە زۆربەی کارەکانی کە پیاو ئەنجامی دەدات.

دایکایەتی ئەرکێکی سەرەکی وتەوەرییە لە ژیانی ئافرەتدا، هەموو ژیانی ئافرەت لە دەوری ئەو تەوەرە کۆبۆتەوە هەر لە منداڵییەوە تاوەکو پیری. ئەوەش ئارەزوویەکی خۆڕسك و خەلیقەیە(غریزة فطریة)لەوێوە ئافرەت ووزەی داهێنان و هێزو توانای پاڵنەر وەردەگرێ بۆ ئەنجامدانی کارەکانی. دایکایەتی بریتی نیە لە لەکەیەك بە ئافرەتانەوە لکابێ، یان تەنها ئارەزوویەکی ئاژەڵی بێت، بەڵکو هۆکاریکە بۆ گەیشتنە ئارامی دەرونی تەواوو هاوسەنگی ویژدانی، کە هەردووکیان پێویستن بۆ گەیشتنە خۆشی وتێگەیشتن لە مانای ژیان. دایکایەتی کێشەو ئازاری زۆری پێوەلکاوە، بەڵام کاتێ دەگاتە کۆتایەکەی ومنداڵی دەبێت هەست دەکات کەوا ئەو نامەو بەرنامەیەکی زۆری پیرۆزی گەیاندوەو بەمەش دەگاتە پلەیەکی بەرز لە خۆشی وکامەرانی. هەرکات ئافرەت هەستی بەوە کرد کە ئەرکی خۆی بە جێ گەیاندوە ئەوا دەگاتە ئەو بڕوایەی(القناعــة) کە ئەو بەر لە هەموو شتێکی تر

کەسایەتی خۆی سەلماند. دایکایەتی پاڵنەرێکە[1] لە پاڵنەرە ئاژەڵیەکان بە گشتی، بەڵام زۆر بە هێزترە لە پاڵنەری برسیەتی وتێنویەتی و ئارەزووی جنسی و خۆ دەرخستن(حبّ الاستطلاع).[2]

دکتۆر زکریا إبراهیم دەربارەی دایکایەتی دەڵێت: پاڵنەری دایکایەتی منداڵەکان بە دایکەوە دەبەستێتەوە هەر لە سەرەتاوە، پاڵنەرێکی غەریزیەو پەیوەندیەکی توندی هەیە بە هەندێ پێداویستی ئەندامەکان وپێویستیە فسیۆلۆژیەکان. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کەوا دایك پەیوەست و بەندە بە منداڵەکانیەوە لە تەمەنی منداڵیەوە تاوەکو گەورەبوون وجیابوونەوە، هەر کاتێکیش پێویستیان بە چاودێری ئەو بێت ئامادەیە بۆ ئەو کارە، بەڵام گەر سەیری ژیانی ئاژەل بکەین دەبینین دایکایەتی تەنها دیاردەیەکی غەریزەیی ئاژەڵیەو لە کردارێکی فسیۆلۆژی دیاریکراو خۆی دەنوێنێ ، بۆماوەیەکی کورت کە تەنها قوناغی بچوکیە لە ئاژەلەکە. بەڵام دایکایەتی لە ئادەمیزاددا بێجگە لە کرداری فسیۆلۆژی، کردارێکی دەرونی(سایکولوژی) ئالۆزەو پەیوەستە بە زۆر لە کاروکاردانەوە.[3]

هەروەها دەڵێ: دایکایەتی لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا پەیوەندی وخۆشەویستیەکی زۆری تیادا بەدی دەکرێت لە نێوان دایك ومنداڵەکانی وپەیوەست نیە بە قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەن، بەڵکو درێژ دەبێتەوە بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیان تاوەکو مردن. گەر باسی سۆزی دایك بکەین بۆ منداڵەکەی دەبینین خۆشەویستی دایك زاڵە بەسەر گشت بنەماکانی تری خۆشەویستی، وەك خۆشەویستی جنسی وئەوانی تر، هەر بۆیە ئامادەیە بۆ بەرگری کردن و ڕاوەستان بەرامبەر گشت گۆڕانکاریەکانی دەوروبەر لە پێناوی منداڵەکەی، بڕی سۆزی دایك بۆ منداڵەکەی بەوەدا دیارە کە

---

1ـ پاڵنەر(الدافع) : هێزێکی دەرونیە پاڵ بە ئادەمیزادەوە دەنێ بە بەردەوامی بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو تاوەکو دەگاتە پلەی تێربوون وگەیشتنە ئەو ئامانجەی کە ئەو پاڵنەرە ئاراستەی کردوە بۆ بە دەست هێنانی. القذافي، رمضان محمد، علم النفس في الإسلام، ص41.

2ـ يوسف مراد، ميادين علم النفس، ص82.

3ـ زكريا إبراهيم، سيكولوجية المرأة، ص116-117.

کاتێکی زۆر خەریکی یاریکردن ولاواندنەوەیەتی تاوەکو زۆربەی کات ئاسوودە بێت.[1]

لە کۆتایی ئەو برگەیە باسی ئەوە دەکەین کەوا برێ ئەو ئارەزووەی ئافرەتان بەگشتی هەیانە بۆ ئەوەی ببن بە دایك زۆر بەرزو پتەوە. یەکێ لە لێکۆلەرەوە کۆمەلاتییەکان دەگێرتەوەو دەلێت: هەندێك لەو کچانەی کەوا زۆر حەزو ئارەزوو بە دایکایەتی دەکەن ولەهەمان کاتیش دەترسن لە پیاو، لە شووکردن و ئەرك وفەرمان وپێداویستیەکانی، ترسان لە پەیوەست بوون بە یاساو رێساو نیزامی خێزانداری، بیر دەکەنەوە لەوەی کە پەیوەندی جنسی بکەن بە یەکێکی نەناسراو تاوەکو منداڵێکیان ببێت و تامی دایکایەتی بچێژن، بەبێ ئەوەی پەیوەست بن بە هیچ بنەمایەکی کۆمەلایەتی وئەرکی ژن و مێردایەتی. نموونەی ئەو دەگمەن ناباوانە(النماذج الشاذة) تەنها بۆ هێنانەوەی بەلگەیە لەسەر گرنگی دایکایەتی لە ژیانی ئافرەت و ئارەزووی دەرونی قوڵی ئافرەت بۆ دایکایەتی.[2]

## برگەی دووەم: خۆنەویستە بەرەولاچوون (التوجه اللاإرادي)

مەبەستمان لە خۆنەویستە بەرەولاچوون ئەوەیە، کەوا نێرینە بە شێوەیەکی خۆنەویستی، یان بە هۆکارێکی فیتری ئارەزووی بەلای هەندێ یاری وکاردا دەڕوات، بەهەمان شێوە مێینە ئارەزووی بەلای هەندێ یاری وکاردا دەڕوات کە نێرینە ئارەزووی ناکات، یان پێچەوانەی ئەو ئارەزووە کار دەکات.

چالاکی منداڵی نێرینە ئاراستەی بۆ دەرەوەیە، دەبینین دەست دەکەن بە دروستکردنی خانووی بچوك وپاش ماوەیەك تێکی دەدەن و دووبارە دروستی دەکەنەوە، یان لاسایی کارو پیشەکانی باوکی دەکاتەوە، یان خەریکی یاری ئۆتۆمبیل وپایسکل وشتی ترە، بەلام چالاکی مێینە بەرەو ناوەوەیە دەبینین هەوڵی ئەوە دەدات هەندێ کەل وپەل لەناو ئەو خانووە بچکۆلانە دابنێ کە بۆخۆی

1ـ زکريا إبراهيم، سيكولوجية المرأة، ص120.
2ـ زكريا إبراهيم، سيكولوجية المرأة، ص121.

دروستی کردووە، وەك پەیکەری کچۆلەیەکی بچوك، لانکێکی خنجیلانە، دوایی دەرگاکانی پێوەبدات تاوەکو پارێزگاری کەل وپەلەکان بکات. واتە یاری کچ هەر لەسەرەتاوە تایبەتمەندی خۆی هەیە کە بەرەو پێکەوەنانی ماڵ وخێزان و گرنگی دان و چاودێری کەل وپەلەکانە. ئەوەش ئامازە بەوە دەکات کەوا چالاکی وفیکری ناوەکی (فکرة الباطن أو الداخل) تا رادەیەکی زۆر رۆلی کاریگەری لەسەر ژیانی ئافرەت هەیە، بگرە هەموو ژیانی بریتیە لە گۆرانکاری ورووداوی ناوەکی شاراوەی گەورە.

لەبەر ئەوەی چالاکی مێینە زۆربەی بۆ ناوەوەیە هەر لە تەمەنی منداڵیەوە بۆیە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە کەوا نیشانەکانی خۆ خۆشەویستی (النرجسیة-العشق الذاتي) دیاربکەوێت لەسەر کچان لە تەمەنی 4- 5 ساڵیدا. هەر لەوکاتەوە هەست دەکات کە پێویستی بە خۆ جوان کردن ورازاندنەوە هەیە، تاوەکو سەرنجی کەسانی تر بۆ خۆی کێش بکات.[1]

مەیل و ئارەزووی کچان ئاراستەی بەرەو لای گرنگی دانە بە منداڵی لە خۆ بچوکتر، هەربۆیە مێینە گونجاوترە بۆ پەروەردەو چاودێری بچکولان. بەلام لە نێرینە بە پێچەوانەوە مەیل وئارەزووی بەرەو لای لە خۆ گەورەترە، وەك باوکی یان براگەورەی ولاسایی کردنەوەیان وبەشداری کردنی چالاکیەکانیان. هەربەمانەوە دیارە جیاوازیەکی بەرچاو هەیە لە پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی و هۆرمونی هەردوو رەگەز کە وای کردوە هەریەکیان گونجاوتربێ لەوی تریان بۆ هەندێ کار.[2]

## برگەی سێیەم: متمانە بەخۆ بوون (الثقة بالنفس)

نێرینە کاریگەرەو مێینە وەرگرە، نێرینە داهێنەرەو مێینە لاسایکەرەو بە بە شوێن وتووە، نێرینە بە بیرکردنەوە کاردەکات ومێینە کاردەکات بە هەڵچوون.[3]

1ـ زكريا إبراهيم، سيكولوجية المرأة، ص45. والقصاب، الفروق، ص203.
2ـ القصاب، الفروق بين الذكر والأنثى، ص202-212.
3ـ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص155.

ئافرەت زیاتر تێنوی خۆشەویستی، سۆزو باوەشی گەرم، لاواندنەوەی کەسانی ترە، هەروەك منداڵێکی گەورە وایە، بەلاّم نێرینە خۆی پێویستیەکانی خۆی بە شێوەیەکی باش بەجێ دەهێنێ.[1]

## برگەی چوارەم: خووڕەوشت (الأخلاق والسلوك)

مێینە زیاتر پابەندە بە دابونەریتە کۆمەلاّیەتیەکان، گرنگی دان بە بنەماو یاساکانی سلوك، جوانی وجوانکاری، هاوکاری کەسانی ترو چاودێریان، ئارەزووی بەلای کۆمەك کردن وپێکەوە ژیانی کۆمەلاّیەتیە. زیاتر بەرەو لای خۆبەدەستەوەدان وملکەچ وگوێڕایەڵی ویژدان وپشت بەستان بەکەسانی ترە، واتە لە سروشتیاندا گوێڕایەل و ملکەچن، بەلاّم نێرینە ئارەزووی بە لای کاروباری ڕامیاری و بیردۆزەیی یە (النظرية)، زیاتر گرنگی دەدات بە دەسەلاّت وکاریگەری کردن لە کەسانی تر.[2]

منداڵی نێرینە ئارەزووی بەلای چالاکی جەستەیی یە وەك: ڕاکردن و ڕاونان(المطاردة) ویاریەکانی لەو جۆرەی کە تواناو ووزەیەکی زۆری دەوێت. واتە زیاتر بە جوولەو دژوارن و ترس وسۆزیشیان کەمترە لە مێینە، هەر بۆیە ڕێژەی تاوان لە نێرینە 5 بەرابەری مێینەیە.[3]

لەوانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کەوا نێرینە لە ژیانیدا ئارەزوو مەیل وپشت بەستانی بە: زاتکردن وخۆسەپاندن ودەسەلاّت وسەرنج ڕاکێشانی خەلك بەلای خۆیەوەیە، بەلاّم مێینە لە ژیانیدا ئارەزوو مەیل وپشت بەستانی بە: کەرەم و بەخشین وسۆزو باوەشی گەرم بۆ کەسانی ترە.

لەبەر ئەو سیفەت و ڕەوشتە فیتریانەی باسمان کردن بەتایبەتی ئەوانەی

---

1ــ ماري بونابرت، سايكولوجية المرأة، ص148.
2ــ سيرل بيرت، كيف يعمل العقل، ص162.
3ــ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص162.

برگەکانی دوایی، ئاینی ئیسلام پیاوی بە گونجاوتر داناوە بۆ سەرپەرشتی بەڕیوەبردنی کاروباری خێزان، ئاستە بەرزەکانی کاروباری سەربازی، دەسەڵاتی رامیاری وولات لە زۆر کات وشوێندا وبەشێوەیەکی گشتی.

پاش ئەوەی باسی هەموو جیاوازیە جەستەیی و دەروونیەکانی نێوان هەردوو رەگەزمان کرد، لەوانەیە هەندێك وا گومان ببەن کەوا ژیانی ئافرەت هەمووی بریتیە لە تەنگ وچەڵەمەو کێشەی جەستەیی ودەروونی. بەڵام گەر بێینە سەر راستی و واقعیی ژیانی ئافرەت دەبینین هیچ شتێکی لەو بارەوە لە ئارادا نیە. گەر ئافرەت هەندێ لەو کردارە فسیولۆژیانەی بەسەریدا تێدەپەڕێت وا دەکات هەندێك ماندوی بکات وکێشەی بۆ دروست بکات، لەهەمان کاتدا زۆر گۆرانکاری و کرداری فسیولوژی تر دڵی خۆش دەکات، بۆ لوتکەی بەرزی دڵشادی دەبات. واتە هەرگیز نابێت وا تەماشای ئافرەت بکەین کە زۆر بێ هێزو بێ تواناو سەر بە کێشەیە و هەردەم پێویستی بە بەزەیی و دڵ بۆسووتان ولاواندنەوە سەردولکەو گریان هەیە.

بۆ وەڵامی ئەو بۆچونە نا دروستە، دوو خاڵ دەخەینە روو: یەکەمیان، هەر لە خودی پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی مێینە گەر هەندێ خاڵی لاواز بەدی بکرێت دەبینین بەرامبەری خاڵی وا بە هێز هەیە تا رادەیەك ئەو لاوازیە دادەپۆشێت، وەك: ئەگەر کەم وکورتی هەبێ لە هەندێ کاروکرداری داهێنان و بیرو هۆش و چالاکیەکانی دەماغ، بەرامبەر بەوە سەرکەوتوویی هەیە لە هەندێ سیفەتە دوەمیەکان، وەك: بەدەنگەوەهاتنی خێراو لەخۆگرتن، ئەگەر لە بیرکردنەوەی مەنتقی کەم وکورتی هەبێ لە بیرکردنەوەی سۆزی وئیلهام وخەیال وئەندێشە (التفكير الحدسي و الإلهام) پێشکەوتووە، ئەگەر کەم وکورتی هەبێ لە زاتکردن و چوونە پێش لەبەر نەرمی ودڵ ناسکیەکەی، دەبینین بەرامبەر ئەوە لە دواندن و دەبرین وزمانەوانی وهەستیاری وسۆزدا پێشکەوتووە. خاڵی دووەم، بۆ ئەوەی رەوڕەوەی ژیان وشارستانیەت بەردەوام بێت هەردەم بە بێ پێکەوە ژیانی نێرینەو مێینە نابێت، ئەوەش وا دەکات هەریەکیان کەم وکورتیەکانی ئەوی تر پڕ بکاتەوە.

ئەو سیفاتانەی باسمان کردن زۆر گرنگ وپێویستە بۆ ئافرەت تاوەکو بێتە ئافرەت لە حەقیقەت وواقیعدا بە هەموو ماناکانی ووشەی ئافرەتەوە، هەروەها بێتە تەواکەری پیاو لە ژیاندا.

# باسی دووەم

## هەندێک لە نەخۆشیە دەروونیە باوەکان و نەخۆشیە جەستەییە دەروونیەکان

بەندی یەکەم: هەندێک لە نەخۆشیە دەروونیە باوەکان

بڕگەی یەکەم: خەمۆکی

بڕگەی دووەم: دەمارگیری گوشراو( العصاب الحصري )

بەندی دووەم: نەخۆشیە جەستەییە دەروونیەکان

**بەندی یەكەم: هەندێك لە نەخۆشیە دەرونیە باوەكان ( بعض الأمراض النفسية الشائعة )**

لەبەر ئەوەی جیاوازی فسیولوژی ودەرونی هەیە لە نێوان هەردوو ڕەگەز، هەر بۆیە هەریەكیان لەوانەیە لە ژیانیان ڕووبەڕووی هەندێ لە پشێوی وكێشەو نەخۆشیە دەرونیەكان ببنەوە كە جیاوازن لەوی تریان. ئافرەتان هەندێكیان ڕووبەڕووی ئەو كێشانە دەبنەوە كە پەیوەندی هەیە بە نیشانەكانی بێ نوێژی وسك پڕی ومنداڵ بوون ولە بێ نوێژی كەوتن، بەڵام پیاوان زیاتر ڕووبەڕووی كێشەی ڕاهاتن لەسەر مەی خواردنەوەو (الإدمان) كێشەكانی تاوان كردن دەبنەوە.

## بڕگەی یەكەم: خەمۆكی (الكآبة- Depression).

نەخۆشیەكی زۆر كۆنەو لە دێر زەمانەوە باو بووەو لە سەردەمی ئێستاشدا هەر زۆر باوە، ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشیە بوونە لە جیهاندا ژمارەیان بە ملیەنەها دەبێت وساڵانە نزیكەی 50000 كەسیان دەمرێت.[1]

ئەو نەخۆشیە لە هەموو تەمەنێك ڕوودەدات و لە هەردوو ڕەگەزدا، بەڵام ڕێژەی لە مێینە3 جاری نێرینەیە.[2] هۆكاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كەوا زۆر جار ئافرەتان پشت گوێ دەخرێن لەلایەن ئەندامانی تری خێزانەوە بەتایبەتی هاوسەرەكەی، یان كاتی پیری ڕێزی تەواوی لێ ناگیرێ، یان لە زۆر شوێنان بەتایبەتی لە ڕۆژ ئاوادا لە بەر هەڵوەشانەوەی پەیوەندیەكانی خێزان دەخرێنە ناو كامپی تایبەت وخانەی پەككەوتەكان ودوور لەهەموو سۆزو بەزەیی منداڵ و خزمەكانی.

### هۆكارەكانی ئەو نەخۆشیە:[3]

1- هۆكاری فسیۆلوژی، وەك پێكهاتەی تایبەتی خودی ئەو كەسەو پشێوی لە كاروفەرمانی هۆرمونەكانی.

*1_ Rital. A et al . Hilgard introduction to Psychology. P: 526.*
*2_ Rital. A et al . Hilgard introduction to Psychology. P: 526.*
*3_ Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 528.*

2- هۆکارەکانی دەرونی، وەك جۆری خوێندن، پاڵەپەستۆی قوتابخانەو سەرزەنشتی مامۆستایان، لێپرسینەوەی باوك ودایك بەشێوەیەکی نەگونجاوو توند.

3- هۆکارەکانی کۆمەڵایەتی، وەك باری گوزەرانی خێزان، پەیوەندی نێوان دایك وباوك، چاودێری نەکردنی منداڵەکان لەلایەن باوانیەوە بەشێوەیەکە رێك و پێك، یان جیاوازی کردن لە نێوانیان.

4- سروشتی هەندێك لە ئافرەت وقۆناغەکانی ژیانی، وەك بێ نوێژی وسك پڕی ومنداڵبوون ولە بێ نوێژی کەوتن، کاردانەوەیەکی سلبی هەیە بەتایبەتی لەوانەی کە پێشتر ئامادەییەکیان تیا بووە بۆ ئەو نەخۆشیە.

نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە جیاوازە لە نێوان مێینەو نێرینەدا، لە مێینە ئارەزووی خواردنی زیاد دەکات و کێشی زیاد دەبێت و زۆر دەخەوێت. بەڵام لە نێرینە خەوی کەم دەبێتەوەو هەست بە خەو زڕان(الأرق) وپەشێوی دەکات و ئارەزووی خواردنی کەم دەبێتەوەو کێشی دادەبەزێت، متمانەی بە خۆی کەم دەبێت و زۆر جار ئارەزووی خۆ کوشتن دەکات.[1]

خەمۆکی ئەگەری توش بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ ، شەکرە، بەرزی پەستانی خوێن، کەم بوونەوەی بیرهۆش و فکردنەوە، شێرپەنجەکان زیاد دەکات.

لە لێکۆڵینەوەیەك لە ئەمەریکا دەری خستووە کەوا رێژەی خەمۆکی لە مێینە بە هەموو تەمەنەکانیەوە دەگاتە 21٪ ولە نێرینە دەگاتە 13٪، هۆکاری زۆربەی زۆریشی گەراندۆتەوە بۆ خراپی ونادروستی بەکارهێنانی جنسی، هەروەها دەڵێ: 27٪ی تووش بووەکان بیر لە خۆ کوشتن دەکەنەوە، 12٪ لەوان بە کردار هەنگاویان ناوە بۆ خۆ کوشتن، رێژەی خۆکوشتنی لە ئافرەتی سك پڕیشی بە 1.7٪ داناوە.[2]

---

*1_ Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1484.*
*2_Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 270.*

**بڕگەی دووەم: دەمارگیری گوشراو ( العصاب الحصري- Anorexia Nervosa ).**

ئەو نەخۆشیە زیاتر تووشی پێگەیشتووەکان دەبێت لە خوارووی تەمەنی 25 ساڵیدا ، بەتایبەتی لەنێوان 13-18 ساڵیدا. ئەو نەخۆشیە کار دەکاتە سەر زۆربەی ئەندامەکانی لەش و هۆرمونەکان وکۆئەندامی دەمار. لە مێینە 9 جار زیاترە لە نێرینە ونیشانەکانی بریتیە لە وەستانی بێ نوێژی، کەم بوونی ئارەزووی خواردن، شێوانی میزاج وهەلسوکەوت. بەهۆی دابەزینی چالاکی زۆربەی ڕژێنەگلاندەکان پلەی گەرمی لەش وپەستانی خوێن وبڕی شلەی لەش دادەبەزێت، لێدانی دڵ کەم دەبێتەوە، پێستە ووشك وزبر دەبێت، تووشی کەم خوێنی وداخوڕانی ئێسقانیش دەبێت. لە هەندێ لێکۆڵینەوە دیار کەوتووە کە ئەوانەی سەمای باڵێ (سەمای سەردەم) زۆر دەکەن زیاتر توشی ئەو نەخۆشیە دەبن، چونکە ڕاهێنانیان زۆر قورس وبەردەوامەو خواردنیش کەم دەخۆن، وزەو ڤیتامینی پێویستیان کەمە لە خواردنەکانیان (تاوەکو کێشیان زیاد نەکات).[1]

**بەندی دووەم: نەخۆشیە دەرونیە جەستییەکان ( الأمراض النفسية العضوية ) "Psycho-somatic"**

هەرکاتێك یەکێك یان ژمارەیەك لە ئەندامەکانی لەش توشی نەخۆشی دەبن، ئەوا ئەو نەخۆشیە کاری سەلبی دەکاتە سەر ئەرك وفەرمانی مێشك و کردارە دەرونیەکان، بەهەمان شێوە هەرکاتێك پشێویەکی دەرونی ڕوو لە مرۆڤ دەکات، ئەوا کاری سەلبی لە سەر یەکێك یان کۆمەڵێك لە ئەندامەکانی لەش دەبێت و تووشی پشێوی وەیان نەخۆشیەکی دیاری کراویان دەکات، واتە دەرون کاریگەری مادی و واتایی لەسەر لەش هەیە، بەو جۆرە نەخۆشیانە دەڵێن نەخۆشیە دەرونیە جەستەییەکان.[2]

---

*1 — Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 1049-1050.*

2— هەموو زانایانی دەروونناسی و پزیشکەکانی دەرونی و گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کەوا هەر لادانێك لەلایەنی کارئەندامی دەماغ پەیوەست بە کەسایەتی مرۆڤ دەبێتە هۆکار بۆ تووش بوون بە نەخۆشیەکانی =

زانایانی پزیشکی ئەو جۆرە نەخۆشیانەیان وا پێناسە کردووە کەوا ئەو نەخۆشیانەن لە ڕوکاردا جەستەیی یە، بەڵام سەرچاوەکەی دەرونیە. یان دەڵێن: کۆمەڵێکن لەو نەخۆشیە جەستەییانەی هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پشێوی باری دەرونی، جا چ ئەو بارە دەرونیە نەخۆشیەکە دروست بکات یان هۆکارێك بێت بۆ پەرەسەندن وبەرەو پێشەوە بردنی نەخۆشیەکە.[1]

پشێوی و نالەباری باری دەرونی لە هەندێ وڵاتانی جیهان زۆربەی هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ تەڵاق دان، کێشەکانی جنسی ، ئازاردانی جنسی، ناڕێکی ونالەباری بەکارهێنانی جنس، ڕەچاو نەکردنی تەمەن لە کرداری جنسی دا، هەندێ هۆکاری تری هاوسەرێتی وخێزانداری، هەر بۆیە ڕێژەکەی لە مێینە زیاترە لە نێرینە.[2]

پشێوی و نالەباری باری دەرونی جۆری زۆرە لەوانە: تەنگی دەرون (حصر النفس- Anxiety )، توڕەبوون (الغضب- Anger) ، پچڕانی هۆش وبیر (فتور الشعور- Apathy)، لاوازبوونی تێگەیشتن (ضعف الإدراك- Cognitive)، زۆری تر. ئەوانە مرۆڤی تووشی ئەو نەخۆشیانە دەکەن: هەوکردنی کۆلون، هەوکردن وبرینداربوونی گەدەو دوانزەگرێ، سەریەشەو شەقە سەر( لا سەر) یەشان، هەوکردنی جومگەکانی ڕۆماتیدی(Rheumatoid Arthritis)، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەرە ڕەقبوونی بۆریەکانی دڵ، خەمۆکی، دەرکەوتنی دەنکوکەی گەنجیەتی، ئازاری مانگانەی بێ نوێژی، دابەزینی ئاستی بەرگری لەش.

هەندێك جارو لە هەندێك کەسدا ئەو نەخۆشیانە پەرەدەسێنن وخاوەنەکەی کۆنترۆلی خۆی لەدەست دەدات ودەگاتە ئەوەی خۆی بکوژێت.هەنگاونان بۆ خۆ کوشتن لە مێینە زیاترە لە نێرینە، بەڵام ڕێژەی ئەوانەی سەرکەوتوو دەبن لە هەنگاوی خۆکوشتن لە نێرینە 8 جار زیاترە لە مێینە، چونکە نێرینە زیاتر کەل و

---

دەرونی، بەڵام نەخۆشیەکانی عەقلی ئەوانەن کە مرۆڤ تووشی دەبێت لە ئەنجامی لەکارکەوتن، لەناوچوونی خانەکانی مێشك. السامرائي، هاشم جاسم، المدخل في علم النفس، ص149.

1ـ طلعت منصور وآخرون، أسس علم نفس العام، ص479.

*2_Rital. A et al. Hilgard introduction to Psychology, P:480.*

پەلی بریندارکەرو بکوژ بەکاردەهێنن.[1]

هەروەك بینیمان ملیونەها خانە، دەیەها هۆرمون، توێکاری زۆر لە ئەندامەکان، شێوە ئاکاری دەم وچاو، حەوزو شان، بەژن وبالا، بارستەی ماسولکەو توندیان، خوێن وهەناسەدان، بگرە کاروفەرمانی مێشك، دەرون وئارەزووەکانی، هەموو ئەوانە شایەدی دەدەن لەسەر ئەوەی کەوا ئەو دوو ڕەگەزە یەکسان نین بە هەموو واتای یەکسانی کە ئیمڕۆ بانگێشەی بۆ دەکرێت.

لە کۆتاییدا برگەیەك لە بۆچونەکانی پرۆفیسۆر (ئەلیکسیس کاریل) تان بۆ دەهێنمەوەو دەڵێت: ئەو جیاوازیانەی کە هەیەو نکولی لێ ناکرێت لە ڕوانگەی پزیشکی ودەرونیەوە، تەنها ئەوە نیە جیاوازی نێوان کۆئەندامی زاوزێ بێت وبەس کە کرداری سك پڕی ومنداڵبوونی تیادا ئەنجام دەدرێت، بەڵکو ئەو جیاوازیە پەیوەستە بە زۆر لە خانەو شانەو ئەرك وفەرمان ورژێنە گلاندەکان. نەزانی هەندێ کەس بەو زانیاریە گومان لێ نەکراوانە، نەزانی ئەوانەی خۆیان بە بەرگری لێکەری مافی ئافرەتان دادەنێن وای پێ کردن کەوا بڕیار بدەن پێویستە هەردوو ڕەگەز یەك جۆرە بەرنامەی خوێندن بخوێنن، یەك ئاستیان بۆ بڕیار بدرێت، وا تەماشا بکرێت کە یەك تواناییان هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا یەکسان نین وجیاوازی هەیە لە نێوانیان، چونکە هەر خانەیەك لە خانەکانی ڕەوشتی ڕەگەزی خۆی وەرگرتووە، بەهەمان شێوە گشت ئەندامەکانی بەتایبەتی کۆئەندامی دەمارو مێشك. زانیاری پزیشکی و یاساکانی فسیۆلۆژی، وەك یاساکانی تری جیهانی زەوی نیە خەلکانی تر بتوانن بە ئارەزووی خۆیان بیگۆڕن، وەك لابردنی ئارەزوویەکی فیتری یەکێك ودانای ئارەزوویەکی تر لە شوێنی ئەو، هەروەها بەزۆر بیسەپێنن کە ئەوە ئارەزووی ئەو کەسە خۆیەتی. بۆیە پێویستە مێینە گەشە بە ئارەزووە سروشتیەکانی خۆیان بدات وچاولێکەری نێرینە نەکەن، چونکە ڕۆلیان لە دروست کردنی شارستانیەت کەمتر نەبووە لە ڕۆلی نێرینە وپێویستە واز لەو ڕۆلە گرنگەی خۆیان نەهێنن، بەردەوام بن لەسەر ڕاهێنانی عەقلی وماددی بەبێ ئەوەی تەماعی (المطامع) ئەوە

1 – Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 270.

بکات کەوا نێرینە چی دەکات وچی وەردەگرێت ... هەر بۆیە پێویستە لەسەر ئەوانەی پەروەردەی نێرینەو مێینە دەکەن گرنگی بدەن بە تایبەتمەندیەکانی هەردوو ڕەگەز، گرنگی بدەن بە کارە سروشتیەکانیان. ئەو جیاوازیانەش لە پلەی هیچ لایەکیان کەم ناکاتەوە، بەڵکو پێویستە حیساب بۆ ئەو جیاوازیانە بکرێت گەر بمانەوێ جیهانێکی شارستانی بنیاد بنێین.[1]

**مەبەستی کۆتایی باسەکەمان ئەوەیە:**

1– پێویستە بزانین کەوا جیاوازی هەیە ودەبێت هەر ببێت، گەر نەبێت ژیان، واتای ژیان وخۆشەویستی هەر نامێنێ ونابێت.

2– ڕوونکردنەوەی جیاوازیەکان بۆ خوێنەری بەڕێز ئەوەیە، تاوەکو زیاتر شارەزایی هەبێت لە پێکهاتەی جەستەیی ودەروونی خودی خۆی بە هەردوو ڕەگەزیەوە.

3– تاوەکو هیچ کەسێك بە هەڵەی پزیشکی وکۆمەلایەتی دا نەچێت گەر بیەوێت هەر هەڵسوکەوتێك بکات بۆ ئەوەی خۆی یەکسانی تەواو بکات بە ڕەگەزی بەرامبەری هەروەك لە هەندێ شوێن هەوڵیان داو هەرەسیان هێنا.

4– تاوەکو بزانین هەردوو ڕەگەز کەم وکورتی هەیە لە هەندێ لایەنی جەستەیی ودەرونی، بەلام هەردوولا تەواوکەری یەکترین.

5– تاوەکو بزانین هەندێ کارو ئەرك وفەرمان گونجاوترە بۆ ڕەگەزێکیان لەوی تریان.

6– تاوەکو بزانین گەر ڕەگەزی گونجاو هەڵنەبژێرین بۆ کاری گونجاوی خۆی، ئەوا خودی ئەو کەسە توشی کێشەی جەستەیی ودەرونی دەبێت وکۆمەڵگەش سوودی تەواو لەو کارە وەرناگرێ بە شێوەیەکی تەواو، بێجگە لەبەفیڕۆ دانی کات و ئابووریەکی زۆریش.

---

1ـــ ألیکسیس کاریل، الإنسان ذلك المجهول، ص109-111.

ئێمە لە ڕاستیەوە نزیك دەبین گەر تەماشای ئەو جیاوازیانە بکەین کەوا جیاوزیە لە جۆر، ئەو جیاوازیانە هەر دەمێنێن لە گشت قۆناعەکانی ژیان، چونکە هەریەکیان کارو فەرمانی تایبەتی خۆی هەیە لە فیترەت و خەلیقەتەوە وا بووەو هەر واش دەمێنێ، ئەمەش بۆ ئەوەیە هەردوو ڕەگەز کەم وکورتی یەکتری پڕ بکەنەوەو تەواوکاری یەکتری بکەن، ئارەزووی دیدارو بەیەك گەیشتن ویەکتری کێش کردن بکەن، تاوەکو ڕەوڕەوەی ژیان بە ڕێك وپێکی بڕوات بە ڕێوە. گەر هەردوولا یەکسان بونایە لە هەموو شتێك هەروەك بانگێشەی بۆ دەکەن ئەوا واتای ژیان و خۆشەویستی و ڕەحم وبەزەیی وئاسوودەیی دوای بەیەك گەیشتن لە هیچ فەرهەنگێك ناویان نەدەبوو ونەدەما هەتا هەتایە. ئەوە سونەتی ژیانە، وا هاتووەو وا داڕێژراوە لە لایەن داهێنەرو پەروەردگاری هەموو بوونەوەرو ئادەمیزاد. بەبێ ئەو جۆرە نەخشەیە ژیان هەمووی دەبێتە پشێوی و نائارامی، بڵاو بوونەوەی خراپی و بەدڕەوشتی، فەسادی کۆمەڵایەتی و ڕکەبەرایەتی و دژایەتی نێوان دوو لەیەکچووی- بەناو یەکسانی- ڕوکەشکراوی بەزۆر پێکراوی موزەوەر.

شێوەی ژمارە (1) : پەیكەرە كۆئەندام

شێوەی ژمارە (2) : كاسە سەر

شێوەی ژمارە (3) : قەفەزەی سنگ

شێوەی ژمارە (4) : حەوزی مێینەو نێرینە

شێوەی ژمارە (5) : دیمەنی ناوەوەی دەماخ

شێوەی ژمارە (6) : دڵ ودەروازەكانی

شێوەی ژمارە (7) : كۆئەندامی هەناسە

شێوەی ژمارە (8) : قورگ لە ڕووی پێشەوە

شێوەی ژمارە (9) : كۆئەندامی زاوزێی نێرینە لە تەنیشتەوە

شێوەی ژمارە (10) : كۆئەندامی زاوزێی نێرینە لە ڕووی پێشەوە

شێوەی ژمارە (11) : كۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەكانی ناوەوە)

شێوەی ژمارە (12) : كۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەكانی دەرەوە)

شێوەی ژمارە (13) : مەمك وجۆگەکانی شیر

شێوەی ژمارە (14) : کرۆمۆسومەکانی جەستەیی و توخمەیی

شێوەی ژمارە (15) : ترشی RNA وپرۆتینەکانی

شێوەی ژمارە (16) : توخمە خانەی نێرینە (سپێرم)

شێوەی ژمارە (17) : توخمە خانەی مێینە (هێلکە) وکڵاوەی بریقەداری

شێوەی ژمارە (18) : هاتنە خوارەوەی هێلکە لە هێلکەدان

شێوەی ژمارە (19) : هێلکە کاتی پیتێن

شێوەی ژمارە (20) : کۆرپەلەیەکی تەواو

شێوەی ژمارە (1): پەیکەرە کۆئەندام

شێوەی ژمارە (2): کاسە سەر

شێوەی ژمارە (3) : قەفەزەی سنگ

شێوەی ژمارە (4): حەوزی مێینەو نێرینە

شێوەی ژمار (5): دیمەنی ناوەوەی دەماخ وسورانی شلەی دەماخ وشلەی دڕکی

شێوەی ژمارە (6): دڵ ودەروازەکانی

شێوەی ژمارە (7): کۆئەندامی هەناسە

شێوەی ژمارە (8): قوڕگ لە ڕووی پێشەوە

شێوەی ژمارە (9) : کۆئەندامی زاوزێی نێرینە لە تەنیشتەوە

شێوەی ژمارە (10): کۆئەندامی زاوزێی نێرینە لە ڕووی پێشەوە

شێوەی ژمارە (11): کۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەکانی ناوەوە)

شێوەی ژمارە (12): کۆئەندامی زاوزێی مێینە (ئەندامەکانی دەرەوە)

شێوەی ژمارە (13): مەمك وجۆگەکانی شیر

شێوەی ژمارە (14): کرۆمۆسومەکانی جەستەیی و توخمە کرۆمۆسومەکان

شێوەی ژمارە (15): ترشی RNA وپرۆتینەکانی

شێوەی ژمارە (16): توخمە خانەی نێرینە (سپێرم)

شێوەی ژمارە (17): توخمە خانەی مێینە (هێلکە) وکڵاوەی بریقەداری

شێوەی ژمارە (18): هاتنە خوارەوەی هێلکە لە هێلکەدان

شێوەی ژمارە (19): هێلکە کاتی پیتێن

شێوەی ژمارە (20): کۆرپەلەیەکی تەواو

# بەرگی دووەم

## حوکمەکانی شەرعی پەیوەست بە هەردوو ڕەگەزو جیاوازیی نێوانیان لەبەر ڕۆشنایی جیاوازیە خۆڕسکەکان

بەشی یەکەم: حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە وپۆشـاك و چـاوداگرتن وتێکـەڵاوی و حەیاو شەرم

بەشی دووەم: خواپەرستی (نوێژ، ڕۆژووگرتن، حەجی ماڵی خوا)

بەشی سێیەم: ئافرەت وکارکردن، کاری قورس وتێکۆشان

بەشی چوارەم: باری کەسایەتی (سالاری ماڵ، تەڵاق، چەند ژنی)

بەشی پێنجەم: شایەتی دان

بەشی شەشەم: کاروباری وولات (سەرۆکایەتی، وەزیرایەتی، قازییاتی، کاری بازاڕ).

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕەوڕەوەی مێژووی مرۆڤایەتی، جۆر وشێوەی ژیانی ئادەمیزادی گۆڕی لە تاریكیەوە بۆ ڕووناكی، لە نەزانیەوە بۆ زانست وپێشكەوتن. ئیسلام ڕاپەڕینێكی فیكری و عەقلی ودەرونیە، دەروازەی كردوە بۆ چارەسەری كێشەكانی ناو كۆمەڵگاكان، ڕووبەڕوویان بۆوە بە چارەسەری بنەڕەتی بۆ هەندێكیان، چارەسەری كاتی بۆ هەندێكی تریان بە بەڵگەی ڕاست وقەتعی ، كەس نكوڵی تیا ناكات تەنها نەزانێكی حاقدو هەڵگەڕاوە نەبێت.

هەروەك لە بەرگی یەكەم باسمان كرد كەوا ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ هەریەكێك لە نێر و مێ ئەرك و فەرمانی تایبەتی بۆ داناوە، كە گونجاو بێت لەگەڵ فیترە و خەلیقەتی، چونكە لە فیترەتی جەستەیی و دەرونیدا یەكسانی تەواو نین، تاوەكو هەمان ئەرك وفەرمانیان یەكسان بێت. لە ئیسلام تەوكاری هەیە نەوەك یەكسانی تەواو. لە حوكمەكانی شەرعیشدا بەیەكچوون هەیە، بەلام یەكسانی تەواو نیە.

هەردەم حوكمەكانی شەریعەتی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی جیاوازیەكان و لەیەكچووەكان لە هەدروو ڕەگەزدا بە ڕێوە دەچێت. گەر بنەماو مەرجەكانی ئەو ئەركانانە یەكسان بوون ئەوا فەرمانەكەش یەكسان دەبێت، ئەگەر بنەماو و مەرجەكان یەكسان نەبوون ئەوا فەرمانەكەش یەكسان نابێت. هەر ئەو پەیڕەوە چەسپاوە توانای دابین كردنی یەكسانی ڕاستەقینەی هەیە لە نێوان بەندە فەرمان پێدراوەكاندا. هەر ئەوەشە مانای دادپەروەری تەولو لە فەرمان وسزاو پاداشت دەگەیەنێ. واتە خوای گەورە ژیانی ئادەمیزادی بە گوێرەی پابەندە بنچینەیی یە دیاری كراوەكان (القواعد الإلزامية المعينة) ڕێكخستووە.[1]

بە هۆی بوونی یاسای یەكسانی و جیاوازی، دەبینین كەوا ئیسلام لە هەندێ ئەرك و فەرمان یەكسانی كردووە نێوان نێرینەو مێینە، لە هەندێكی تر جیاوازی

---

[1] ـ عبد الكريم زيدان، المفصل في أحكام المرأة، 183/4. والسرخسي، محمد بن أحمد، 283/1.

کردووە. هەروەك لە خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

1- شەریعەتی ئیسلام یەکسانی کردووە لە نێوان هەردوو ڕەگەز لە بنەماکانی باوەڕهێنان و بەندایەتی، وەك: نوێژ وڕۆژوو، حەج کردن وزەکات دان، چونکە هەردوو ڕەگەز هاوبەشن لە بنەماکان وشەرتەکانی ئەو ئەرك و فەرمانانە (لاشتراکهما في مناط التکلیف)، کە بریتین لە پێگەیشتن وعاقلی (البلوغ والعقل) ، لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازی بچوك لە چۆنیەتی پێ هەڵسان بەو کارە، نەوەك جیاوازی لە خودی کارەکە.

2- شەریعەتی ئیسلام یەکسانی کردووە لە نێوان هەردوو ڕەگەز لە مافی موڵکایەتی (حق التملیك)، چونکە هەردوو ڕەگەز هاوبەشن لە بنەماکان وشەرتەکانی ئەو هەقە کە بریتین لەخۆگرتنی دارایی ولێوەشاوەیی(الذمة المالیة والأهلیة). کە هەردووکیان چەسپاوە بۆ پیاوو ئافرەت.

3- شەریعەتی ئیسلام یەکسانی نە کردووە لە نێوان هەردوو ڕەگەز لە چەند هاوسەری(التعدد). ئەو مافە چەسپاوە بۆ پیاو، بەڵام بۆ ئافرەت قەدەغەکراوە، چونکە هۆکارێکی سەرەکی یە بۆ تێکەڵ بوونی نەوەکان(اختلاط الأنساب). لەبەر ئەوەی دروست بوونی کۆرپەلە لەناو سکی ئافرەتە، بۆیە چەند هاوسەری بۆ ئافرەت تێکەڵ بوونێکی حەتمی وگومان لێنەکراوی نەوەکانە.

4- یەکسانی کردن لە نێوانیان لە هەندێ مافەکان، دەبێتە هاتنە کایەی زەرەرمەندی و شێوانی کۆمەڵگە(المفاسد والأضرار). وەك: پێدانی مافی هاتووچۆی سەربەست بۆ پیاوان بەتەنهایی، بەڵام بۆ ئافرەت بەمەرجی بوونی کەسێکی تری نزیکی وەك هاوسەر، یان مەحرەم. ئەوەش لە دەروازەی ئەو یاسا فیقهیەیە کە دەڵێت: بەرهەڵستی زەرەرمەندی لە پێش بەدەست هێنانی قازانجە(ذلك من باب- دفع المضار مقدم علی جلب المنافع).[1]

1ـــ خلاف، عبد الوهاب، علم أصول الفقه، ص235.

5- جیاوازی لە هەندێ ماف لەسەر ئەو پێوەرەی کەوا کامەیان گونجاو ترە بۆ ئەنجامدانی کارێك. وەك مافی لە خۆگرتن ولە ئامێز گرتنی منداڵ (الحضانة) دراوەتە ئافرەت، چونکە شایانی ئەوەیە بەو کارە پیرۆزە هەڵسێت بە جوانترین شێوە.

6- جیاوازی نێوانیان لە ئەرکێك لەبەر جیاوازی توانای ئەنجامدانە. وەك ئەوەی نێرینە بە تواناترە لە ئەنجامدانی کاری جیهادی، شەڕوشۆڕ، کاری قورس.

7- لەوانەیە جیاوازی لە ئەرك وفەرمان لەسەر ڕۆشنایی دابەش کردنی کارەکان بێت لە نێوانیان بۆ بەرژەوەندی هەردووکیان، گونجانی ئەوکارە لەگەڵ سروشتی هەریەکێکیان. وەك: بژێوی خێزان و منداڵ لەسەر پیاوە، پەروەردەی منداڵ و چاودێریماڵیش لەسەر ئافرەتە.

8- لەوانەیە جیاوازی لە هەندێك ئەرك وفەرمان بۆ لابردنی ماندویی وئیحراجی بێت(الحرج و المشقة)، یان سوك کردنی پابەند بوون(تخفیف الالتزامات) بێت لەسەر یەکێك لەو دوو ڕەگەزە. وەك: نەگرتنی ڕۆژوو لە لایەن ئافرەتی سك پڕ، ئافرەتی خاوەن منداڵی شیرەخۆرە وگێڕانەوەی ڕۆژووەکان لە دواییدا. لە هەندێ باری تردا لێبوردراوە بەتەواوی وەك: نە گێڕانەوەی نوێژەکان دوای تەواو بوونی ڕۆژانی بێ نوێژی.

ئەو ئاینە پیرۆزە لە کاتی دانان و داواکردنی هەر ئەرك و فەرمانێکی شەرعی ڕەچاوی فیترەت وخەلیقەت وتوانای ئەو کەسە دەکات، بەدەنگی ئەو تایبەتمەندیەوە دەچێت وئاڕاستەی دەکات بۆ بونیادنان وسەربەرزی. واتە کۆنترۆڵی ئەو فیترەت وخەلیقەتە دەکات کە لکاوە بەناخی هەموو کەسێکەوە، نە جڵەوی وا بۆ شل دەکات بە ئارەزووی خۆی چی بوێ بیکات، نە بەتەواوی خامۆش وکپ و بەندی دەکات. واتە خوای گەورە هیچ شتێکی وای فەرمان نەکردووە کەوا ببێتە حەرەج و ماندو بوونی جەستەیی و دەرونی بۆ بەندەکانی، بەڵکو هەموو ئەرکەکانی واقعیەو سوك و ئاسانە. هەروەك دەفەرموویێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾البقرة: 286 ﴿مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ المائدة: 6 ﴿يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ النساء: 28

بەگشتی مانای ئەو ئایەتانە ئەوەیە کەوا خوای گەورە هەر تەکلیفێکی شەرعی بۆدانـاون بـە گـوێرەی تواناتانـە، خـوای گـەورە نایـەوێت بەنـدەکانی خـۆی بخاتـە حەرەج و نارەحەتیـەوە. هـەروەها خـوای گـەورە دەزانـی بەنـدەکانی لاوازن، بۆیـە هەندێ ئەرك و فەرمانی بۆیان سوك کردووە.

دکتۆر إبراهیم عبد الله المرزوقی دەڵێـت: ( هـەروەك چۆن لـە یاسـای دادوەریـدا هەندێ یاسای هەڵاوێردراو هەیـە (اســتثناءات قانونیــة)، ئـەوا دەتـوانین بڵـێین ئـەو فەرمانانەی کەوا خوای گەورە سوکی کردووە، یان لایـداوە بەشـێوەیەکی کـاتی لـە هەندێ باری تایبەتدا لەسەر یەکێك لەو دوو ڕەگەزە، لەو شـێوازە یاسـایانەیە. ئـەو یاسا هەڵاوێردراوانەش بە یەکێك لە تایبەتمەندیە چاکەکانی ئاینی ئیسلام دادەنرێت، چونکە تیایدا ڕەچاوی باروبۆخی هەندێ کەس دەکات تاوەکو جیایـان بکاتـەوە لـە خەلکانی تر لە ئەرك وفەرمان. مەبەستی سەرەکیش لەوە ئەوەیە کـە دانـانی ئـەرك وفەرمان بە گوێرەی توانایە. ئەو تایبەتمەندیەش نموونەیەکـە لـە سـەر ئـەوەی کـە ئاینی ئیسلام ویاساکانی مامەلەی بەزەییانە ونەرم ونیانە لەگەڵ هـەموو چـینەکانی کۆمەڵ).[1]

---

1ــ المرزوقي، إبراهيم عبد الله، حقوق الإنسان في الإسلام، ص22، رسالة الـدكتوراه فـي جامعة أكستر في المملكة المتحدة عام 1999م.

# بەشی یەکەم

## حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە وپۆشاك و چاوداگرتن و تێکەڵاوی وحەیاو شەرم

**باسی یەکەم؛ حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە وپۆشاك**

**باسی دووەم؛ حوکمەکانی پەیوەست بە چاوداگرتن، مانەوەی ئافرەت لە ماڵەوە و تێکەڵاوی و حەیاو شەرم**

# باسی یەکەم

## حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە و پۆشاک

بەندی یەکەم: حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە

بڕگەی یەکەم: واتای ڕازاندنەوە (الزينة)

بڕگەی دووەم: بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا ئافرەت ئارەزووی لە جوانی و خۆڕازاندنەوەیە

بڕگەی سێیەم: مەرجەکانی خۆ ڕازاندنەوە بۆ ئافرەتان

بڕگەی چوارەم: ڕازاوەیی پیاو بۆ خێزانی

بەندی دووەم: حوکمەکانی پەیوەست بە پۆشاک

بڕگەی یەکەم: دا پۆشین و فیترەت

بڕگەی دووەم : مەرجەکانی پۆشاکی خۆ دا پۆشین

بڕگەی سێیەم: دروست کردنی گومان بەرامبەر بە خۆ دا پۆشین

## بەندی یەکەم: حوکمەکانی پەیوەست بە ڕازاندنەوە

پۆشاك خەلاتێکی خوای گەورەیە بە مرۆڤایەتی بەخشیوە، فێری کردوون وبۆی ئاسان کردوون، یاسای بۆدانـاوە. پۆشاك عەورەت دادەپۆشێ وهۆکارێکی ڕازاندنەوەو جوانیە.

بەکارهێنانی پۆشاك دیاردەیەکی شارستانیەت وپێشکەوتنە. پۆشاك، خۆڕازاندنەوە و خۆجوانکردن لە گرنگترین ئەو شتانەن کە ئادەمیزاد (نێرو مێ) لە گیانلەبەران جیا دەکاتەوە. بەرامبەر بەوەش داماڵینی پۆشاك و ڕووتی لەش لە سروشت وسیفەتی گیاندارانە، بەڵگەی ژیانی سەرەتایی ونەزانیە، گەڕانەوەی کاروانی مرۆڤایەتی یە بۆ دواوە، بۆ هەزارەها ساڵەی پێش مێژووە.

هۆکارەکانی خۆ داپۆشین وڕازاندنەوە جیاوازە، لە کاتێك بۆ کاتێکی ترو لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێ ، بەڵام لە بنەڕەتدا یەکسانن کە ئەویش بەدەست هێنانی مەبەستەکانیەتی کە خۆیان لە عەورەت داپۆشین ڕازاوەیی دەنوێنن، دەرکەوتن بە دیمەنێکی جوان. ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش بەرنامەی تایبەتی بۆ داناوە کە تیایدا پەیڕەوی سروشت و فیترەتی هەردوو ڕەگەزی تێدا کردووە.

### بڕگەی یەکەم: واتای ڕازاندنەوە (الزينة)

الزينة:( زەوی بە ڕووەك وگژو گیا خۆی ڕازاندۆتەوە. وأزَّيَنت وأزيانــت : واتە باش وجوان ودرەوشاوەبوو. لە کتابی (التهذيب) دا هاتووە: ناوێکە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە ئادەمیزاد بە هۆیەوە خۆی دەڕازێنێتەوە).[1]

#### یەکەم: ئافرەت و ڕازاندنەوە ( المرأة والزينة )

خوای گەورە هەر لە خۆڕسکەوە ئارەزووی خۆ ڕازاندنەوە، خۆ جوانکردن، ڕۆیشتن بە لەنجەو لاری لەناو ناخ و دەرونی ئافرەتان خولقاندووە. ئەوەتا دەبینین هەر لەسەرەتای ژیانی هێلکەی مێینە کە خۆی دەنوێنێ لە ئافرەتدا، کاتی هاتنە

---

1- ابن منظور، لسان العرب، 130/6.

دەرەوەی لە ناو هێلکەدان وڕۆیشتنی بۆ ناو جۆگەی هێلکەدان ومنداڵدان تاوەکو بگات بەو سپێرمەی کە خوای گەورە بۆی داناوە ببێ بە هاوبەشی ژیانی، هەر لەو کاتەوە دەبینین بە جوانترین شێوە خۆی ڕازاندوتەوە، کڵاوەی زێڕینی پۆشیوە کە هەرلەدوورەوە دەدرەوشێتەوە (التاج المشع- Corona Radiata)، کاتی بە ڕێ کەوتنی زۆر لەسەرخۆ دەڕوات و لەنجەو لاری پێوە دیارە، بەژمارەیەکی زۆر لە خانەی پارێزەر دەورەدراوە بۆ پاراستنی لە مەترسیەکانی ڕێگەو دەوروبەر. گەر سەرنجی ئەو دیمەنە بدەین دەبینین خۆی لە شاژنێکی جوان وناسك ونازدار دەنوێنێ ، تاجی زێرینی بەسەرەوەیەو بەخزمەتکار دەورەدراوە بۆ پاراستنی، ئەو خانانە پێیان دەوترێت خانەی کلاوەی درەوشاوەی دەنکۆڵەدار کە لە جوانی هێلکەو ئەو دیمەنە زیاد دەکەن(الخلايا الأكليلية المشعة المحببة - Corona Radiata granulose cells).

ئایا ئەو دیمەنەی هێلکەو خانەکانی دەوروبەری بە جوانترین شێوە لە ژیانی ئافرەت ناچێت، کە هەردەم ئارەزووی جوانی خۆڕازاندنەوە دەکات، بەدایك وباوك و براو خوشك وکەس وکاری دەورەدراوە، کە بەهەموویان خزمەتی دەکەن و دەیپارێزن، تاوەکو دەگاتە هاوبەشی ژیانی خۆی و هاوسەری، ئەوکات هەردووکیان پێکەوە ژیان دەبەنەسەر، هەروەك چۆن هێلکە دوای گەیشتن بە سپێرمی دیاری کراو دەست دەکەن بە ژیانی هاوبەشی خۆیان و ناهێڵن هیچ سپێرمەکی تر بێتە ناو هێلکەوە هەرچەندە گەر ژمارەی سپێرمە هێرشبەرەکان ملیونەها بێت.

ئەو دیمەنە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئافرەت هەر لە خەلیقەتەوە ئارەزووی جوانی وخۆ ڕازاندنەوەی هەیە، هەر بۆیە ئاینی ئیسلام گرنگی بەم باسە داوە و فەرمانی نەکردووە بەوەی ئافرەت بەتەواوی دووربکەوێتەوە لەو شتانە، یان لێیان قەدەغە بکات، چونکە ئاینی ئیسلام ئاینی خوایە، چۆن لەلایەك هەر لە خەلیقەتەوە ئارەزوویەك لە ئافرەتدا دروست دەکات و، پاشان لە ژیانی دونیا لێی قەدەغە دەکات، ئەوە لە زانایی ودانایی وحەکیمی خوای گەورە ناوەشێتەوە، هەروەك

فەرموویەتی: لەدروستکراوەکانی خوادا هەرگیز دژایەتی ونەگونجان نیە﴿مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ﴾ الملـك: 3 بەلام ئاینی ئیسلام بەرنامە و مەرجی تایبەتی بۆداناوە هەروەك چۆن بۆ گشت كاروبارەكانی تری ژیان پەیڕەو پرۆگرام وبەرنامەو ئاسانكاری بۆ داناوە، بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بزانن چۆن ئەو شتانە بەكاربهێنن تاوەكو تووشی گومڕاوی وسەرلێشێواوی لە ژێر كاریگەری ئارەزووەكانی خۆیان و شەیتانی جینی وئادەمیزاد نەبن.

خۆڕازاندنەوە حەلاڵە بۆ ئافرەتان هەروەك بەدەنگەوە چونێك بۆ ئارەزووە فیترییەكانیان. هەموو ئافرەتێك حەز دەكات بەوەی كە جوان بێت وجوان خۆی بنوێنێ وخۆی بڕازێنێتەوە. ئاینی ئیسلامیش دەیەوێت سروشتی ئافرەت تایبەتمەندی خۆی هەبێ لەوبوارەوە، هەر بۆیە قەدەغەی كردووە بەوەی ئافرەت لە كاروكردەوەو پۆشاك ودیمەن وهەڵسوكەووت وڕۆیشتن وگفت وگۆدا لاسایی پیاو بكاتەوە.

لە كۆتایدا بۆمان دەركەوت كەوا جوانی وڕازاندنەوە سیفەتێكی خۆڕسكی ئافرەتانە هەر لەسەرەتای دروست بوونیەوە كاتێ لە قۆناغی هێلكەیە، دوای تەمەنی منداڵی و پێگەیشتوویی وتاوەكو دەگاتە پیری و پەككەوتەیی، هەروەك لە لاپەڕەكانی داهاتوودا باسی دەكەین.

## بڕگەی دووەم: بەڵگەكان ئاماژە بەوە دەكەن كەوا ئافرەت ئارەزووی لە جوانی و خۆڕازاندنەوەیە (الأدلة على حبّ المرأة للتزيّن والتجمّل)

### یەكەم: بەڵگەی قورئانی

1- ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ الزخرف: 16-18 .

ئیبنو کثیر[1] لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێ: ئافرەت هەندێ کەم وکورتی هەیە دەیەوێت ئەو کەم وکورتیانە بە خۆڕازاندنەوەو خۆجوانکردن پڕ بکاتەوە.[2]

ئیمامی طبري[3] لە ئیبن عباس دەگێڕێتەوەو دەڵێ: مەبەستی خوای گەورە لەو ئایەتە کەنیزەو ئافرەتە، کە ناویان دەبات بەوەی لەناو خشل وزێرو زیودا نەش و نماو گەشەی کردووە.[4]

گەر بە وردی لەو ئایەتە پیرۆزە بکۆڵینەوە بۆمان دیار دەکەوێت تا چ رادەیەك ئافرەت پەیوەستە بە خۆشەویستی بۆ خشڵ وئارەزووی بۆ خۆ جوانکردن و رازاندنەوە، چونکە دەفەرموێ لەگەڵ ئەوانە گەشەی کردووە، هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە پێیانەوە ئاشنا بووە، ناتوانێ لێیان جیا بێتەوە ودوورکەوێتەوە. لەلایەکی تر، دەفەرموێ لەکاتی تەنگانەو شەڕو کوشتاردا دیار نیەو ڕۆڵی بەرچاو نابینێ. ئەوانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا شوێنی کاری ئافرەت زیاتر لە ماڵەوەیەو دوور بێت لە هۆکارەکانی توندوتیژی وپێکدادان وکاری قورس.

2- ﴿وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّ﴾النور: 60.

ئەو ئافرەتانەی کەوا پیر بوونەو چاوەڕێی ئەوەیان لێ ناکرێت کەوا شوو بکەن، دەتوانن هەندێك لە پۆشاکەی خۆیان دابکەنن کە پێشتر پێویست بوو بیپۆشن،

---

1ـ ابن کثیر: أبو الفداء، عیمادەالدین کوڕی کثیری دیمەشقی شافعی یە، مێژوو نووس، خاوەن تەفسیرو فەموودەیە، فەقیهە وزانا بووە. لە ساڵی 700 کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی 774 ی کۆچی لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. کتابی زۆری داناوە، وەك: تەفسیری قورئانی گەورە، سەرەتاو کۆتایی لە مێژوو.

ابن حجر، الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، 399/1. الشوكاني، البدر الطالع، 153/1.

2ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 106/4.

3ـ الطبري: ئەبو جەعفەر موحەمەد کوڕی جەریری طبریە، ئیمامێکی موجتەهید بووە، کتابێکی زۆری داناوە لە زانستە جیاجیاکان، لە ساڵی 224 ی کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی 310 کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

الخطيب البغدادي، تاريخ بغداد، 162/2. وابن كثير، البداية والنهاية، 145/11.

4ـ الطبري، جامع البيان، 73/13.

بەلام لەگەلّ ئەوەشدا نابێت وایان لێ بكات جوانی ڕازاوەیی خۆیان نیشان بدەن بە كەسانی بێگانە. ئەو ئایەتەش بۆمان دیاری دەخات كەوا ئافرەت هەرچەندە پیرو بەتەمەن بێت هەر حەزی بە جوانی وئارەزووی لە خۆ ڕازاندنەوەو دەرخستنی ئەو ئارەزوویە، هەر بۆیە خوای گەورە دەرخستنی ئەو جوانی وڕزاندنەوەیەی قەدەغە كردووە كە دەبێتە هۆكارێك بۆ فیتنەو هەلّچوونی ئارەزووی جینسی.

3- خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾الأحزاب: 33.

تبرج: بریتیە لە ڕۆیشتن بە لارو لەنجەو خۆبادان وخۆ دەرخستن. ئەو ئایەتە داوا لە ئافرەتان دەكات كەوا مالّ بكەنە شوێنی كاری خۆیان ولاسایی نەزانان نەكەنەوە.

ئەو سێ ئایەتە بە شێوەیەكی تایبەت وڕاستەوخۆ باسی ئافرەت وخۆ ڕازاندنەوەیان دەكات، چونكە خوای گەورە دەزانێ ئافرەت لە فیترەتەوە ئارەزووی ئەو جۆرە شتانەی هەیە، ئەمەش كارێكی خۆنەویستەو لە توانای ئافرەت بەدەرە. هەروەها قەدەغەیان دەكات لەوەی جوانی خۆیان بە بێگانە نیشان بدەن هەرچەندە گەر بەتەمەن داچووبن، چونكە ڕوكاری دەرەوەی لەشیان سەرچاوەی فیتنەو هۆكاری بزواندن وهەلّچوونی ئارەزووی جینسیە، بۆیە داوایان لێدەكات لەو جۆرە كارانە دوور كەونەوە بەرنامەو یاساو مەرجی تایبەتیان بۆ دادەنێت.

**ب- بەلّگەكان لە فەرموودەكانی پێغەمبەر**

1- بۆ ئافرەتان بەكارهێنانی خشل وزێڕو زیو حەلالّە بۆ خۆ ڕازاندنەوە. لە بەرای كوڕی عازبﷺ دەگێڕنەوە[1]، دەلّێ: پێغەمبەری خوداﷺ حەوت شتی لە

1ـ البراء بن عازب الأوسي الأنصاري: یەكێكە لە هاوەلّە گەورەكان، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، لە كوفە كۆچی دوایی كردووە لە سالّی 72 ی كۆچی.
ابن حجر، الإصابة، 278/1 . وابن كثیر، البدایة والنهایة، 328/98.

ئێمە (پیاوان) قەدەغە کردووە: ((ئەنگوستیلەی زێڕ، ئاوریشم وئیستەبرەق... )) [1]
(( نهى عن خاتم الذهب- أو قال حلقة الذهب، وعن الحرير والإستبرق، والـديباج والمثيرة الحمراء والقسيّ وآنية الفضة...)).

2- ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ [2] دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((زێڕو زیو بۆ مێینەی ئوممەتی من حەلالە و بۆ نێرینەکان حەرامە))
((أحل الذهب والفضة لإناث أمتي وحرم على ذكورها)). [3]

ئیمامی شەوکانی دەڵێ: ( لە کۆمەڵەی موسڵمانان وەرگیراوە کەوا ئەو شتانە بەتایبەت حەڵاڵە بۆ ئافرەتان بەکارهێنانیان، لەلایەن پیاوانەوە قەدەغە کراوە). [4]

3- لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ: ( دیویەتی کەوا ئوم کلثـومی کچی پێغەمبەری خوا کراسێکی ئاورشمی پۆشیوە). ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە شەرحی ئەو فەرموودانە دەڵێت: لەبەر کەمی ئارام گرتنی ئافرەت لەسەر بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە هۆکاری ڕازاندنەوەن، بۆیە خوای گەورە بە بەزەیی خۆی ڕێگەی پێداون، بەڵام دەبێ ئەو ڕازاندنەوە بۆ هاوسەرو مەحرەمەکان بێت. [5]

4- لە بەکرەی کچی عوقبە ﷺ [6] دەگێڕنەوە کە چووەتە لای عائشەی دایکی موسڵمانان وپرسیاری خەنەی لێکردووە، فەرموویەتی: (( دارێکی پیرۆزە، ئاوەکەی پاکە... )) (( شجرة طيبة، وماؤها طهور، وسألتها عن الحفاف، فقالت: إن كان لكِ

---

1ـ البخاري، 77- كتاب اللباس، باب:خاتم الذهب، الرقم:5863، 388/10.

2ـ عبد الله بن موسى بن سليم الأشعري: ئەبو موسا، یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکان، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، لە خوێنەرە بەڕێزەکانی قورئانە، لێپرسراویەتی زۆری وەرگرتووە لە خەلافەتی ئیمامی عومەر، بەشداری زۆربەی فتوحاتی کردووە، لە شەڕی صفین یەکێك بوو لە دوو ناوبژیکەران، پاشان لە ماڵ دانیشت، دەنگی زۆر خۆش بوو لە قورئان خوێندن، لە ساڵی 44 ك کۆچی دوایی کرد. ابن حجر، الإصابة، 211/4. وسير أعلام النبلاء، 380/2.

3ـ الطبراني، المعجم الكبير، 152/11.

4ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 86/2.

5ـ البخاري، 77- كتاب:باب:30 الحرير للنساء الرقم: 5842، 365/10. و388/10.

6ـ بكرة بنت عقبة: هەندێك فەرموودەی لە عائشەوە گێڕاوەتەوە، زانا مەعالی کوڕی زینادی القطنـي هەندێ فەرموودەی لەوی گێڕاوەتەوە. كحالة، أعلام النساء، 118/1.

زوج فاستطعتِ أن تنتزعي مقلتكِ فتصنعينها أحسن مما هما فافعلي)).[1]

5- پەسەندە دەست لەخەنە گرتن بۆ ئافرەتان.

له عائیشەوە ‌دەگێڕنەوە دەڵێت: (( پێغەمبەری خوا ﷺ لای ناخۆش بوو کە ئافرەت بە دەست بەخەنەیی نەبینێ)) ((كان رسول الله ﷺ يكره أن يرى المــرأة ليس في يدها أثر الحناء والخضاب)).[2]

6- له عائیشەوە ‌دەگێڕنەوە دەڵێت: (( پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ئەو ئافرەتەم خۆش ناوێت کە چاوی بە کل و دەستی بەخەنە نەکات ))((إنــي لأبغض المرأة أن تكون سلقاء مرها،[3] لا يكون في عينها كحــل، ولا فــي يــدها خضاب)).[4]

7- له عائشەوە ‌دەگێڕنەوە دەڵێت: ( هەموو ڕازاندنەوەیەك بۆتان حەلالە بەمەرجێ مەبەستی خۆدیارخستن و لاروولەنجەو دیارکەوتنی شوێنە حەرامەکانی تیا نەبێ).[5]

لەو فەرموودانە دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

أ- بەڵگەن لەسەر حەزو ئارەزووی خۆڕسکی ئافرەت بۆ هەموو هۆکارێکی خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوە، هەر بۆیە جۆرەکانی بۆ باسکردوون و حوکمەکانی بۆیان ڕوون کردۆتەوە.

ب- گرنگی دانی ئاینی ئیسلام بە ئافرەت وکاروبارە تایبەتیەکانی و بەدەنگەوەچوونی فیترەت وخەلیقەتی تاوەکو لە کاتی بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕازاندنەوە نەکەوێتە ناو حەرام و گومان.

---

1ـ الرازي، الجرح والتعديل، الرقم: 1534 ،332/8.
2ـ سنن الكبرى، البيهقي،311/7. والمناوي، الفيض القدير، شرح الجامع الصغير، 244/5.
3ـ سلقاء: دەستی بەخەنە نەکات، والمرها:چاوی بە کل نەکات. ابن الأثير،أبو السعادات، 387/2.
4ـ سنن النسائي، بشرح الحافظ جلال الدين السيوطي وحاشية الإمام السندي، 142/8.
5ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 269/3.

ج- هاندانی ئافرەت بۆ بەکارهێنانی خەنەو کل وەك هۆکارێکی خۆ ڕازاندنـەوە، تاوەکو بە دیمەنێکی وا دیاریکەوێت گونجاو بێت بە سروشـتە ناسکەکەی ئـافرەت، شێوەکەی لە پیاوان جیا بێت.

د- حەرام و قەدەغە کردنی هەندێك کەل وپەلی ڕازاندنەوە بـۆ پیـاوان وەك زێـڕو ئاوریشم، چونکە وەك ئـافرەت لـە فیترەتـەوە ئـەو ئـارەزووەی بـۆ نـەخولقێنراوە، بەڵکو پێویستە بە دیمەنێکی وا دیار بکەون گونجاو بێت لەگەڵ ئارەزووەکانی کـارو چوونە پێش وڕووبەڕوو بوونەوە.

ج- بەڵگەکانی عەقڵی وزانستی

1- دەرچوونی هێلکە لە هێلکە دان بـەو شـێوە جـوان وڕازاوەی باسمـان کـرد و ڕۆیـشتنی بـە لەنجـەو لارو دەورەدرانـی بـە ژمارەیـەك لـە خانـەی پـارێزەر. دوای لەدایکبوونی دەکەوێتە ئامێزی گەرمی دایکی، لـە ژێـر چـاودێری وخزمـەتی دایـك و باوك و خوشك وبرای دەبێت تا گەیشتن بە ژیانی هاوسـەریەتی و کەوتنـە ژێـر ڕێـزو پارێزگاری هاوسەرو کەس وکاری. ئایا چ دەلال و نازێك هەیە لـەوە زیـاتر. هـەروەك لەفیترەت وخەلیقەتەوە ئەو ئارەزووانەی بۆ دابین کراوە، هەر بە هـەمان شـێوە لـە ژیانی دونیاش بـۆی دابـین وئاسـانکراوە، بـەڵام زۆرجـار بـە هـۆی هـەواو ئـارەزووی خەڵکی نـەزان ونەفـسی شـەر خـواز لـەو بەرنامەیـە جـوان ولـە پـەیڕەوە داڕێـژراوە لادەدات ودەکەوێتــە داوی شــەیتانی ئــادەمی و جنۆکــە و کەســایەتی خــۆی وون دەکات و لاسایی ڕەگەزی تر دەکاتەوەو ناهەمواری بۆ خۆی وخێزانەکەی دەهێنێ.

2- کەمی توش بوونی ئافرەت بـە هەنـدێ نەخۆشـی لـە تەمـەنی پێگەیـشتن و تەمـەنی زاوزێ - بـەهۆی بـوونی هۆرمونـەکانی تایبـەت بـە ڕەگـەزی مێینـە- کـە لەوانەیە جوانیەکەی بشێوێنێ، کاریگەری دەرونی بۆ دروسـت بکـات وەك: کـەوتنی قژی سەر.[1]

---

1- بنوارە: بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم/ باسی دووەم.

هەروەها لە کاتی حەج کردن بۆ ئافرەتان تەنها کورتکردنەوەی قژ دانراوە– نەوەك تاشین– ئەوەش لەبەر ئەوەیە خوای بە بەزەیی ئاگاداری ئارەزووە فیترییەکانی ئافرەتە کە حەزی بە جوانیە. زانایانی ئیسلام دەڵێن: تاشینی قژی ئافرەت کاتی حەج و کاتەکانی تریش مەکروهە، چونکە وەك سووکایەتی پێکردن و پێکچوونە بە پیاوان.[1]

3– هەروەك باسمان کرد کەوا زۆربەی چالاکی کچۆڵە بۆ ناوەوەیە، هەر بۆیە نیشانەکانی خۆ ویستی وخۆ خۆشەویستی هەر لەتەمەنی منداڵییەوە لەسەریان دیاردەکەوێ. بەو هۆیەوە ئەم کچۆڵەیە هەست بەوە دەکات کەوا پێویستی بە خۆ جوانکردن هەیە تاوەکو سەرنجی کەسانی تر رابکێشێ بۆ لای خۆی بەتایبەتی رەگەزی تر، هەروەها خۆدەرخستنی بەوەی کەوا خەڵکانێك خۆشیان دەوێت.[2]

4– دەتوانین بپرسین کام ئافرەت هەیە کاتی خوازبێنی داوای بڕێکی باش لە خشڵ و زێڕو پۆشاکی جوان نەکات؟ بۆ ئەوەی خۆی پێ برازێنێتەوە کاتی بوکێنی، لەهەمان کاتدا خۆی پێ هەڵکێشێ لە نێوان دەستە خوشك وهاوڕێکانیدا.

5– زانا فەرید وەجدی[3] لە فەرهەنگەکەی دا دەڵێت: هەموو خەڵك دەزانن کەوا ئافرەتان هەر لە خەلیقەتەوە حەزو ئارەزوویەکی توندو خۆنەویستیان هەیە بۆ هەموو شتێکی جوان و درەوشاوە، چونکە هەست دەکات بەوەی پێویستی بە جوانیە و ئارەزووی ئەوەی هەیە کەوا سەرنجی خەڵکان بەلای خۆی کێش بکات. هەرشتێکیش بۆ خۆ رازاندنەوە بەکاربهێنرێ کارگەریەکی زۆر لەسەریان دروست دەکات، زۆر بە زەحمەت توانای بەرەنگاری ئەو ئارەزووەی دەبێت و ژیرترین و پاکترین ئافرەت لەو ئارەزووە و لەو یاسایە هەڵناوێردرێ.[4]

---

1ـ شربيني، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، 502/1.

2ـ ريا إبراهيم، سيكولوجية المرأة، ص45.

3ـ محمد فريد الوجدي:نووسەر، ڕۆژنامە نووس، ئەدیبێکی میسریە، لە ساڵی 1878 لە دایك بووەو لە ساڵی 1954 کۆچی دوایی کردووە، لە گرنگترین کتابەکانی فەرهەنگی سەدەی بیستەمە. المنجد في الأعلام، ص611.

4ـ وجدي، محمد فريد، دائرة المعارف القرن العشرين، 596/8.

لە قورئانی پیرۆز هیچ ئایەتێك بە ڕاستەوخۆ وەیان ناڕاستەوخۆ دەربارەی خۆ ڕازاندنەوەی پیاوان نەهاتووە، تەنها یەك ئایەت هاتووە کەوا بانگێشەی هەموو موسڵمانان دەکات بە خۆ ڕێکخستن وخۆ جوانکردن وڕازاندنەوە بە پۆشاك وبۆنی خۆش کاتی چوونە مزگەوت و نابێ ڕووتەڵە دیار بکەون.[1] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ الأعراف: 31.

## برگەی سێیەم: مەرجەکانی خۆ ڕازاندنەوە بۆ ئافرەتان

1- ئەو جوانکاری وخۆ ڕازاندنەوەی بۆ ئافرەتان ڕێگەی پێدراوە لە چوار چێوەیەکی دیاری کراوە. کە بریتیە لە پۆشاکی ئاوریشم، خشڵ وزێڕو زیو، کل و خەنە، چاککردن و ڕێکخستنی قژی سەر، لەگەل بەکارهێنانی هەندێ کەرەسەی تری جوانکاری کە ئافرەتان لەناوماڵەکانیان بەکاری دەهێنن.

ئەو شتانەی کە لەدەرەوەن و دیارن وەك ئەنگوستیلەو حەلقە، خەنەی دەست و کلی چاو کە ناتوانرێ بشاردرێنەوە، دیارکەوتنیان بۆ بێگانە هیچ گومان و گوناهێکی تیا نیە، بەڵام بازنەی دەست و خلخاڵی پێ و ملوانکەو پشتێنەو گوارە کە لەو شوێنانەن تەماشا کردنیان ڕەوا نیەو بە عەورەت دادەنرێن، ئەوا دیار کەوتنیان دروست نیە، چونکە خوای گەورە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز تەماشاکردنی ئەو شوێنانەی حەرام کردووە تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە لەو ئایەتە ناویان هاتووە.[2] کە بریتین لە: هاوسەر، باوك، باوکی هاوسەر، برا، کوڕی برا و کوڕی خوشك، کەنیزەو، خزمەتکار، ئەو پیاوانەی لەماڵیان کاردەکەن وجێگەی گومان نین، ئەو منداڵانەی کە هێشتا ئارەزووی سەیر کردنی ئافرەت ناکەن.

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ

---

1- الطبري، جامع البيان، 210/5. وابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 186/2.
2 - الشوكاني، نيل الأوطار، 117/6.

بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَآءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾النور: 31

2- بۆیان هەیە جوانی ورازاوەییان نیشانی هاوسەرو باوك وبرا و ئەو ئەو پیاوانەی لەماڵیان كاردەكەن وجێگەی گومان نین، ئەو منداڵانەی كە هێشتا ئارەزووی سەیر كردنی ئافرەت ناكەن.

3- نابێ قاچیان بە شێوەیەكی توند لە زەوی بدەن، تاوەكو دەنگی خلخاڵیان بێت وسەرنجی خەلكان بۆ خۆی ڕابكێشێ. سەید قوتب ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێت: ئەو بڕگەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كەوا خوای گەورە خۆی خولقێنەرەو ئاگاداری قووڵ و ووردی هەموو پێكهاتەكانی دەرونی ئادەمیزادە، بە هەموو شتە نهێنی و پەنهانەكانی ئادەمیزاد پسپۆڕو شارەزایە، بۆیە ئەو جۆرە ڕۆیشتنەی پەسەند نەكردووە، چونكە زۆر جار خەیال وئەندێشە كاریگەریان لەسەر هەندێ كەس زۆر زیاترە لە شتی واقعیی و بەرجەستە وەك بزوێنەر بۆ هەڵچوونی ئارەزووی جینسی. هەندێ كەس ئارەزووی جینسیان بە بینینی پێڵاوی ئافرەت، جل وبەرگی، دەنگی خشڵەكانی، بۆنی دەبزوێ، زیاتر لەوەی خودی ئافرەتەكە خۆی ببینێ، یان لەبەر دەستیان بێت. ئەو جۆرە كەسانە زۆرن، دەروونناسان و پزیشكانی دەرونی زیاتر ئاشنان بەم جۆرە كەسانە.[1]

4- قورئان دیاركەوتنی جوانی بۆ بێگانە حەرام كردووە، تەنها ئەو شوێنانەی بە دیار دەكەون، وەك: دەست و دەم وچاو، یان ئەو شوێنانەی كە دوور لە خواست و ئیرادەی خۆدی ئافرەتەكە دیار دەكەوێت. گووتراوە: (إلا ما ظهر منها) بریتیە لە دەست و دەم وچاو: كلی چاوو خەنەو حەلقەی دەست.[2]

---

1 ـ سيد قطب، في ظلال القرآن، 2514/4.

2 ـ طبري، جامع البيان، 158/10.

ئیبن عباسﷺ دەڵێ: مەبەست لە دەرکەوتنی جوانی و ڕازاوەیی: بریتیە لە ڕوو، کلی چاو، دەست، خەنە و حەلقەی دەست، کە ئەوانە هەمیشە بە دیار دەکەون و ئەوانەی هاتوچۆیان دەکەن دەیان بینن.[1]

عائشە ﵂ دەفەرمووێ: ئەسمای خوشکم﵂[2] هاتە ماڵمان وبە پۆشاکێکی تەنك خۆی داپۆشیبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرپەرچی داوەو گووتی: ئەی ئەسما گەر ئافرەت گەیشتە تەمەنی بێ نوێژی بێجگە لە دەست ودەم وچاوی نابێت هیچ شوێنەکی تری دیار بکەوێت. (( یا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحیض لا یصلح أن یری منها إلا هذا وهذا)) وأشار إلی وجهه وکفیه.[3] لە ئەبی هورەیرە﷜ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لەکاتی نوێژدا پیاو دەم وچاوی داپۆشێ. هەر بۆیە زانایان بە کۆمەڵ لەگەڵ ئەوەن کەوا ئافرەت لە کاتی نوێژو ئیحرام بەستاندا دەم وچاوی بەدەرەوە بێ. واتە: گەر لەو دووکاتە پەسەند بێ، ئەوا لە کاتەکانی تردا گونجاو ترو ڕەواترە. ((نهی عن السَدْلِ في الصلاة، وأن یغطي الرجل فاه)). (لذلك أجمعوا علی أن علی المرأة أن تکشف وجهها في الصلاة والإحرام) .[4]

5- حەرام کردنی زۆر لەو کردارە جوانکاریانەی دەکرێت لەناو کۆمەڵگەی ئافرەتان. عائشە ﵂ دەفەرمووێ: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەو ئافرەتە کردووە کە دەنگی بەرز دەکاتەوە، ڕووی خۆی دەتاشێ بەمەبەستی جوانکاری،

---

1ـ مصدر نفسه، 158/10.

2ـ أسماء بنت أبي بکر الصدیق: بە خاوەنی دوو پشتێن ناسراوە، 27 ساڵ پێش کۆچ کردن لە دایك بووە،شووی بەزبێری کوڕی عەوام کردووە، دایکی عەبدوڵایە، پاش شەهید بوونی کورەکەی بەچەند ڕۆژێك کۆچی دوایی دەکات ساڵی73 کۆچی.ابن حجر ،الإصابة، 7/8.والذهبي،سیر أعلام النبلاء،287/2.

3ـ سنن أبي داود کتاب: اللباس باب: فیما تبدي المرأة من زینتها حدیث:4104 ،62/4.

4ـ سنن أبي داود کتاب الصلاة باب: السدل في الصلاة،حدیث:643 ، 174/1. والمالکي، ابن العربي، عارضة الأحوزي بشرح صحیح الترمذي ، کتاب الصلاة ، 170/2.

جل و بەرگی خۆی دادەدڕێ، ڕووی دەرەوەی پێستەی لادەدات بەمەبەستی ئەوەی بریقەدار بێت.((لعن الصالقة، والحالقة، الخارقة، والقاشرة [1])).[2]

**هۆی حەرامکردنی ئەو کردەوانە لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ:**

أ- لەبەر ئەوەی ئەو کردەوانە ڕەوشتی ئافرەتە فاجرەکان بووە، هەر مەبەستی ئەوانە.

ب- لەوانەیە ئەو کردەوانە بۆ فێڵ کردنێك (التدليس) بێت لە پیاوان.

ج- لەوانەیە ببێتە هۆی گۆڕانی خەلقی خوا، وەك کوتانی دەست.

بەڵام ئەو دەرمانانەی کەوا لەکەی دەم وچاو لادەبات، دەیڕازێنێتەوە بۆ هاوسەری، ئەوە هیچی لەسەر ناکەوێت، هەروەها دەرهێنانی مووی زیادەی دەم و چاو، لەوانەیە فەرموودەی (النامصة) مەبەستی تەنها خاڵی سەرەوە بێت.[3]

6- پێویستە هەموو هەوڵی خۆی بدات ڕازاوەیی خۆی بشارێتەوە، گەر دیار کەوت لەبەر هەندێ کاری تایبەتی پێویست، ئەوە چی لەسەر ناکەوێت، وەك: چوونە دەرەوە بۆ کڕینی هەندێ کەل و پەل، شایەتی دان.[4] یان کارکردن بۆ دابین کردنی بژێوی خۆی ومنداڵی گەر کەسی نەبوو. بەڵام زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئافرەت نابێ بچێتە دەرەوەو دەم و چاوی دیار بێ کاتی زۆر بوونی فاسقان.[5]

---

1ـ الصالقة: ( هاوار دەکات کاتی مردنی یەکێك). والحالقة: ( تاشینی ڕوو بەمەبەستی جوانی). الخارقة:(دادڕینی جل وبەرگ کاتی مردنی یەکێك). والقاشرة: ( ئەوەی ڕوکاری پێستەی هەڵدەگرێ تاوەکو بریقەدار بێت ).

ابن الأثير ، نهاية غريب الحديث والأثر، 427/1، 64/1.

2ـ البخاري: 23- كتاب الجنائز، باب:37 ما ينهى عن الحلق عند المصيبة، الرقم: 3،211/1296.

3ـ ابن الجوزي، أحكام النساء، ص342.

4ـ الشوكاني، نيل الأوطار،117/6.

5ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 118/6.

دەبینین پەیوەندیەکی توند هەیە لە نێوان هێلکەی ئافرەت و سپێرم وژیانی کۆرپەلە لەگەل باری ژیانی ئادەمیزاد لە دونیادا. هەروەك بەلگە نەویستە یەك هێلکە بۆ یەك سپێرمە، بۆیە هەر ژنێك بۆ یەك پیاوە. بۆیە هەر لادانێك لەو بەرنامەیە لە هەردوو نموونەدا پشێویەکی وا دروست دەکات و لە کۆتاییدا کارەساتی لێدەکەوێتەوە. هەروەك باسمان کرد لە300 ملیون سپێرم تەنها یەکیان بۆی هەیە بچێتە ناو هێلکەوە، گەر ئەو ژمارە زۆرە وەیان هەندێکیان لە یەك کاتدا چوونە ناو هێلکە ئەوا کارەسات دروست دەبێت بۆ دایکەکەو بۆ کۆرپەکانیش، چونکە مەحاڵە دایك بتوانێ ژمارەیەکی زۆر کۆرپەلە لە ناو منداڵداندا هەڵبگرێ و خۆراکی پێویستیان بۆ دابین بکات. لەو جۆرە بارودۆخەدا دوو ئەنجام دێتە پێشەوە: یەکەمیان مردنی کۆرپەکانە یەك لە دوای یەك، چونکە خواردنی تەواو و شوێنی گەشەی نیە، دووەم مردنی دایکەکەیە چونکە خۆراکی تەواوی بۆ نامێنێتەوە، توانای هەلگرتنی ئەو بارە قورسەی نابێت، کاتێ دایك مرد ئەوە بەشێوەیەکی بەلگە نەویست کۆرپەکانیش دەمرن. گەر کۆرپەکان هاتنە دونیاوە ئەوا کێشەی شیردابین کردن و شوێن وبژێویان دێتە پێش. لە ئەنجامی ئەو کارە کارەساتێکی گەورەی کۆمەلایەتی و ئابوری و خێزانداری لێدەکەوێتەوە، دەبێتە هۆکارێکی سەرەکی بۆ لە ناو چوونی مرۆڤایەتی. بەلام خوای بەزەیی هەموو کردەوەکانی بەرنامە رێژی بۆ کراوە بۆیە هەرگیزاو هەرگیز نامێڵێت ئەو شتە رووبدات، بەلکو هەرکاتێك کۆ پیتێن روویدا ئەوا دروست بوونی کۆرپەلە هەرەس دەهێنێ و هەرگیز شتێك دروست نابێت بەناوی کۆرپەلە، لە جیاتی ئەوە کیسەیەکی بێ گیان دروست دەبێت کە پڕیەتی لە کیسەی ئاوی قەبارە جیاواز کە لە زانستی پزیشکی ناسراوە بە (الرحاء الحویصلية- الحمل العنقودي – Hydatidiform mole) واتە (سك پڕی دڕۆینە بە کیسەی ئاوی- کیسەی هێشووە تریێی). واتە چۆن خوای گەورە هەرگیز نامێڵێت کۆ پیتێن رووبدات لەناو سکی دایك، چونکە کارەساتی بەدواوەیە، ئاواش قەدەغەی کردووە لە ژیانی دونیای ئادەمیزادان.

لە ژیانی دونیای ئادەمیزادیش هەر بە هەمان شێوە گەر هەر ژنێك بۆ چەند پیاوێك بێت ئەوا تێکەڵاوی خوێن ومندالْ وشێوانی باری خێزانداری وکۆمەڵایەتی و کێشەی ئارەزووی مولکایەتی ئافرەتەکەو میرات دێتە کایەوە. ئەنجامی ئەوەش لە ناو چوونی مرۆڤایەتی یە. لێرەوە ئەوەمان بۆ دیار دەکەوێت ئەو بەشەی خوای گەورە خۆی دایڕشتوەو توانای ئادەمیزادی تیا نیە بۆ دەستکاری کردن ئەوا تەنها یەك هێلکە بۆ یەك سپێرمە. زانایانی کیمیای ژیان- بایۆلوژی- لەو چەند ساڵەی دوایی هەندێ نهێنیان دۆزیتەوە دەربارەی چۆنیەتی کرداری پیتێنی هێلکە. بۆیان بەدیار کەوت لەسەر ئەو پەردەیەی، کە دەورەی هێلکەی داوە جووتێك لە خاڵی پێشوازی پرۆتینی هەیە پێی دەڵێن (2p2, 3p2) کە پێشوازی لە سپێرم دەکەن، هەر لەوێوە سپێرم دەتوانێ بچێتە ژوورەوە. لەهەمان کات لە سەری سپێرم دوو خاڵی پێشوازی هەیە بەناوی (الأکروزین-Acrocin sp56 ,) کەبەهۆیەوە هێلکە پێشوازی لە سپێرم دەکات. بەم شێوەیە تەنها یەك سپێرم بۆی هەیە بچێتە ژوورەوە و کۆ پیتێن هەرگیز ڕوونەدات.[1]

هەر کات پیتێن ڕوویدا ئەوا دیواری دەرەوەی هێلکە چەند جارەی خۆی ئەستوور دەبێ، لە هەمان کاتدا هێلکە کڵاوە زێرینەکەی سەری لا دەدات، خاڵەکانی پێشوازی کردنی سپێرم وپێکەوە نوسان (المناطق الالتصاقية- Binding sites) هەڵدەگرێ، هەروەها هەندێ ئینزیمی توێنەرەوە دەڕژێنێ، زۆر جاریش تریشقەیەکی کارەبای دروست دەبێت، تاوەکو هیچ سپێرمەکی تر نە توانێ بچێتە ژوورەوە و کۆ پیتێن ڕووبدات (اللقاح المتعدد - Poly spermy)، بەمەش هەموو سپێرمەکانی تر بە داخەوە لە دەورو بەری هێلکەوە دەمرن.[2]

دکتۆر موحەمەد عەلی البار دەڵێت: پاش پیتێن هێلکە هیچ پەیوەندیەکی بە سپێرمەکانی ترەوە نیە، سۆزی نیە بەرامبەریان، چونکە ئێستا ئەو بۆتە خاوەن

1ـ حامد محمد ، الآيات العجاب، ص84.

2ـ *Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 782,881,885*

هاوسەری خۆی. بۆیە هەرچەندە هەوڵ بدەن ناتوانن بچنە ژوورەوە، بەپێچەوانەوە گشتیان لە دەوروبەری دەکەون ودەمرن، ئەوەش نموونەی خێزانێکی بە وەفاو پاکە.[1]

بەڵام لە کۆمەڵگەی ئادەمیزادا چونکە خوای گەورە دوو ڕێگەی بۆ داناون، یەکیان ڕێگەی هیدایەت وپابەند بوونە بە بەرنامەی خوا، ئەوی تریان ڕێگەکانی دەستکردی مرۆڤ و هەواو ئارەزووەکانیەتی، جا ئەگەر ڕێگەی دووەمی گرت ئەوا دەتوانێ هەموو کارێکی نادروست بکات،بەڵام ئەنجامەکەی دروست کردنی پشێوی و تێکدانی کۆمەڵگەو لەناو بردنی مرۆڤایەتی یە. خاڵی دووەمە کەوا بانگێشتەی بۆ دەکرێت لە لایەن هەندێ گروپ و، بەپاڵپشتی زل هێزەکانی جیهانی سەرکردەکانی ماسۆنیەتی بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی چەپۆکی دەسەڵاتە پیسەکەیان بەسەر جیهان بسەپێنن گەر بۆیان بچێتە سەر. ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ الروم: 41.

هەندێ جار دوو هێلکە لە هێلکەدان دادەبەزێت وهەر هێلکەیەکیش لەگەڵ یەك سپێرمدا جووت دەبێت و دوو کۆرپەلەی جمکی بەتەواوەتی بەیەك نەچوو دروست دەبێت Dizygotic Twins. زۆر جاریش هێلکەی پیتێنراو دەبێتە دوو بەش یان زیاتر، ئەوا منداڵی جمکی بەیەکچووی تەواو دروست دەبێ. Monozygotic Twins

## برگەی چوارەم: ڕازاوەی پیاو بۆ خێزانی

پەسەندە کە پیاو خۆی جوان بکات بۆ ئافرەتەکەی، هەروەك ئیبن عباس ﷺ دەفەرمووێ: ((من خۆم جوان دەکەم بۆ خێزانم هەروەك ئەو بۆ من خۆی جوان دەکات، نامەوێت من هەموو هەقی خۆم لەو وەربگرم و هەقی ئەویش لەسەر من بمێنێ)).[2] چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ﴾البقرة: 238.

1 ــ البار، محمد علي، خلق الإنسان بين الطب والقرآن ، ص179.
2ــ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 123/3. وسيد سابق، فقه السنة، 220/2.

ئیمامی قورتبی[1] دەربارەی گوتەکەی ئیبن عباس ﷺ دەڵێ: خۆ جوان کردنی پیاوان لە بارێك بۆ بارێکی دەگۆڕێ ، هەندێ خۆ ڕازاندنەوە شیاوە بۆ گەنجان و هەندێکی تر بۆ پیرەکان، بەگوێرەی شوێن وجێگەش بەهەمان شێوە دەگۆڕێ. دەربارەی پۆشاکیش بەهەمان شێوەیە، مەبەستیش بریتیە لە ڕێك وپۆشتەیی ودڵی ئافرەتەکەی پێ خۆش بکات. هۆکارەکانی ڕازاندنەوەش بریتین لە: بۆن، سیواك، نینۆك کردن، قژ ڕێکخستن، لابردنی پیسی، کە کۆمەڵی زانایان پەسەندیانە.[2]

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((لە دونیا ئافرەت وبۆنی خۆشم لا خۆشەویست کراوە ، نوێژیش بیلبیلەی چاومە)).[3]

فەرموودەکە وا دەگەیەنێ کەوا پیاوان دەبێ جۆری عەترو بۆنەکانیان ڕەنگی نەبێ بەڵام بۆنی زۆر بێ وەك : میسك و عەنبەرو عودو عەتر، بە پێچەوانەی ئەوەی ئافرەتانە کە دەبێ بۆنی کەم بێ وڕەنگی زۆر بێ وەك: زیباد وعەبیر.[4]

1ـ القرطبي: موحومەد کوڕی ئەحمەدی مالکی ئەندەلوسیە، لە پیاوچاکان بووە، مەفەسیری قورئانەو کتابی زۆری داناوە، لە میسر کۆچی دوایی کردووە سالی 671 ی کۆچی. ابن عماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، 335/5.

2ـ السيد سابق، فقه السنة، 220/2-221.

3ـ سنن الكبرى للبيهقي الرقم:13232، 78/7. والحاكم، المستدرك على الصحيحين. الرقم:2676، 174/2. ومسند أبو يعلي الموصلي، الرقم:3481، 199/6.

4ـ الشوكاني، نيل الأوطار ،180/1.

## بەندی دووەم: پۆشاك وخۆ داپۆشینی ئافرەت (حجاب المرأة)

الحجاب:( داپۆشین، شاردنەوە. وامرأة محجوبة: خۆی بە شتێك داپۆشیووە).[1]

### بڕگەی یەکەم: داپۆشین و فیترەت

1- هەروەك باسمان کرد کەوا لێکچوونەکی زۆر هەیە لە نێوان ژیان وپێکهاتەی هێلکەو ژیانی ئافرەت. ئەو دیوارەی دەورەی هێلکە دەیپارێزێ لە هێرشەکان و هەڕەشەکانی دەوروبەر لە پێش پیتێن ودوای پیتێن، بریتیە لەو پۆشاکەی لەبەری دەکات و خۆی پێ پۆشتە دەکات و دایك وباوك وکەس وکاریەتی کە هەردەم ئامادەن بۆ خزمەت کردنی وبەرگری لێ کردنی کاتی بوونی باری ناهەموار. کچ کاتێ لە ماڵی باوکیەتی دەتوانرێ خوازبێنی بکرێت، کە ئەویش بریتیە لە خاڵەکانی پێشوازی لە ژیانی هێلکە. دوای ئەوەی ئەو سپێرمەی خوای گەورە دیاری کردووە بۆ پیتێنی هێلکە، ئەوەش وەك ئەوەیە کە کچ خوازبێنی دێت ویەکێك دەبێتە قسمەت وبەشی ئەو هەر بە ویستی خوایە. هەر کات پیتێن ڕوویدا ئەوا دیواری دەرەوەی هێلکە چەند جارەی خۆی ئەستوور دەبێ و خاڵەکانی پێشوازی وپێکەوە نووسان گشتیان هەڵدەگیرێن تاوەکو هیچ سپێرمەکی تر نە توانێ بچێتە ژوورەوە و کۆ پیتێن ڕوویدات، بەمەش هەموو سپێرمەکانی تر بە داخەوە لە دەورو بەری هێلکەوە دەمرن. ئەو دیمەنەش وەك ئەوەیە کاتێ کچ هاوسەری بۆ دیاری کرا ئەوە بۆ کەسی تر نیە بچێتە خوازبێنی، یان پەیوەندی جینسی لەگەڵ ببەستێ، چونکە خاوەن هاوسەرو ماڵی خۆیەتی بۆ کەسی تر نیە دەست بخاتە کاروباری ناو ماڵیان، مەگەر ئەوانەی لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلام و مرۆڤایەتی لایان دابێ.

2- جۆری پێستەی ئافرەت هەروەك لە بەرگی یەکەم باسمان کرد کەوا تەنك و ناسکتر و هەستیار ترە لە پێستەی پیاو، گەر دانەپۆشرێ دەبێتە هۆکارێکی بزواندنی ئارەزووی جینسی کاتی تەماشا کردن، کە لێخشان. هەروەها بەرگەی کاریگەرەکانی دەرەوەی کەمترە گەر بەردەوام بەدەرەوە بێت.

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 50/3.

ئـافرەتی موسـڵمان بـە پۆشـاکێکی تایبـەت ناسـراوە کـە دەیپـارێزێ لـە کاریگەرەکانی دەرەوە، لە هەردوو ڕووی واتـایی ومـاددی. لەهـەمان کـات ئـافرەتی موسڵمان وەڵامی بانگەوازی خـوای گـەورەی داوەتـەوە، وەك ئارەزوویـەکی فـیتری ونەرکێکی خوایی.

خۆ داپۆشین جوانیەکی تایبەت دەبەخشێ بـە ئـافرەت هـەروەك چـۆن کـلاوەی زێرین هۆکاری جـوانی ڕازاوەیـی هێلکـە بـوو، بەهـەمان شێوە پۆشـتەیی جـوانترین هۆکاری جوانیە، جوانترە لە ڕازاندنەوە بە خشڵ و هۆکارەکانی تری خۆ ڕازاندنەوە.

پارێزگاری ئافرەت لە حەیاو شەرم و پاکی خۆی پارێزگاریە لە عەزیزترین مولکی ئافرەت، ئەوەش هەر بۆ بەرژەوەندی خۆیەتی لە هەردوو دونیادا. ڕاکـردن بـە دوای ئارەزووە جینسیەکان لە بەرژەوەندی ئافرەت نیە چونکە هەر کەسێك بکەوێتـە نـاو ئەو ئارەزووانە ئەوا هەموو مولکی لەدەست دەدات، نـاتوانی لـەناو ئـەو چوارچـێوە بێتە دەرەوە. ئەو ئارەزووە یەك سروشتی تایبەتی هەیە ئەویش ئەوەیە کە کۆتایی نایەت، بەردەوام پاڵ بە خاوەنەکەی دەنێت بۆ زیاتر چوونە ناو ئەو کارە، دوایی بۆ کـارە نامۆکـان و شـازەکان. هـەر بۆیـە ئیـسلام هەنـدێ مـەرج وپابەنـدی بـۆ ئـەو ئارەزووانـە دانـاوە تـاوەکو لـە چوارچـێوەی مرۆڤایـەتی دەرنەچـێ بگاتـە تـەنها ئارەزوویەکی ئاژەڵی. حۆداپۆشین یەکێکە لەو هۆکارە گرنگانەی وەك بەربەستێکی پلە یەکەمە بەرامبەر بەو ئارەزووانە هەم بـۆ خـودی ئافرەتەکـە، هـەم بـۆ ئەوانـەی نیازی خراپیان هەیە، لەبـەر ئـەو هۆیەشـە ئـاینی ئیـسلام گرنگـی تایبـەتی بـە خـۆ داپۆشین داوەو مەرجی تایبەتی بۆ داناوەو ژمارەیەکی زۆر لە ئایەت و فـەرموودەی دەربارەیەوە هاتووە.

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾ الأعـــراف: 26. شـەهید سـەید قوتـب دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: هاوڕێکیەکی زۆر پتەو هەیـە لـە نێـوان تـەقوای خـوداو پۆشاکی داپۆشەری عەورەت و هۆکاری جوانی، هەردووکیان داپۆشـەرن، یەکـەمیان عەورەتی دڵ دادەپۆشی ودەیپارێزێنێتەوە، ئەوی تریـان عـەورەتی لـەش دادەپۆشـێ

وەدەیرازێنێتەوە. ئەو دووانەش هاوڕێکن. داپۆشینی عەورەت شتێکی ژینگەیی وکاتی نیە، بەڵکو فەرمانێکی خوایی یە وخۆڕسکە لەناو ناخی ئادەمیزاددا. خوای گەورە لە زەوی کەرەسەی تەواوی بۆ پۆشاک وخۆ داپۆشین دابین کردووە بۆ ئادەمیزاد، تواناشی پێ داون بۆ بەکارهێنانی. ﴿لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ ﴾.[1]

پۆشتەیی میژوویەکی زۆر کۆنی هەیە، ئاینی ئیسلامیش یەکەم شەریعەت نیە کە خۆ داپۆشینی واجب کردبێ لەسەر ئافرەت. بەڵکو لە نەتەوەکانی زۆر کۆن ئەو دەستوورە باو بووە، وەك: لە شەریعەتی زەردەشت ویەهودی و مەسیحی، بەلام لای عەرەب لە پێش ئیسلامدا نەبووە.

هەروەك لە پەیمانی کۆندا (العهد القديم- التوراة)دا هاتووە: ( خوا دەڵێ گەر کچانی سەهیۆن بە لووت بەرزی بەرێوە چوون، ملیان درێژ کردوو، چاو بازیان کرد، بە هەنگاوی کورت وخۆ بادان، پێیان لە زەوی بەتوندی کوتا تاوەکو دەنگی خلخالەکانیان بێت، ئەوا گەورەی سەهیون ئاگاداریانە، خواش بە ڕووتیان دادەنێ. بۆیە لە جیاتی بۆنی خۆش بۆگەنن، کەچەڵیان دەکات لەجیاتی قژ لوولی، پشتێنەی لەناوچوون لە جیاتی کەمەربەند، سووتان وکەوی لە جیاتی جوانی).[2]

لە پەیمانی نوێدا هاتووە (العهد الجديد- الإنجيل): (ئافرەتان خۆیان برازێننەوە بە پۆشاکی حەیاو شەرم، وەرع وتەقوا، نەوەك بە زێڕو دوڕو گەوهەرو پۆشاکی گران بەها. هەر ئەوەیە لە ئافرەتی باوەڕدارو خاوەنی چاکە خوازی دەوەشێتەوە، فێری کەم دواندن بێت لەگەڵ هەر سەر نواندنێك).[3]

1ـ سيد قطب، في ظلال القرآن، 1278/3.

2ـ العهد القديم، الكتاب المقدس ـ كتب الشريعة الخمسة، سفر بنوءة إشعيا، الإصحاح الثالث، ص400.

3ـ العهد الجديد، الكتاب المقدس، رسالة بولس الرسول الأولى إلى تيموثاوس، ص339.

بوونی خۆداپۆشین لەناو هەندێ نەتەوەی پێش ئیسلام لەبەر یەكێك لەو هۆیانە بووە:

1- وەك فەرمانێكی ئاینی.

2- وەك فەلسەفەیەكی بەرەو ڕەهبانی بوون، لای هەندێ لە مەسیحیەكان دەبینرێ.

3- لەبەر نەمانی هێمنی وئاسایشی وولات، نەمانی خوڕەوشت لە ناو كۆمەڵگە. بەمەش خۆ داپۆشین دەبێتە بیردۆزێكی كۆمەلایەتی نەوەك ئاینی.

4- لە ئەنجامی غیرەت وحەسوودی پیاو بووە بەرامبەر بە ئافرەت.

ئاینی پاكی ئیسلام بەیەك چاو تەماشای هەردوو ڕەگەز دەكات، هیچ پایەو بەرزیەك بۆ یەكیان نیە لەسەر ئەوی تر مەگەر بەرزی لە تەقواو خوا پەرستی نەبێ. حوكمەكانی ئیسلام داینـاوە بەتـەواوی گونجاوە لەگەڵ باری جەستەو دەرونی هەریەكیان، هەندێ كار كردنی لەلایەن پیاوەوە حەرامە چونكە بۆ فەساد سەردەكێشێ ، بەهەمان شێوە كاری تر هەیە گەر ئافرەت بیكات حەرامە چونكە ئەویش بۆ فەساد سەر دەكێشێ. هەردووكیان تەواوكاری یەكترن، بەكاری تایبەتی هەردووكیان ڕەوڕەوەی ژیان بەرەو پێشەوە دەڕوات. ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز كە فەرمانی بە خۆداپۆشین كردووە:

• ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾النور: 31

• ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ الأحزاب: 59.

• ﴿وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ﴾ الأحزاب: 53.

ئاینی ئیسلام جۆرە پۆشاکێکی تایبەتی فەرز نەکردووە بۆ خۆ داپۆشین بۆ ئافرەتان، بەڵکو هەندێ مەرجی تایبەتی داناوە پێویستە هەبێت لە هەموو ئەو پۆشاکانەی کە بۆ داپۆشین بەکاردێت، ئەوەش بە گوێرەی گۆڕانی نەتەوەو وڵاتەکان دەگۆڕێ. ئاینی ئیسلام هەموو عورف وعادەتێکی نەزانی پێش ئیسلامی وەلا نەناوە گەر پێچەوانەی شەرعی خوا نەبێت. دەربارەی پۆشاك، بەهەمان شێوە هەموو جۆرە پۆشاکێکی قەدەغە نەکردووە بەڵام گۆرانکاری پێویست و مەرجی تایبەتی بۆ داناوە.

زانایانی ئیسلام لە ڕوانگەی ئایەت وفەرموودەکانەوە هەندێ مەرجیان بۆ خۆداپۆشین داناوە.

### بڕگەی دووەم : مەرجەکانی پۆشاکی خۆ داپۆشین (شروط الحجاب)

شیخ محمد علی الصابونی ئەو مەرجانەی باس کردووە:[1]

1- ئەو پۆشاکە هەموو لەشی داپۆشیبێ، لە ئافرەتیش هەموو لەشی عەورەتە تەنها دەست ودەم وچاو نەبێت، هەروەك لای حەنەفیەکان ومالکیەکان وئیبن جەریری طەبەری.[2]

بەڵگەشیان ئەو دوو فەرموودەیە: عائشە ﷺ دەفەرمووێ: ئەسمای خوشکم ﷺ هاتە ماڵمان وبە پۆشاکێکی تەنك خۆی داپۆشیبوو، پێغەمبەری

1ـ الصابوني، محمد علي، روائع البيان في تفسير آيات الأحكام، 384/2وما بعدها.
2ـ الطبري، جامع البيان في تفسير القرآن، 94/18.

خواﷺ بەرپەرچی داوەو ووتی: ئەی ئەسما گەر ئافرەت گەیشتە تەمەنی بێ نوێژی بێجگە لە دەست ودەم و چاوی نابێت هیچ شوێنەکی تری دیار بکەوێت.

لە ئەبی هورەیرەﷺ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە لەکاتی نوێژدا پیاو دەم و چاوی داپۆشێ.

بەڵام شافعی و حەنبەلیەکان دەڵێن: ناوەڕۆکی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ کەوا پێویستە هەموو ڕازاوەیەك بشاردرێتەوە بەرامبەر بە بێگانە تەنها ئەوە نەبێ کەوا بە بێ ویست بەدیار دەکەوێت وەك هاتنی بایەکی توند کە دەبێتە هۆی دیارکەوتنی قاچ وشوێنی تر.[1] بەڵگەشیان گووتەی عائیشەیە کە دەڵێت: خوا ڕەحم بە ئافرەتانی کۆچ کەرەکان بکات کاتی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە(وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ)چارۆگەی خۆیان لەت کردوو خۆیان پێ داپۆشت((یرحم الله نساء المهاجرات الأول، لما أنزل الله: شققن مروطهن* فاختمرن بها)).[2]

هەندێ لە زانایانی تر دەڵێن لەو کات وسەردەمەی کەوا فەساد وبەد ڕەوشتی بڵاوە دەبێ ئافرەت دەم وچاویشی داپۆشێ.

2- ئەو پۆشاکە نابێ ڕازاوە بێت و سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێ، وەك بوونی ڕەنگی زۆرو بریقەداری، چونکە مەرجی خۆ داپۆشین لادانی سەرنج وتێڕوانینە نەوەك پێچەوانە.

3- پێویستە ئەستور بێت نەوەك تەنك، هەموو لەشی داپۆشێ، پێستە لە ژێرەوەی دیار نەبێت. گەر ڕەنگی پێستە دیار بوو مانای ئەوەیە هۆکاری فیتنەیە نەوەك لادانی فیتنە.

ئەبی هورەیرەﷺ دەگێڕێتەوە: دەڵێ پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((دوو کۆمەڵ دۆزەخین، وەك ئەوانم نەدیووە. کۆمەڵێك قامچیان بەدەستەوەیە وەك کلکی

---

1 ــ الصابوني، روائع البيان في تفسير آيات الأحكام ، 155/1.

2ــ البخاري 68- تفسير سورة النور باب:251 حديث:4480. وسنن أبي داود كتاب :اللباس باب: لبس النساء حديث : 4102 ، 61/4.*:المرط: قوماشێکی خوریە شان وسنگ سك دادەپۆشێ درێژ دەبێتەوە بۆ سەر ناوچەی عەورەت.

چێڵ وایە ولە خەڵکی دەدەن. ئەوی دیکە ئەو ئافرتانەن کە پۆشاکیان لەبەردایە بەلام هەر ڕووتە دیارن. ئەوانەی بە لارو لەنجە دەڕۆن بە ڕێوە، قژی سەریان وابەستاوە وەك قۆپکەی سەر پشتی ووشتر وایە، ئەوانە ناچنە بەهەشت، بۆنی بەهەشت ناکەن، هەرچەندە بۆنی بەهەشت چەندەها ساڵەڕێ دەڕوات)) ((صنفان من أهل النار لم أرهما. قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس. ونساء كاسيات عاريات. مميلات مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت* المائلة، لا يدخلن الجنة، ولا يجدن ريحها. وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا)).[1]

ئیبن عومەرﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((لە کۆتایی ئەممەتی من ئافرەت پەیدا دەبن کەوا پۆشاکیان لەبەردایە بەلام ڕووت دیارن، قژی سەریان وەك پشتی ووشترە، ئەوانە بە نەفرەت بکەن، چونکە نەفرەتیان لێکراوە)) ((سيكون آخر أمتي نساء كاسيات عاريات رؤوسهن كأسنمة البخت، العنوهن فإنهن ملعونات)).[2]

4- فراوان بێت نەوەك تەسك: واتە نابێت تەسك بێت وبە لەشەوە نووسابێ هەروەك بڵێی وەسفی لەشی ئافرەتەکە بکات بەتایبەتی گەر تەنك بوو. نمونەی ئەو گۆرەویە ڕەنگ گۆشتیانەن کە زۆر تەسك و تەنکن.

5 - پێویستە بۆندارو بوخراوی نەبێ: واتە بۆنی نەڕوات بۆ لای خەڵك، چونکە ئەبو موسای ئەشعەریﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: (( هەر ئافرەتێك خۆی بۆندار بکات وبەسەر خەڵکاندا سووڕایەوە بەمەبەستی ئەوەی هەست بەو بۆنە بکەن ئەوا وەك ئەوەیە زینای کردبێ ((أيمّا امرأة استعطرت فمرّت على قوم ليجدوا من ريحها؛ فهي زانية)).[3]

ئەبو موسای ئەشعەریﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( هەر

---

1ـ مسلم 37 ـ كتاب اللباس باب: 34 حديث : 125 ـ 4،2185/2128.* أسنمة البخت: ئەو بەرزاییەی سەر پشتی ووشترە. الفيروزآبادي، قاموس المحيط، 1452.

2ـ الطبراني: الرقم: 1127 ، ص465.

3ـ سنن أبي داود، كتاب الترجل باب: تطيب المرأة للخروج الرقم: 4،79/4173.

ئافرەتێك بوخری بەکارهێنا با نەیەتە نوێژی شێوان (العشاء) ((أيما امرأة أصابت بخوراً؛ فلا تشهد معنا العشاء الآخرة)).[1]

ئەگەر بۆنداری ئافرەت لە ماڵەکانی خوادا حەرام بێت کەواتە بۆ بازارو کۆچەو کۆڵانەکان دەبێ چۆن بێت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمەی ڕوون کردۆتەوە جۆرەکانی بۆن بۆ هەردوو ڕەگەز تاوەکو تووشی گومان وحەرام نەبین. لە عیمرانی کوڕی حەصین دەگێڕنەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بۆنی پیاوان ئەو بۆنەیە کە بۆنی هەبێ وڕەنگی نەبێ، بۆنی ئافرەتیش ڕەنگی هەبێ و بۆنی نەبێ)) ((ألا وطيب الرجال ريحٌ لا لون له، ألا وطيب المرأة لون لا ريح له)).[2]

6- نابێت لە پۆشاکی پیاو بکات: لە ڕووی ڕەنگ و شێوەو جۆری دوورین.

ئیبن عباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نەفرەتی خوا لەو پیاوەی شێوەی خۆی وەك شێوەی ئافرەت دەگۆڕێ ، لەو ئافرەتەی شێوەی خۆی وەك شێوەی پیاوان دەگۆڕێ)) ((لعن الله المتشبهات من النساء بالرجال، والمتشبهين من الرجال بالنساء)).[3]

چونکە مەبەستی پۆشتەی داپۆشین و نەناسینەوەیە، گەر خۆی بۆ شێوەی پیاو گۆڕی ئەوە بەوە دەناسرێتەوە، کەواتە پۆشتەییەکە ئامانجی خۆی نەپێکاوەو بەتاڵ بووتەوە؟

7- نابێت بە پۆشاکی بێ باوەڕان بچێت، وەك: جوولەکەکان، دیانەکان، هیندۆسەکان، چونکە موسڵمانان کەسایەتی تایبەتی خۆیان هەیەو نابێ لاسایی بێ باوەڕان بکەنەوە لە هیچ شتێکدا، هەروەك لە قورئاندا هاتووە: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَكَ عَلَىٰ

---

1ـ سنن ابي داود، كتاب: الترجل باب: تطيب المرأة للخروج الرقم: 4،79/4175.

2ـ سنن أبي داود كتاب: اللباس باب: كراهية، الرقم: 4048. ،48/4.

3ـ البخاري 80ـ لباس باب: 24حديث: 2194/5496،5. وسنن أبي داود كتاب: اللباس باب:لباس النساء حديث: 4097.،(60/4. هەروەها: عارضة الأحوذي ، صحيح الترمذي 41 ـ كتاب الأدب باب: 34 حديث: 234/2789،10.

شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾الجاثیة: 18. بەڵكو پێویستە پێچەوانەی ئەوان بكەین لە هەندێ ڕووكارو ڕەوشتدا. ئەبی هوریرەﷺ دەگێڕێتەوە: دەڵێ پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی :(( جوولەكەو گاورەكان ڕیشی خۆیان بۆیە ناكەن ئێوە پێچەوانەی ئەوان بكەن)) ((إن اليهود والنصارى لا يصبغون فخالفوهم)).[1]

ئیبن عومەرﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: )) پێچەوانەی ئەوانە بكەن كە هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەكەن، ڕیشتان درێژ بكەن و سمێڵتان كورت بكەنەوە)) ((خالفوا المشركين، وفروا اللحى، أحفوا الشوارب)).[2]

لە ئیبن عومەرەوەﷺ دەڵێ : (( هەر یەكێك لە شێوە بە نەتەوەیەكی بێ باوەڕ بچێت ئەوە لەوانە)).[3]

8- نابێت پۆشاكی خۆ بەزل زانین بێت، یان زیادە ڕۆیی تیابێ. ئەوەش دەوەستێتە سەرداب ونەریتی ئەو كۆمەڵگەیە. لەوانەیە ئەوەی بۆ هەندێ وڵات زیادە ڕۆیی بێت بۆ ئەوەی تر شتێكی سادە بێت. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ بخۆن وبخۆنەوە بەڵام زیادە ڕۆیی مەكەن چونكە خوا ئەوانەی خۆش ناوێت كە زیادە ڕۆیی دەكەن.

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾الأعراف: 31

نابێ پۆشاكێكی گران بەها بێت ولە خۆ بایی بوون وفیزو خۆ هەڵكێشانی تیابێ، چونكە خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴾الإسراء: 37.

1ـ البخاري 80ـ لباس باب: 62 الحديث: 5،2210/5559. ومسلم 37ـ كتاب اللباس والزينة باب: 25 الحديث: 80 ـ 4،2165/2103.

2ـ البخاري 80 ـ لباس باب: 62 الحديث: 5553 ،2206/5.

3ـ سنن أبي داود كتاب: اللباس باب: لبس الشهرة الرقم:4،44/4031.

ئیبن عومەرﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((هەر کەسێك پۆشاکی ناوداریەتی پۆشی ئەوە ڕۆژی دوایی خوای گەورە بەهەمان شێوە پۆشاك دایدەپۆشێ وئاگری تیا بەردەدات)) ((من لبس ثوب شهرة ألبسه الله يوم القيامة ثوباً مثله)).[1] ئەبو عەوانەشﷺ ئەوەی زیاد ووتوە، ((ثم تلهب فيه النّار)).

ئەو مەرجانەی باسمان کردن دەربارەی پۆشاك وخۆ داپۆشینی ئافرەت مانای ئەوە نیە متمانەی بە غیرەت ولێهاتوویی ئافرەتی موسڵمان نیە، یان دوور خستنەوەی بێت لە ژیانی سەردەم وبێ ئاگا بێت لە هەموو ڕووداوێك، بەڵکو خوای گەورە هەموو بەرزی وسەربەرزی و کەرامەت وعزەتێکی بۆ ئەوان دەوێت وجیای بکاتەوە لە کۆمەڵی خراپەکاران وتانە و تەشەنەی فاجرو فاسقان، ئەوانەی هەردەم بە دوای ئەوەن سووکی بە باوەڕداران بکەن. لەکەداریان بکەن، بە گووتارو کردار. هەر بۆیە خوای گەورە بۆی داناون کەوا زۆربەی کات لەماڵ بن، مەگەر بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت، تاوەکو وەك گەوهەرێکی درەوشاوە بن لەماڵ وکاتی چوونە دەرەوەی، بەهۆی ئەو پۆشتەیی و حەیاو شەرمەی کە خۆی پێ ڕازاندۆتەوە.[2]

بەشداری ئافرەتی موسڵمان لە ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەرو جێنشینە ڕاشدینەکان وسەدەکانی دوایی باشترین شاهیدن لەسەر ئەوەی ئافرەت بەهۆی خۆ داپۆشینەوە دوور نەبووە لە ڕووداوەکان، بەڵکو لەگەڵی ژیاوەو بەشداریشی تیا کردووە، ئەو کارەی بۆی دانراوە بە جوانترین شێوە ئەنجامی داوە، نموونەشمان بۆ ئەو ڕاستیانە زۆرە، هەریەکیان لە شوێنی خۆی باسیان دەکەین.

هەروەك لە زۆر شوێن باسمان کردووە کەوا ئەو دوو ڕەگەزە چونکە جیاوازن، لەهەمان کات تەواوکاری یەکترین لە هەردوو باری جەستەیی ودەروونی، بۆیە هەردەم ئارەزووی دیداری یەکترن وبەو شەوقەن کە بگەن بەیەك. بۆیە ئاینی ئیسلام لە ڕوانگەی ئایەتەکان وفەرموودەکانەوە گرنگی زۆری بەم بابەتەوە داوەو دەستووری پتەوو بەرنامەی تێرو تەسەلی بۆ دارێژتووە تاوەکو لە چوارچێوەیەکی

---

1ـ سنن أبي داود كتاب اللباس باب: لبس الشهرة الرقم: 44/4029،4.

2ـ ابن تيمية، حجاب المرأة. ص5 وما بعدها.

مام ناوەندی بێت نە بەلای کپ کردن ودامرکاندنەوەی تەولو بڕوات، کە پێچەوانەی ئەو غەریزەو ئارەزووەیە کە خوای گەورە لە خەلیقەتەوە لە ئادەمیزادی داناوە، نە بەدیوەکەی تردا بڕوات کە سەربەستی تەواو وەربگرێت وبەدوای هەواو ئارەزووەکانی بکەوێت بە بێ گوێدانە هیچ دەستوورو یاسایەکی خودایی وداب و نەریتەکی کۆمەلایەتی، گوێ نەدان بە ئەنجامە نالەبارو دژوارو ترسناکەکانی، کە لە ئەنجامی ئەو کارە دەکەوێتەوە. خوای گەورە ئارەزووەکی شەهوانی لە هەردوولادا خولقاندوە وەك تاقیکردنەوەك بۆ ئادەمیزادان تاوەکو بە کردار بیسەلمێنن کامەیان پابەندی فەرمانی خوایەو کامەیان سەرپێچی دەکات، لە سەرەوەی ئەو لیستە هاتووە ئارەزووی ئافرەت، منداڵ، زێڕو زیو خشڵ، ئاژەڵ و دانەوێڵە. ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ﴾آل عمران: 14.

ئەوەی لە هەمووان لە پێشترو ترسناکترە بریتیە لە خۆشویستنی ئافرەت. لە ئوسامەی کوڕی زەید دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە دوای خۆم گەورەترین و بە زیانترین فیتنە بۆ پیاوان، کە بۆیان بەجێ ماوە بریتیە لە ئافرەتان)).((ما تركت بعدي فتنةً هي أضرُّ على الرجّال من النساء)).[1]

ئەو یاسایانەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی تاوەکو بتوانن بە جوانترین شێوە مامەڵە بکەن لەگەڵ ئەو ئارەزووە بریتین لە: هاندان بۆ زوو ژن هێنان، چەند ژنی، چاو داگرتن بۆ نێرینە و مێینە، پۆشتەیی، تێکەلاو نەبوون، زۆری تر لە یاساکانی پەیوەندی نێوان ژن ومێرد، یاساکانی خێزانداری، یاساکان و مەرجەکانی کار کردن وچوونە دەرەوەی ئافرەت.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟

---

1ــ للبخاري:70 ــ النكاح باب: 18 الحديث: 5،1959/4808.
مسلم: 48 - الرقاق باب: 21 الحديث: 97 - 2740 ، 2653/5.

﴿فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾النور:30. هەروەها دەفەرمووێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ﴾النور:31.

ئافرەتی موسڵمان لە چواردە سەدەی ڕابووردو ئەو فەرمانانەی خوای بەهەموو قەناعەت وباوەڕێکەوە وەر گرتووەو لەژیانی ڕۆژانەش بەجوانترین شێوە جێبەجێ کردووە بەهەموو سەربەستیەك. هەروەها وەك كێشەیەك سەیری نەکردووە، بەخەیال و بیری دانەهاتووە بڵێ پیاوان خۆ داپۆشینیان بەسەر ئافرەتاندا سەپاندووە. خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ الأحزاب:36.

ئیسلام هەرگیز نەیویستووە لە ئافرەتان ئەو هەست وئارەزووە مێینەیان سەبارەت بە خۆ جوان کردن و ڕازاندنەوە و ئارەزووە تایبەتیەکانی تر کپ بکاتەوە، یان دایبمرکێنێتەوە بە زۆر لەخۆکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو سەربەستیەکی پێداوە لەو بارەوە لەماڵی خۆی، لەناو دەستە خوشکەکانی، ناو کۆمەڵی ئافرەتان. لە هەمان کات ئیسلام بە چاوێکی نەفرەتەوە دەڕوانێتە ئەو ئافرەتەی کەسایەتی خۆی وون دەکات، لە ئارەزووە مێینەکانی لادەدات و شێوەی خۆی دەکاتە پیاوو لاساییان دەکاتەوە. هەروەك لەو فەرموودەی ئیبن عباس ڕوایەتی کردووە: ((لعن الله المتشبهين من الرجال بالنساء، والمتشبهات من النساء بالرجال)).[1]

لەو چەند ساڵەی دوایی زانایانی دەروونناسی خاڵێکی گرنگیان دۆزیەوە دەربارەی لاسایی کردنەوەی ئافرەتان بۆ پیاوان وئەنجامە ترسناکەکانی، دەڵێن: ئەگەر ئافرەتان مامەڵەی کچەکانیان وەکو کوڕەکانیان بکەن لە پۆشاك، شێوە،

1ــ البخاري 80 ــ اللباس باب: 59 الحديث: 5546، 2207/5.

جۆری پەروەردە کردن، وناولێنان، ئەوانە هۆکارن بۆ هەندێ ئەنجامی دەرونی ترسناك لە ژیانی دواڕۆژیدا. بەڵێ ئەو دەبێتە کچێکی -کوڕانە- المسترجلة- هەرگیز واز ناهێنێ لە هەموو ڕەوشتی مێینە بەڵام سیفەتی دژواری وتوندی پیاوان وەردەگرێ، ئەوا ئەو کچە دێتە بەرچاو وەك کچێکی جوانکیلە (غانیـــة) لە نێوان ئارەزوەکانی مێینەی خۆ جوان کردن ورازاندنە، ئارەزوەکانی کوڕان کە توندی دژواریە، واتە ئەو کچە وەك جۆلانە ئەولاوئەولا دەکات. ئەو دوو ئارەزووە دژ بەیەکە لەناو دەرونی ئەو بچکۆڵەیە تەشەنە دەکات و تاوەکو دەگاتە ئاستێك تووشی نەخۆشی دەرونی دەکات و لە دوا ڕوژ بە ئاراستەی ڕووچوون بۆ کاری سووك وئابڕو بەری دەبات.[1]

## بڕگەی سێیەم: دروست کردنی گومان بەرامبەر بە خۆ دا پۆشین

دوای دەرکەوتنی لاوازی موسڵمانان، داگیر کەران وئیمپریالیزمی جیهانی بە پاڵپشتی نۆکەرانی دەستیان خستە ناو کاروباری کۆمەڵگەی ئیسلامی بە شێوازی جۆراوجۆر، بە مەبەستی تێکدان وشێواندن و بڵاوکردنەوەی فەساد وگومان دروست کردن. یەکێك لەو بابەتانەی کە هەڵیان بژارد بریتی بوو لە خۆداپۆشینی ئافرەت.

سەرەتا دەستیان کرد بە دروست کردنی گومان دەربارەی شەرعیەتی پۆشتەیی، بانگێشەیان بۆ ئەوە کرد کەوا ئەو دەستووورە فەرمانی ئیسلام نیە بەڵکو عەرەب ئەو داب ونەریتەیان لە بیزەنتیەکان وڕۆمە ئەغریقیەکان وەرگرتووە پاش فەتحی شام ومیسر.[2]

قاسم ئەمین دەڵێ[3]: ئەو پۆشتەیی یەی کە پیاو بەزۆر سەپاندی بەسەر خێزانی،

---

1ــ زکریا إبراهیم، سیکولوجیة المرأة، ص49.

2 ــ هیني هارولد، حیاة المرأة الکردیة، ص409.

3 – قاسم أمین: لە ساڵی 1863 لە میسر لەدایك بووە، بە ڕەچەڵەك کوردە، خوێندنی قانونی لە فەرەنسا تەواو کردووە لە ساڵی 1885 گەڕاوەتەوە میسر، یەکێکە لە دامەزرێنەرو سەرکردەکانی ئازادی ئافرەتان. وەزیفەی قازی وموستەشاری قانونی بووە لە دادگای قاهیرە، دوو کتێبی هەیە کە تیایدا داوای سەربەستی، ئازادی ئافرەتان، فڕێدانی پۆشاکی ئیسلامی دەکات، کتابەکانیش (ئازادی ئافرەت، ئافرەتی نوێ)، لەگەڵ سعد زەغلول هەوڵی دروست

تاوەکو پەرەی سەند بۆ کچەکانی ودایك وخوشکی وگشت ئافرەتان.[1]

هەروەها دەڵێ:( پۆشتەیی ناونیشانی ئەو مولکە کۆنەیە، کلتورێکە لە کلتورەکانی ئەو ڕەوشتە دڕندەیەی کە مرۆڤایەتی تیایدا دەژیا چەند سەدەیەك پێش ئەوەی بگاتە ڕێگەی ڕاست و هیدایەتی ئەوەی کە بزانێ ئافرەت مولك نیە، هەر لەبەر ئەوەی ناوی ئافرەتە.[2]

لە کۆتاییدا زۆر بەڕاشکاوی بانگەوازی ئەوەی کردکەوا پۆشتەیی دەبێ نەمێنێ و بدڕێنرێ، هەروەك گەورەکانی لە ڕۆژئاوا داوایان لێکردبوو کە بانگەوازی بۆ بکات، گووتی (یەکەم هەنگاو پێویستمانە بۆ چوونە پێش و بەدەست هێنانی سەربەستی ئافرەت بریتیە لە دڕاندنی جلی خۆداپۆشین و لەناو بردنی ئاساوارەکانی).[3]

پاش ئەوە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕۆپاگەندەی نوێ بەوەی کەوا بە هۆی پۆشتەیی ئافرەت ناتوانێ ئازادی وسەربەستی خۆی تەواو وەربگرێت، خوێندنی تەواو بکات، بژێوی ژیانی خۆی دابین بکات، هاوسەرەکان ناتوانن بەتەواوی تام وچێژ لە ژیانی هاوسەرێتی وەربگرن، هەروەك قاسم ئەمین دەڵێ: گەر پۆشتەیی هیچ کەم وکورتیەکی نەبێ ئەوە پێچەوانەی سەربەستی مرۆڤە، ئافرەت ناتوانی ئەو مافانەی کەوا شەریعەت ویاساکانی دەستکرد بۆی داناوە بەدەستیان بهێنێ، هەروەك یەکێکی ناتەواو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت. ناتوانێ هیچ کارێك بکات هەرچەندە شەریعەت هەموو مافێکی داوەتێ کە ژیانی خۆی بەڕیوە ببات بەیەکسانی هەروەك پیاو، پۆشتەیی بەندی کردووە هەرچەندە یاسا یەکسانی کردووە لە سەربەستیدا لەگەڵ پیاو. هەر پۆشتەیی هیچ کەم وکورتیەکی تری نەبێ تەنها ئەوانەی باسمان کرد، ئەوە بەسە بۆ ئەوەی ڕقمان لێی هەڵسێ و

---

کردنی زانکۆی تێکەڵاوی دا. ساڵی 1908مردووە. الأعلام، للزركلي، 185/5. وموسوعة وكالة أنباء الشرق الأوسط، أعلام مصر في القرن العشرين، ص85.

1ـ قاسم أمين، المرأة الجديدة، ص37.

2ـ قاسم أمين، المرأة الجديدة، ص37.

3ـ قاسم أمين، المرأة الجديدة، ص 38.

هەموو نەفسێکی سەربەرزو دڵسۆز بۆ ئازادی وهەستدار بە خۆشیەکان ونارەزووەکانی ژیان لێی دوور کەوێتەوە. دووبارەی دەکەمەوە کەوا لەهەموو کەم و کورتیەکان گەورەتر ئەوەیە کە بەربەستە لە ڕێگەی تەواو کردنی خوێندن).[1]

گەر بەووردی سەیری ووتەکانی بکەین دەبینین کەوا باسی مافی ئافرەت و سەربەستی ئافرەت دەکات لە شەریعەتی ئیسلامی، بەڵام خۆی مەبەستی سەرەکی ڕووخانی بنەماکانی شەریعەت ونەهێشتی داب ونەریتی ئیسلامیە.

بەو شێوەیە هێرش کرایە سەر پایگەکانی ئیسلام لەلایەن کوفری جیهانی سەرەتا بەهۆی دووڕووەکانی بەناو موسڵمان وەك قاسم ئەمین ، سعد زەغلول، لوتفیە سید، هدی شەعراوی، عەلی تەنتاوی وکمال مستەفا ئەتاتورك ورەزا شای ئێران وزۆری تر. ئەوانە بەهۆی بێ ئاگایی موسڵمانان وخەریك بوونیان بە شتی لاوەکی وگۆڕینی ئاراستەیان بەرەو نەتەوەگەریەتی، لەسەرووی هەموویانەوە بوونی بەرنامەیەکی داڕێژراوی درێژ خایەن ولەسەرخۆ دژی ئەو بنەمایانەی ئیسلام، لە کۆتاییدا توانییان سەر بکەون، تا ڕادەیەکی زۆر لە گشت وولاتانی ئیسلامی بەهاوکاری سەرکردە بەکرێ گیراوەکانی وولاتانی عەرەبی وبەناو کۆمەڵ و ڕێکخراوە ئازادی خوازەکانی عەرەبی. ئەوەبوو توانیان بۆ یەکەم جار کچۆلەکانی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە پۆشتەیی دامالن، دوای ئەوانەش دواناوەندی وزانکۆکان و کۆمەڵگە بەتەواوی.

ئامانجی سەرەکی ئەوانە لە دژایەتی کردنی پۆشتەیی تەواوکردنی خوێندن نەبوو، چونکە هیچ کاتێ، لەهیچ کۆمەڵێك، جۆری پۆشاك نەبۆتە بەربەست لە ڕێگەی خوێندن وفێربوون. نەبیستراوە لە مێژووی دوورو درێژی مرۆڤایەتی کەوا جۆری پۆشاك ڕۆل، یان کاریگەری هەبێ لەسەر پێشکەوتنی زانستی و شارستانیەتی کۆمەڵگەکان لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵگەو داب ونەریتی پۆشاکی جیاواز، بەڵکو ئامانجی سەرەکیان ئەوەیە ئافرەتانی موسڵمان لە پۆشاکی ڕەسەنی دوور بخەنەوە و تێکەڵاوی دروست بکەن تاوەکو کوڕان وکچانمان بیر لە

---

1ـ قاسم أمين، المرأة الجديدة ، ص105.

هیچ شتێکی زانستی ڕۆشنبیری نەکەنەوە تەنها بەدواکەوتنی ئارەزووەجنسیەکان و ڕابواردنی بێ سوود نەبێ. بەڵگەشمان ئەوەیە، ئەوە چەندەها ساڵە وولاتانی بەناو ئیسلامی کەوتنە شوێن پێی بێ باوەڕان وپۆشتەیان فرێدا، تێکەڵاوییان پەسەند کرد لە گشت ئاستەکانی خوێندن، ئایا لە ڕووی زانست وزانیاریەوە چیان بۆمان زیاد کرد؟ دەبینین لەدواوەی هەموو وولاتانن، ژێر دەستەو هەژاری، قەرزاری بانکە دەوڵەتیەکان، سەرشۆری وزەلیلی، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، دۆڕاندنی دونیاو دواڕۆژیش سەرباری هەمووان.

دەربارەی ئەو سەرکەوتنانەی کە بێ باوەڕان بەدەستیان هێنا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی بە هاوکاری خۆفرۆشەکان، یەکێك لە سەرکردەکانیان (ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی بەناوی هـ. ئار.جیت لەکتابەکەی بەناوی – ئاراستەی ئیسلام بەرەو کوێ دەڕوات) ئاماژە بەو سەرکەوتنانە دەکات ودەڵێت: ئەو چالاکیە زانستی وڕۆشنبیریانەی، کە پیادەمان کردووە لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانان لە ڕێگەی قوتابخانەکانی سەردەم و ڕۆژنامەو گۆڤارەکان وای پێ کردوون تا ڕاددەیەکی زۆر بێ باوەڕ بن، بەبێ ئەوەی خۆشیان هەستی پێبکەن.

هەروەها دەڵێت: (پاش ماوەیەکی کورت جیهان بەرەو بێ باوەڕی تەواو دەڕوات لە هەموو بوارەکانی ژیان گەر کارەکانمان بەم شێوەیە بڕوات، مەگەر هەندێ هۆکار بێتە پێشەوە کە حیسابمان بۆ نەکردبێ).[1]

لە ئەنجامی ئەو شەپۆڵە بێ باوەڕی وبەدڕەوشتیەی کە لە ئەوروپا دەستی پێکرد لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگە بە زانستی و ئاینیەوە، وای کرد بەدڕەوشتی لە شوێنەکانی بەناو خوا پەرستی زیاتر بێت لە شوێنەکانی تر، لەلایەن سەرکردەو پیاوانی ڕامیاری زیاتر بێ لە خەڵکانی ئاسایی، لە ناوەندەکانی ڕۆشنبیری و زانکۆکان زیاتر لە شوێنەکانی تر. مامۆستا ئەنیس مەنسور دەڵێت، بۆ نموونە: جۆرج کلیمنسۆ کە ناسرابوو بە پڵنگی سیاسەتی فەڕەنسی1841-1929، کە توانی بەسەر دوژمنانی دەرەوەو، نیارەکانی ناوەوەدا زاڵ بێت، توانای ئەوەی

---

1ـ البوطي، محمد سعيد، ص 16ـ17.

هەبوو بە چەند زمانێك قسە بكات، توانای وەڵامدانەوەی چەند پرسیاری هەبوو لەیەك كاتداو لەبواری جیاجیادا، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی جینسی لەگەڵ800 ئافرەتدا هەبوو، لەو ئافرەتانە نزیکەی 40 منداڵی نا شەرعی هەبوو، بەڵام کاتێ کە خێزانەکەی، کە کچێکی ئەمەریکی بوو شەوێك درەنگ هاتەوە لە ڕابواردن– پێوەی دیار بوو خیانەتی لەشی فرۆشی کردبێ– هەر بەو شەوە بە جلی خەوتن لەماڵ دەریکردە دەرەوەو بێ ئەوەی بهێڵی جل وبەرگی خۆی ببات.[1]

ئەوە باری خێزانداری و کۆمەڵایەتی ئەوروپا بوو پێش سەدەو نیوێك ئایا دەبێ ئێستا چۆن بێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا بەکرێ گیراوەکان وخۆفرۆش وئاین فرۆشەکانی و وڵاتانی بەناو ئیسلامی هەر بەدوایان کەوتوون وپێشبڕکێش دەکەن بۆ نۆکەرایەتی. بەم کردەوەیان وادەزانن دەگەنە سەرکەوتنی سەربازی و پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی سەردەم، بەڵام ئەوەمان نەبینی بە تایبەتی لەناو چینی ئافرەتان دوای فڕێدانی پۆشتەیی ئایا گەیشتنە ئاستێکی زانستی، ئایا بوون بە زاناو داهێنەر ومامۆستای قوتابیانی کوڕو کچ لە گشت بوارەکانی ژیان هەروەکو ئافرەتانی پێشوو، نمونەی شوهدەی دەینوری، شاژنی شام خوشکی سەلاحەددین، ڕەبیعە خاتوون خێزانی موزەفەرەدین کوکبەری، فاتمەی کچی مولانا شیخ خالدی نەقشەبەندی وجویرەی کچی حافزی عیراقی، زۆری تر. ئایا بۆچی ڕۆژێك بیر ناکەنەوە لەوەی بگەڕێنەوە سەر بەرنامەی خوا، بەرنامەی مرۆڤایەتی، بەرنامەی باوباپیرانیان، کە بەهۆی ئەو بەرنامەو دەست پێوە گرتنی ببوونە پێشەنگی هەموو جیهان لەگشت بوارەکانی ژیان. مزگەوتەکانی ئەو کات بنکەی ڕۆشنبیری و سەرچاوەی بەخشینی ڕۆناکی و زانست وزانیاری بوون بۆ گشت جیهان.

1- البوطي، محمد سعيد، ص129 -130.

# باسی دووەم

## حوکمەکانی پەیوەست بە چاوداگرتن، مانەوەی ئافرەت لە ماڵەوە و تێکەڵاوی وحەیاو شەرم

بەندی یەکەم: چاوداگرتن

برگەی یەکەم: مانای عەورەت

برگەی دووەم: سنووری عەورەتی پیاو

برگەی سێیەم: سنووری عەورەتی ئافرەت

برگەی چوارەم: تەماشاکردنی ئافرەتی گەنج

برگەی پێنجەم: تەماشا کردنی ئافرەتی بیگانە لەلایەن پیاوەوە

برگەی شەشەم: هۆیەکانی پێشخستنی چاو داگرتنی پیاوان پێش ئافرەتان

برگەی حەوتەم: تەماشا کردنی ئافرەت بۆ پیاوی بیگانە

بەندی دووەم: مانەوەی ئافرەت لە ماڵەوەو تێکەڵاوی

برگەی یەکەم: مانای مانەوە

برگەی دووەم: مانەوە لەماڵ وفیترەت

برگەی سێیەم: تێکەڵاوی

بەندی سێیەم: حەیاو شەرم

برگەی یەکەم: مانای حەیا

برگەی دووەم: حەیای ئافرەت

برگەی سێیەم: حەیای پیاو

برگەی چوارەم: کاریگەری ژینگە لەسەر حەیاو شەرم

## باسی دووەم : حوکمەکانی پەیوەست بە چاو داگرتن، مانەوەی ئافرەت لە ماڵ، تێکەڵاوی، حەیاو شەرم

خوای گەورە ئینسانی خولقاندوەو کردوویەتی بە جێ نشین لەسەر زەوی، ئەوەش نایەتە دی مەگەر ئەو جۆرە لەسەر زەوی بەردەوامی هەبێ. بۆ ئەو بەردەوامی ومانەوەش ئارەزووی جینسی داناوە تاوەکو ئەو کارە بێتەدی، مرۆڤیش بەرامبەر ئەو ئارەزووە سێ هەڵویستیان هەیە.

1- یان جلەوی بۆ شۆڕ بکات، بەئارەزووی خۆی مەلەی بێ سنوور بکات لە زۆلکاوی بەد ڕەوشتی، هەروەك دەیبینین لە مەزهەبی بەرەڵایی (المذاهب الإباحية).

2- یان بەرەنگاری ئەو ئارەزووە بێتەوەو بە زۆر دایبمرکێنێ، هەروەك لە مەزهەبی بگرەکان و لە ڕەبەنایەتی(الرهبانية) دەیبینین، ئەوەش زیندە بەچاڵی ئارەزووی جینسیە، لەکار کەوتنی مەبەستەکانیەتی، پێچەوانەی ئەو حیکمەت و پەندانەیە کە خوای گەورە لە ئادەمیزادی خولقاندووە.

3- یان سنووری بۆ دیاری بکات لە بەر ڕۆشنایی بەرنامەیەکی داڕێژراو، هەروەك چارەسەرێکی ناوەندی، لە نێوان دامرکاندنەوەی بەخورتی و جلەو بۆ شۆڕکردنی بێ سنووری ئارەزووەکان، خاڵەش هەروەك لە ئیسلامدا هاتووە پیادەی دەکات.

لێرەوە باسی ئەوە دەکەین چۆن ئیسلام ئەو ئارەزووە جینسیە ڕێکدەخات.

### بەندی یەکەم: چاو داگرتن ( غض البصر ).

لەبەر بوونی پەیوەندیەکی بەتین لە نێوان تەماشاکردن و عەورەت (شوێنە قەدەغەکراوەکان)، پێشەکی پێویستە مانای عەورەت وسنوور وتخووبی عەورەت دیاری بکەین لە کاتی نوێژو کاتەکانی تر لە هەردوو ڕەگەز، تەماشا کردنی عەورەتی بێگانە، چونکە یەکەم هەنگاوی نزیك بوونەوەو تێکەڵاوی وکەوتنە ناو تاوانی زیناو کارە بەدڕەوشتیەکانی ترە.

### برگەی یەکەم: مانای عەورەت (العورة)

(هەر شتێك کە شەرم بکرێت تەماشا بکرێت، یان گەر دیار کەوت شەرم بکرێت تەماشا بکرێت. لە پیاوان لەنێوان ناوك وچۆکە، لە ئافرەتان هەموو بەدەنی دەگرێتەوە تەنها دەست و دەم و چاوی نەبێ).[1]

### برگەی دووەم: سنووری عەورەتی پیاو (حدّ العورة من الرجل)

عەمرو کوڕی شوعەیب ﷺ دەگێڕێتەوە، لەباوکم بیست کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( ئەگەر یەکێکتان ژنی بۆ خزمەتکار یان کرێگرتەکەی هێنا، ئەوا نابێت تەماشای خوار ناوك وسەروو چۆکی زیاتر بکات)) ((إذا زوّج أحدكم خادمة عبده أو أجيره فلا ينظر إلى ما دون السرة وفوق الركبة)).[2]

عەورەتی پیاو: لە نێوان ناوك وچۆکە، ئەوە گوتەی ئیمام مالك، ئەحمەد، شافعی یە، ئەبو حەنیفە دەڵێ: چۆك لە عەورەتە.[3] لەلای زاهیریەکان: تەنها ئەندامانی زاوزێ عەورەتە.[4]

عەورەتی پیاو لە دەرەوەی نوێژیش هەر لە نێوان ناوك وچۆکە، دەتوانرێ تەماشای هەموو بەدەنی بکرێت بێجگە لەوەی باس کرا بۆ پیاو، بۆ ئافرەتەکانی مەحرەمی خۆی.[5]

حەنبەلیەکان دەڵێن: حوکمی پیاو لەگەڵ ئافرەتانی مەحرەمی، وەك حوکمی پیاو بۆ پیاوە، ژن بۆ ژنە.[6]

---

1ـ لسان العرب، ابن منظور، 470/9.

2ـ سنن أبي داود كتاب: اللباس باب: غض البصر ،2/ 114. عمرو بن شعيب العقدي العبيدي: لە تیرەی بەنی عەبدولقەیسە. ابن حجر، الإصابة، الرقم: 5874 ، 42/4.

3- ابن قدامة، المغني،578/1. والنووي، المجموع، 173/3.والدرديري،الشرح الكبير،498/1. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة،189/1.

4ـ ابن حزم الظاهري، المحلى، 210/3.

5ـ الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة،193/1.

6ـ ابن قدامة، المغني، 655/4.

**بڕگەی سێیەم: سنووری عەورەتی ئافرەت (حدّ العورة من المرأة)**

زانایان جیاوازن لە دیاری کردنی عەورەتی ئافرەت لە کاتی نوێژدا. مالکی، ئەوزاعی[1]، شافعی،زاهیری،وای بۆ دەچن کەوا هەموو بەدەنی تەنها دەست و دەم و چاو نەبێ. حەنەفیەکان: هەموو بەدەنی عەورەتە تەنها دەست ودەم وچاو، پێی نەبێ، چونکە قاچ ئەویش وەك دەست هەموو کات دیار دەکەوێت.[2] بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن پێیەکان عەورەتە، ئەو فەرموودەیەی دایکی سەلەمەیە کە دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا ئافرەت دەتوانێ بە کراس وسەرپۆشەوە نوێژ بکات بەبێ چارۆکە، فەرمووی: بەڵێ: (( ئەگەر کراسەکە شۆڕ بوو سەرپێ یەکانی داپۆشت)). أتصلي المرأة في درع وخمار ليس عليها إزار؟ قال:(( إذا كان الدرع سابغاً يغطي ظهور قدميها)).[3]

ئەو بەڵگانەی هاتوون لەسەر دیار کەوتنی دەست ودەم وچاو: ئەو دوو فەرموودەیە کەپێشتر باسمان کرد: (( يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لا يصلح أن يرى منها إلا هذا وهذا)) ((أن النبي ﷺ نهى عن السَدْلِ في الصلاة، وأن يغطي الرجل فاه.[4]

وا پەسەندە بۆ ئافرەت کە نوێژ بکات بە کراس وسەرپۆش وچارۆکە، خۆی

---

1ـ الأوزاعي: عەبدولرەحمان کوڕی عەمرو، لە تیرەی ئەوزاعی یە، ئیمامی وولاتی شام بووە، لە شاری بەعلەبەکی لوبنانی لە دایك بووە، کتابی السنن في الفقه داناوە، لە ساڵی 157 ی کۆچی لە بەیروت کۆچی دوایی کردووە. الزركلي، الأعلام، 320/3.

2ـ ابن قدامة، المغني،60/1. والنووي، المجموع،173/3. والدرديري، الشرح الكبير ،214/1. والمرغنياني، الهداية وفتح القدير،180/1. والظاهري، المحلى،210/1. وابن العابدين، رد المحتار 405/1.

3ـ سنن أبي داود كتاب الصلاة باب: في كم تصلي المرأة، رقم الحديث: 640، 173/1.

4ـ سنن أبي داود كتاب الصلاة باب: السدل في الصلاة، حديث:643 ،174/1. وعارضة الأحوذي كتاب الصلاة ، 170/2.

پێیانەوە دادەپۆشێت. (ویستحب للمرأة أن تصلي في درع[1] وخمـار [2] وجلبـاب[3] تلتحف به).[4]

سنووری عەورەتی ئافرەتی ئازاد لە کاتەکانی جیا لە نوێژەکان زیاترە لەوەی لە کاتی نوێژ، ئەویش بریتیە لە نێوان ناوك وچۆك، لەو کاتەی بەتەنها بوو، یان لەگەڵ محرەمەکانی بوو، یان لەناو کۆمەڵی ئافرەتان بوو..[5]

## بڕگەی چوارەم: تەماشاکردنی ئافرەتی گەنج (النظر إلى المرأة الشابة)

چەند ڕایەك هەیە دەربارەی حوکمی تەماشاکردنی ئافرەتی گەنج:

1- ڕای حەنەفیەکان: هاتووە لە کتابی (الدر المختار):( قەدەغەیە بۆ ئافرەتی گەنج دەم وچاوی دەربخات لە ناو پیاوان، نەك لەبەر ئەوەیە عەورەتە، بەڵکو لەبەر ترسی فیتنەیە. ئیبن عابدین لە کتابی (رد المحتار على الدر المختـار) دەڵێ: ترسی فیتنە مانای ترسی کاری خراپەیە، چونکە لەوانەیە تەماشاکردنەکە بە ئارەزووی شەهوە بێت.[6]

2- ڕای مالکیەکان:( ئەوەی زانیوومە کەوا کاتی فیتنە دەبێ دەست و دەم و چاویشی داپۆشێ).[7]

---

1ـ الدرع: وەك کراس وایە ڕوپێیەکان دادەپۆشێ . لسان العرب، 331/4. وابن الأثير، النهاية في غريب الحديث والأثر، 114/2.

2ـ الخمار: سەرپۆش، سەر و مل ودادەپۆشێ. لسان العرب، 212/4.

3ـ الجلباب: کراس، پۆشاکێکە گەورەترە لە سەرپۆش، سەرو سنگ دادەپۆشێ، لەسەر درع لەبەر دەکرێت. لسان العرب، 317/2. وابن الأثير، النهاية ، 183/1.

4 ـ ابن قدامة، المغني، 432/1. و الفتوحي، ابن النجار، منتهى الارادات، 61/1.

5ـ الجزيري، عبد الرحمن، الفقه على المذاهب الأربعة، 192/1.

6ـ ابن العابدين، حاشية رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار، 406/1.

7 ـ الحطاب، الرعيني، مواهب الجليل في شرح مختصر الخليل،499/1.

3- لە تەفسیری قورتبی دا هاتووە:(ئەگەر ئافرەتەکە جوان بوو، ترسا لەوەی بڕواننە دەست و دەم وچاوی، دەبێ دایان پۆشێت).[1]

## بڕگەی پێنجەم: تەماشا کردنی ئافرەتی بێگانە لەلایەن پیاوەوە

پاش ئەوەی حوکمی دەست ودەم وچاومان ڕوون کردەوە، لێرەوە ئەمانەوێ بزانین ڕای زانایان دەربارەی تەماشاکردنی بەدەنی ئافرەت چیە.

1- **ڕای شافعیەکان:** حەرامە پیاوی پێگەیشتوو تەماشای بەدەنی ئافرەت، پیرێکی ئازاد بکات، بێجگە لە دەست ودەم وچاوی. لەکاتی بوونی فیتنە تەنانەت نابێت دەست ودەم وچاوی بە دەرەوە بێت، لەبەر ئەوە نیە کەوا ئەو دوو شوێنە عەورەتن بەڵکو لەبەر فیتنەو جولاندنی شەهوەیە.[2]

2- **ڕای حەنەفیەکان:** دروست نیە تەماشاکردنی بەدەنی ئافرەتی بێگانە، بێجگە لە دەست ودەم و چاو وقاچ، بەمەرجێ ئەو تەماشاکردنەش شەهوەی لەگەڵ نەبێ.[3]

3- **ڕای حەنبەلیەکان:** لە کتابی(المغنی) ئیبن قودامەدا هاتووە: ڕای ئیمام ئەحمەد وایە کەوا هەموو بەدەنی ئافرەت عەورەتەو تەماشاکردنی دروست نیە. قازی دەڵێ: حەرامە تەماشاکردنی تەنها دەست ودەم وچاو نەبێ، ئەو تەماشا کردنەش دەبێ بەبێ شەهوە بێ وکاتی فیتنە نەبێ.[4]

4- **ڕای مالکیەکان:** تەماشای دەم وچاوی ئافرەتی بێگانە حەرام نیە، ئەگەر پێویستیش نەبوو ئەو تەماشاکردنە ئەوا مەکروهە. ئەگەر ترسی شەهوەی هەبوو نابێ تەماشای بکات.واتە تەماشا کردنەکە پەیوەستە بەوەی کە شهوەی لەگەڵ

1 ــ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 429/12.
2ــ الرملي، شمس الدين، محمد بن أحمد ت:1004هــ، نهاية المحتاج إلى شرح المنهاج، 184/6.
3ــ الكاساني، علاء الدين، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، القاهرة، 121/5.
4ــ ابن قدامة، المغني ، 558/6.

نەبێ.[1]

5- ڕای شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە: تەماشا کردن بەبێ هۆیەکی شەرعی دروست نیە، تەماشا کردنیش دەبێ بە بێ شەهوە بێ تاوەکو پێشگری فەساد بکرێت، چونکە تەماشاکردن سەر دەبات بۆ مەحزوری شەرعی.[2]

6- ئەوەی لای ئێمە پەسەندە: دوور کەوتنەوە لە تەماشاکردنی ئافرەتی بێگانە مەگەر بۆ پێویستیەك بێت، کاتی فیتنەش نەبێت، ئەوە پاکترە بۆ هەردووکیان، دوورکەوتنەوەیە لە بزواندنی شەهوەو ئەنجامەکانی تری کە بەدواوەن.

خوای گەورە چاو داگرتنی بۆ پیاوان بەپێش خستووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾النور :30.

هەستەکانی مرۆڤ وەك دەرگایەك وان، کە لە ڕێگەیانەوە ڕووداوەکانی دەوروبەر دەچێتە ناو لەش ومێشکمان. هەربۆیە سیفەت وکەسایەتی هەر کەسێك تا ڕاددەیەکی زۆر بەندە بە دەوروبەر، چونکە ئەو نامانەی کەمێشك لە دەوروبەر وەریان دەگرێت کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر دروست بوون وگەشەی مێشك، گرنگترینی ئەو هەستانەش بریتیە لە بینین.

چاو خۆشی و لەزەت زۆر وەردەگرێ بە بینینی ئافرەتی جوان، هەروەك چۆن گوێ بەدەنگی خۆش لەزەت وەردەگرێ. تەماشا کردن بەچاوی شەهوە یەکەمین و گەورەترین و، ترسناکترین، فیتنەی نەفسی ئادەمیزادە، هەر لەوێوە دڵ هەست بە شەوق وئارەزوو دەکات بۆ جولەو بەیەك گەیشتن. هەر بۆیە پێغەمبەری پێشەواﷺ تەماشا کردنی بە زینای چاو داناوە، دەڵێ: ((چاوەکان زینا دەکەن، زینای چاویش بریتیە لە تەماشا کردن، دەستەکان زینا دەکەن، زیناکەیان بریتیە لە دەست وەشاندنی بە ناهەق، فەرج و عەورەت ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ، یان بە درۆی دەخاتەوە)) (( العينان تزنيان وزناهما النظر،واليدان تزنيان وزناهما البطش

---

1ـ الحطاب، مواهب الجليل في شرح مختصر الخليل، 500/1.

2ـ ابن تيمية، مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية، 251/1.

والفرج يصدق ذلك كله أو يكذبه))[1]

هەر لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیمامی عەلی ﷺ فەرموو[2]: ((ئەی عەلی تەماشا کردنەکانت یەك لە دوای یەك نەبێ، چونکە یەکەمت بۆ هەیە، بەڵام ئەوانی تر لەسەرت دەنووسرێ)) ((يا علي لا تتبع النظرة النظرة. فإن لك الأولى وليس لك الثانية)).[3]

ئیمامی زەمەخشەری دەڵێ:[4] (خوای گەورە بۆ پاراستن، چاوی پێشخستووەتە پێش فەرج، چونکە تەماشاکردن هەروەك دەڵێن: چاو پۆستەی زینایە، سەرمەشقی خراپەیە، کێشەکانی گەورەو توندە، بەئاسانی ناتوانێ خۆتی لێ بپارێزی.[5]

## بڕگەی شەشەم: هۆیەکانی پێشخستنی چاو داگرتنی پیاوان پێش ئافرەتان

1- گەر تەماشای جولەی سپێرم بکەین کاتی سەرکەوتنی بۆ گەیشتن بە هێلکە، دەبینین زۆر تەماشای ئەولا دەکات، بەڵام هێلکە کاتی هاتنە خوارەوەی زۆر هێمنانەو شەرمنانەیە. ئەو سپێرمەی نیشانەی نێرینەیە بەهێزترو خێراترە لەو سپێرمەی نیشانەی مێینەی هەڵگرتووە.

2- کوڕان وەڵامی بزوێنەرەکانی دیتن ودیمەنەکان زیاتر دەدەنەوە لە کچان. واتە کاریگەری دیتن لەسەر کوڕان بەهێز ترە، وەك بینینی وێنە وفلیمەکان. کچان

---

1ــ البستي ، ابن حبان ، ، صحيح ابن حبان ، 267/10. و أبو يعلي الموصلي، الرقم:6425، 309/11. والطبراني، المعجم الكبير، 152/10.

2ــ علي بن أبي طالب الهاشمي القرشي: چوارەمین جێنشینەکانە، کوڕی مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ، یەکێکە لەوانەی موژدەی بەهەشتی وەرگرتووە لە دونیادا، لە هەموو غەزوەکان بەشداری کردووە، قەلای خەیبەری فەتح کرد، خەلافەتی پێدرا دوای شەهید کردنی ئیمامی عوسمان، عەبدولرەحمانی کوڕی مەلجەم شەهیدی کرد لە ساڵی 40 ی کۆچی، لە هەموو هاوەڵەکانی پێغەمبەر زاناترو خوێندەوار تر بوو. ابن كثير، البداية، 324/7.

3ــ المستدرك عل الصحيحين، الحاكم، 212/2. وسنن الترمذي، 101/5. وسنن أبي داود، كتاب: اللباس، باب: ما يؤمر به من غض البصر 246/2.

4ــ محمود بن عمر جار الله الزمخشري: پێشەوا بووە لە زمان وبەلاغە، کتابی زۆری دلناوە، تەفسیری قورئانی هەیە بەناوی (الكشاف)، لە ساڵی 497 لە دایك بووەو لە ساڵی 537 کۆچی دوایی کردووە. السيوطي، بغية الوعاظ، 279/2.

5 ــ الزمخشري، الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل، 61/3.

وەڵامی بزوێنەرەکانی دەنگ زیاتر دەدەنەوە لە کوڕان.[1] هەر بۆیە پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە کەوا ئافرەت، باسی ئافرەتێکی تر بکات لای هاوسەرەکەی. لە ئیبن مەسعودەوە‌ؓ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( نابێت هیچ ئافرەتێك باسی ئافرەتێکی تر بکا لای هاوسەرەکەی، چونکە هەر وەك ئەوەیە، کە تەماشای بکات)) .((لا تباشر المرأة المرأة حتى تصفها لزوجها كأنه ينظر إليها)).[2]

ئەو دڵەی تام وچێژ وەردەگرێ بە چیرۆکی جینسی، ئەو چیرۆکە بە هۆی شفرەی تایبەتەوە دەگاتە دەماغ، لە وێشەوە وەك وێنەی ڕاستەقینە پیشانی دەدات، بەتایبەتی لای پیاو.

3- چونکە کاری پیاو زۆربەی کات لەدەرەوەی ماڵەوەیە، بۆیە چاوی بە ئافرەتی بێگانە زیاتر دەکەوێت.

4- (خوای گەورە سیفەتی چوونە پێش ودەست پێشخەری لە ئارەزوو، کار جینسی داوەتە نێرینەی ئادەمیزاد وگیاندارانی تر، بەڵام مێینە تایبەتمەندی خۆی وەلانان و لادان ودەستبەراگرتنە (الاحتجاز). ئەو جۆرە غەریزەیەش خوای گەورە خولقاندویەتی لەناو گشت گیانلەبەران بۆ بەردەمی ومانەوەی جۆرەکانیان.[3]

چاو داگرتن لەلایەن پیاوەوە ڕەوشتەکی دەروونیە، هەنگاوێکە بۆ دان بەخۆداگرتن تاوەکو نەڕوانێتە جوانی و ڕازاوەیی کەسانی تر. چاو داگرتن بەستنی پەنجەرەی کراوە و فیتنەو تووش بوون بە سەرێچیە، هەوڵێکیشە بۆ نانەوەی بەربەست لەبەردەم شەهوەی جینسی تاوەکو ئەو ژەهرەی وێنەی هەنگوین بۆی ڕازاوەتەوە نەگاتە ناو دڵ ومێشکی، ئەوانیش بیکەن بە فەرمان بۆ ماسولکەکان بۆ

---

*1_ Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 124, 138, 404.*

2_ البخاري: باب: كراهية مباشر المرأة المرأة، الرقم: 4942، 338/9.

الطبراني، أبو القاسم، المعجم الأوسط، الرقم: 4156 ، 266/4.

3_ عباس عقاد، المرأة في القرآن الكريم، ص35 .

جولانەوەیان وچوون بەرەو ئامانجەکە، ئەمەش بە گۆڕینی خەیاڵ و ئەندێشە بۆ واقیع و ڕاستەقینە.

پاراستنی فەرج بەرهەمێکی سروشتی چاو داگرتنە. یەکەم هەنگاوی زاڵ بوونە بەسەر ئیرادە، مانای هۆشیاری چاودێریە، سەرەتای کۆنترۆلی ئارەزووەکانە. هەربۆیە خوای گەورە لە یەك ئایەتدا کۆی کردوونەتەوە هەروەك (هۆکارو ئەنجام)، دوو هەنگاوی دوای یەك، لە هەردوو جیهانی ویژدان وجیهانی واقیعدا. هەردووکیان زۆر نزیك بەیەکن بە ئاسانی لێك جیا ناکرێنەوە. ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ﴾ النور :30.

هیچ یاسایەك نیە بتوانێ ئادەمیزاد محاسەبە بکات لەسەر تەماشا کردن وسزای بدات. چونکە هیچ نەفسێك چاودێرێکی بەسەرەوە نیە، تەنها نەفسی مرۆڤی موسڵمان نەبێ، کە هەردەم پەیوەستە بەوخوایەی کە چاو نایبینێ، بەڵام ئەو هەموو چاوەکان دەبینێ، هەر ئەویش بە بەزەیی و داناو زانا و پسپۆڕە (ئەویش زاتی پاکی خوای بەئاگاو زانایە).

فەرج و عەورەت ڕاستی زینای چاو دەسەلمێنێ یان بە درۆی دەخاتەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی، هەر بۆیە ئیسلام ئەو ڕێگانە دەگرێت کەبەرەو ئاراستەی زینا دەڕوات هەروەك کارێکی خۆپاراستن.هەندێك لەوڕێگایانەش ئەمانەن:

أ- تێکەڵاوی پەسەند نەکردووە، مانەوەی ژن وپیاوی بەتەنها لەیەك شوێن حەرام کردووە. ئەم دوو بابەتەش بەدرێژی باس دەکەین.

ب- خۆجوان کردن و ڕازاندنەوەش مەرجی تایبەتی بۆ داناوە. هەروەك بە درێژی باسمان کرد.

ج- هاندانی ئەو گەنجانەی کە توانایان هەیە، ژیانی هاوسەری زوو پێك بهێنن.

شەریعەتی ئیسلام هانی زوو پێك بهێنان ژیانی هاوسەری داوە، هەموو جۆرەکانی پەیوەندی جینسی نا شەرعی حەرام کردووە، هەروەك ئیبن عمر دەڵێ: ئێمە کۆمەڵە گەنجێك بووین لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ هیچمان نەبوو، پێی

فەرمووین: ((ئەی گەنجان ئەوەی کە توانای هەیە با ژیانی هاوسەری پێك بهێنێ، چونکە پارێزاوترە بۆ چاو، پارێزەری فەرجە. ئەوەی بۆی ناکرێت با بە ڕۆژو بێت، ڕۆژوەکە وەك بەربەست و پارێزەرە)).((يا معشر الشباب، من استطاع منكم البـاءة فليتزوج، فأنّه أغضّ للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنّه له وجاء)).[1]

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم: 21 . هاوسەریەتی هێمنی ئارامی جەستەیی و دەروونیە، هاوسەنگی ژیانە، ئاسوودەییە بۆ هەردوو ڕەگەز وەك یەك، هۆکاری مانەوەی جۆری ئادەمیزادە، چوونە پێشەوەی ڕەوڕەوەی ژیانە.

هاوسەریەتی شەرعی چاکترین و باشترین و سەرکەوتووترین هۆکاری تێرکردنی ئارەزووی جینسیە، هێمنی دەرونی پەشۆکاوە، ئاسوودەیی نەفسە لە ململانێ، داگرتن ودوور خستنەوەی چاوە لە حەرام، سۆزو بەزەیی وخۆشەویستیە هەر بۆیە خوا حەڵاڵی کردووە.[2]

لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان دەریان خستووە کەوا ئەو ئافرەتانەی بێ هاوسەرن، زۆربەیان تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبن، وەك: خەمۆکی(الكآبـة)، خەو زڕان، هەستی تەنیایی، شێرپەنجەی مێلکەدان و مەمك...هتد. ئەمانەو بێجگە لە ژیانەکی پڕ مەینەتی بە مانەوەیان لەناو خەڵکانێك کە بەسووك تەماشایان دەکەن، بەتایبەتی گەر لە خواترس نەبن. هەروەها باری دەرونیان هاوسەنگ نیە، زیاتر توورەن و دەمارگیریان زۆرە، لەژیانی لاسەنگی دەرونی دا دەژین.

1ـ البخاري: 70- النكاح باب: 3 حديث: 4779، 1950/5. مسلم: 16-النكـاح بـاب: حديث:1-1422، 1422/3. سنن أبي داود: كتاب النكاح باب: التحريض على النكاح، حـديث: 2046، 2/ 219.

2 ـ سيد سابق، فقه السنة، 13/2. ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، 232/4.

د- ئەوەی تواناى نیە ژیانی هاوسەری پێك بهێنێ با بە ڕۆژوو بێت، ڕۆژووەکە وەك بەربەست و پارێزەرە.

ڕۆژو گرتن کە بریتیە لە گرتنەوەی خواردن و خواردنەوە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ، کە تیایدا هەموو ئەو ووزە زیادەی ناو لەش خەرج دەکرێت وبەکاردەهێنرێ، بە هۆیەوە کرداری زیندەچالاکی و ڕژێنی هۆرمۆنەکان کەم دەبێتەوە. واتە ڕێگایەکی تەندروستی دروست وتەواوە بۆ داگرتنی ڕێژەی هۆرمونی نێرینە تیستۆستیرۆن لەگەڵ وەرگرتنی پاداشتی ڕۆژووەکە. ئەگەر ڕێژەی ئەو هۆرمونە بەرز بوو، ئەوا ئاراستەی ئەو کەسە بەرەو توندو تیژی ودژرایەتی دەبات لە پەیوەندی جینسی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و کارو کاسبی.[1]

هەروەك ئیبن قەیم دەڵێ: ڕۆژوو تەندروستی دڵ و ئەندامەکان دەپارێزێ، بۆی دەگەڕێنێتەوە هەموو ئەو شتانەی کە شەهوەو ئارەزووە جیاجیاکان لێی سەندوون بەدرێژایی ساڵ. باشترین هاورێ ویاریدەدەرو هاوکارە بۆ بەردەوام بوون لە سەر خوا پەرستی. هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ البقرة: 183

هەروەها دەڵێ: ئەگەر یەکێك شەهوە پاڵەپەستۆی خستە سەر یەکێکتان و خەریك بوو خۆی بەدەستەوە بدات ، با بە زووترین کات پشت بە ڕۆژووەوە ببەستێ،[2] هەروەك سەروەرمان فەرموویەتی: (ڕۆژوو پارێزەرە) ((الصيام جُنَّة)).[3]

هەموو مێشکێکی دروست، هەموو فیترەیەکی ڕاست، هەموو دڵێکی ژەنگ نەگرتوو دەزانێ ڕۆژوو لە بەرژەوەندی خەڵکە، ئاراستەی بەرەو چاکەیە، پارێزەری نەخۆشیە، کۆنترۆڵی ئارەزووەکانە، بەربەستە لەبەردەم گوناهو تاوانە.

---

1ـ القذافي، علم النفس في الإسلام، ص91 .والقصاب، للفروق بين الذكر والأنثى، ص97.
2ـ ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، 80/4.
3ـ البخاري: 30-كتاب الصوم باب: فضل الصوم الرقم:1894، 134/4. عن أبي هريرة.

هـ- ئیسلام دانانی هەر بەربەستێك لە پێش ژن هێنان بە پەسەند نازانێ، وەك زۆری مارەیی، نەهێشتنی گەڕانەوەی هاوسەرەکان بـۆ لای یـەکتری کـاتی لێـك زوێـر بوون...هتد.

و- دانانی توندترین سزا لەسەر تاوانی زینا، بوختان هەڵبەستان بـۆ ئـافرەتی داوێن پاك بەبێ بەڵگەی دروست. هەروەك خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَـٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَـٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَـٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾النور:4.

خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَـٰتِ ٱلْغَـٰفِلَـٰتِ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾النور:23.

خوای گەورە لەبەر گرنگی بابەتی بوختان هەڵبەستان سێ سزای داناوە، یەکەم: سزایەکی جەستەیی، کە بریتیـە لـە لێدانی هەشـتا دار، دووەم: سـزایەکی ئـەدەبی بریتیە لەوەی کە لەمەودوا قسەکانی سەنگی نابێ لەناو کۆمەڵگەو متمانە ناکرێ بـە گووتەکانی، سێیەم: سزایەکی ئاینی یە کە بە لادراو لە ئاین دەژمێـردرێ، نـەفرەتی دونیاو رۆژی دوایی دەکرێت، لە بەزەیی خوا بێ بەش دەبێت. ئەو هـەموو سـزایەش بۆ ئەوەیـە هـیچ کەسـێك نـەتوانێت بـە نـاڕەوا حـەیاو ئـابڕووی ئـافرەتی موسـڵمان لەکەدار بکات، پشێوی وکێشە بخاتە ناو کۆمەڵگەی ئیمانداران، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە مانای ڕێزگرتنی شەریعەتی ئیسلامە لە ئافرەت بەگشتی و پارێزگاری کـردن لە ئابڕووی بەتایبەتی، چونکە وابزانم پیرۆز ترین سەرمایە لای هەردوو ڕەگەز بریتیە لە حەیاو ئابڕوو ناوبانگ(السمعة)، گەر لەکەدار کرا، لابردنـی ئـەو لەکەیـە وا ئاسـان نیە.

ئەی خوشکانی بەڕێز سەرنجی ڕێزی ئیسلام بۆ ئافرەت وگرنگی دانی ئیسلام بـە کێشەکانی ئافرەتان بدەن، دەبینین کەوا شـەریعەتی ئیـسلام بـۆ یـەکلا کردنـەوەی زۆربەی کێشەکانی ناو دادگاو قەزاوەت تەنها دوو شاهیدی ویستووە، بەڵام بۆ یەکلا کردنـەوەی ڕووداوی زینـا چـوار شـاهیدی داوا کـردووە، گـەر ئـەو کەسـەی ئـەو

بوختانەی کردووە چوار شاهید ئامادە نەکات ئەوا هەشتا جەلدەی لێدەدرێت، لەگەڵ ئەو سزایانەی تر کە لە سەرەوە باسمان کرد. هەروەها پێغەمبەر ئەو کردارە ناشرینەی بە یەکێك لە حەوت گوناهە گەورەکان ژماردووە، ڕیزبەندی دووەمی وەرگرتووە پاش هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خوا. ئەبو هورەیرەﷺ دەگێڕتەوە بۆمان لە پێغەمبەری خواﷺ: ((دوور بکەونەوە لە حەوت تاوانی گەورە، گوتمان چین ئەمانە ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: دانانی هاوبەش بۆ خوا، بوختان هەڵبەستان بۆ ئافرەتی موسڵمانی بێ ئاگا...)) ((اجتنبوا السبع الموبقات" قيل وما هن يا رسول الله؟ قال:"الإشراك بالله...وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات)).[1]

ز- نەترسان لە برسیەتی بەهۆی بوونی منداڵ:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ﴾الأنعام: 151. ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴾ الإسراء: 31.

عەرەبەکانی سەردەمی جاهیلی پێش ئیسلام، گەر منداڵێکی مێینەیان بوایە، ئەوا زیندە بەچاڵیان دەکرد لە ترسی برسیەتی، لەترسی کەوتنە دەستی دوژمن و بەندایەتی، بەڵام پەروەردگار فەرمانی ئاسوودەیی پێ بەخشین، فەرمووی گەر ئێوە لە باری برسی و نەبوونی بوون ومنداڵێکی مێینەتان بوو، ئەوا ئێمە بژێوی ئێوەو ئەوانیش دەدەین. ئەگەر ئێوە لەبارێکی ئابووری ئاسایی دابوون و، منداڵێکی مێینەتان بوو ، ئەوا بە هۆی هاتنی ئەوانەوە مەترسن لە تووش بوون بە برسیەتی، ئێمە بژێوی ئەوان و ئێوەش دەدەین.

بەرامبەر ئەو شتانەی باسمان کرد، دەبێت ئافرەتیش ڕەچاوی فەرمانەکانی خوا بکات لەوەی نەچێتە دەرەوە بە شێوەیەکی وا ڕازاوە کە ببێتە هۆکاری چاو بازی و فیتنە بۆ گەنجان، تەماشای ئەم لاو ئەولا نەکات بە چاوێکی برسی وئاراستەداری

1ـ البخاري: 59- الوصايا باب:24، رقم الحديث:2615، 1017/3.

شەهوانی، جوانیە شاراوەکانی خۆی دەرنەخات، جا چ جوانی جەستەیی بێت، یان ڕازاوەیی بە خشڵ وزێڕ بێت، چونکە خوای گەورە هەمان ئەو فەرمانەی کە بۆ پیاوانی ناردووە، بەهەمان شێوە بۆ ئەوانیشی ناردووە لەو دوو ئایەتی یەك لە دوای یـــــــەك. ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ النور: 31.

## بڕگەی حەوتەم: تەماشا کردنی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە

هەروەك باسمان کرد کەوا دڵ بە بینینی جوانیەکان خۆش دەبێ، جا چ لەلایەن نێرینە بێت، یان مێینە. ئافرەتیش لەناخی دڵەوە مەیل وئارەزووی بەلای پیاودا دەڕوات، بە تەماشاکردن ئارەزووی دەبزوێ، هەر بۆیە خوای گەورە فەرمانی بە ڕەگەزی مێینەش کردووە کە چاویان دابگرن، بەڵام فیتنەی تەماشاکردنی حەرام لە مێینە زۆر کەمترە لەوەی نێرینە لەبەر هەندێ هۆکاری فسیۆلۆژی ودەرونی و ئەخلاقی.

1- کاتی هێلکە لە هێلکەدان دادەبەزێ، شێوەی زۆر جوان و ڕازاوەیە، بە هێمنی و بەلارو لەنجە دەڕوات، بەڵام هەرگیز تەماشای ئەم لاوئەولا ناکات هەروەك لە سپێرمدا دەبینین، چونکە کار دەکاتە سەر جوانی و سەنگ و کەسایەتیەکەی. واتە سیفەتی جوانی، ڕازاوەیی، حەیاو شەرم، هێمنی وچاو داگرتن لە ئافرەتان خۆڕسکەو فیترییە.

2- هەروەك چۆن لە ژیانی ناو سکی دایك سپێرم بەدوای هێلکە دەچێت وداوای دەکات وهەوڵ دەدات ببێتە هاوبەش وهاوسەری ژیانی، بە هەمان شێوە خوای گەورە لە ژیانی دونیادا وای داناوە پیاو داوای ئافرەت بکات، تاوەکو ئافرەت هەر لەسەر سەنگ وجوانی حەیاوشەرمی خۆی بمێنێ. ئەو زانستە پزیشکیانە بەڕاستی ڕێزی ئیسلام بۆ ئافرەت وبەرز نرخاندنی ئافرەتمان بۆ دیاری دەخات، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئافرەتان خۆیان ئەو خەڵاتە خواییەیان ناوێت، لەجیاتی سوپاس

گوزاری، كوفری پێدەكەن، مەگەر ئەوانەی خوای گەورە بەزەییی پێیان هاتۆتەوە.
﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾النحل: 83

3- پێكهاتەی جەستەیی ئافرەت جوانترو ڕێكترە، شێوەو ڕوكاری دەرەوەی ڕازاوەترە لەوەی پیاو، ئەمانەش وا لە پیاو دەكەن زیاتر ئارەزووی تەماشاكردنی زیاتر بێت، زیاتر بیر لە جوانی ئافرەت بكاتەوە. پیاو كە لە دەرەوەن زۆربەی كات بۆ كاركردن و بژێوی پەیدا كردنە، بۆیە بە دیمەنێكی ڕازاوە وپۆشتەیی دیار ناكەوێت. هەرچەندە لەم سەردەمەی ئێستامان جۆری ژیان وكاركردن وبژێوی پەیدا كردن بۆتە كێخوایەتی و ماندوو بوون وهیلاكی پێوە دیار نیە، بۆیە خوای گەورە بۆ ئافرەتانیش چاو داگرتنی دەستوور داوە.

4- ئارەزووی جینسی ئافرەتیش دەجوڵێ بەتەماشاكردنی پیاو. بەڵام لەبەر كەم جورئەتی ئافرەت وكەم چوونە پێشی ئەو هەستی بینینە نا بێتە بزوێنەرێكی كاریگەر لە ناو دەماخ وجولێنەری دەمارە خانەكان، تاوەكو ببێتە بارگەیەكی كارەبایی بۆ جولانی ماسولكەكانی لەش بە ئاراستەی ئامانجەكە، ئەو خەیال وئەندێشەی هەیبووە نا بێتە واقیع وڕاستەقینە هەروەك لە نێرینەدا دەیبینین.

5- سروشت وخۆڕسكی لە گشت ئافرەتێكدا دوورە پەرێزی و دووركەوتنەوە، قەدەغە كردن و وبەرپەرچ دانەوە زۆر زەق وئاشكرایە.[1]

6- ئافرەتان بەگشتی زیاتر گرنگی بە مەسائلی جوانی، كۆمەڵایەتی، ئاینی دەدەن.

7- ئافرەتان بە گشتی زیاتر ڕەچاوی ئەركە شەرعیەكان دەكەن، وەك پۆشتەیی وداپۆشین و نەهاتنە دەرەوە. هەر ئەوانەشە وای كردووە بێتە بەربەست لەبەردەم دروستبوونی كێشە كۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەكان.[2]

لە كۆتاییدا دەڵێم: تەماشاكردنی ئافرەت بۆ پیاو بە پلەی دووەم دێت لە

---

1ــعباس عقاد،المرأة في القرآن،ص35.والمودودي،أبو الأعلى المودودي،الحجاب، ص195.
2ــ الخشت، محمد عثمان، وليس الذكر كالأنثى ، ص36.

ترسناکی وکەوتنە ناو گوناهو تاوانی داهاتوو، گەر وانەبوایە ئەوا خوای گەورە حیجاب و پۆشتەیی لە سەر پیاوانیش دادەنا تاوەکو ئافرەتان تەماشایان نەکەن، والله اعلم .

## ڕای زانایانی ئیسلام دەربارەی تەماشا کردنی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە:

هەروەك چۆن واجب کراوە چاو داگرتنی پیاو بەرامبەر ئافرەت، بە هەمان شێوە بۆ ئافرەتانیش. لێرەوە باسی ڕای زانایان دەکەین لەو بارەیەوە:

### 1- مەزهەبی شافعی:

دەشێت ئافرەت تەماشای بەدەنی پیاو بکات بێجگە لەو بەشەی نێوان ناوك و چۆك، بەمەرجی ئەوەی تەماشاکردنەکە بە شەهوەت نەبێت و.سەردەمەی فیتنەیی نەبێت. بەڵگەشیان ئەو فەرموودەی عائشەیە ﵂: ((عائیشە تەماشای بەندەکانی حەبەشەی دەکرد، کە یاریان دەکرد لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش تەماشای ئەوی دەکرد)) ((إنها نظرت إلى الحبشة يلعبون في المسجد والنبي ﷺ يراها)).[1]

### 2- مەزهەبی حەنەفی:

تەماشای هەموو بەدەنی جائزە بێجگە لە نێوان ناوك وچۆکی، چۆك عەورەتە لە مەزهەبەکەیان. سنووری تەماشا کردنی ئافرەت بۆ پیاو، هەروەك سنووری تەماشاکردنی پیاو بۆ پیاوە. واتە ئەو شوێنانە پیاو کە بۆ پیاو تەماشا کردنی جائز نیە ئەوە بۆ ئافرەتیش هەروایە. [2]

### 3- مەزهەبی مالکی:

نا بێت ئافرەت لەو سنوورە زیاتر تەماشای پیاوی بێگانە بکات، تەنها بەقەدەر

---

1ـ الرملي، نهاية المحتاج، 191/6. والشربيني، مغني المحتاج، 17/3.
2ـ ابن عابدين، رد المحتار على الدر المختار، 371/6.

ئەوە نەبێت كە پیاو دەتوانێ تەماشای پیاو بكات. ئەویش بریتیە لە دەست وقاچ و دەم وچاو، تەماشا كردنێكی بێ شەهوە وئارەزوبازی.[1]

4- مەزهەبی حەنبەلی:

بۆی هەیە تەنها سنووری سەرووی ناوك وخوار چۆك، بەبێ شەهوە.

5- لای شافعی وحەنەفیەكان[2]:

چاكتر وایە بۆ ئافرەتی گەنج كە چاوی داگرێ لە ترسی بزواندنی ئارەزوو، ڕوودانی فیتنە. بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە: ئوم سەلەمە ﷺ دەڵێت، من و مەیموونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین عبد الله كوڕی مەكتوم هاتە ژوورەوە، لەو كاتە بوو كە ئایەتی پۆشتەیی وحیجاب دابەزی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی خۆتان دوور بگرن وداپۆشن، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی ئەو كوێر نیە ؟ فەرمووی: (( خۆ ئێوە كوێر نین؟ ئەی ئەو نابینن؟)). ((احتجبا منه. فقلنا: يا رسول الله: أليس هو أعمى لا يبصرنا ولا يعرفنا؟ فقال النبي:(( أفعمياوان أنتما؟ ألستما تبصرانه؟)). [3]

6- لەبەر ڕۆشنایی ووتەی زانایان دەگەینە ئەو ئەنجامە: سنووری تەماشاكردنی ئافرەت بۆ پیاو، هەروەك سنووری تەماشا كردنی پیاو بۆ پیاوە واتە بۆی هەیە تەنها سنووری سەرووی ناوك وخوار چۆك، بەمەرجی ئەوەی تەماشا كردنەكە بۆ ئارەزووبازی نەبێ، سەرچەمی فیتنەش نەبێ.

---

1ـ الشرح الكبير للدردير وحاشية الدسوقي، 215/2. وحاشية الصاوي،106/1. و مواهب الجليل للحطاب، 105/1.

2ـ الكاساني، بدائع الصنائع، 122/5.

3ـ سنن أبي داود ، كتاب: اللباس، باب: وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن، الحديث:4112 ، 63/4.

## بەندی دووەم: مانەوەی ئافرەت لەماڵەوە، تێکەڵاوی، بە تەنهایی ژن و پیاو (قرار المرأة في البيت، قضية الاختلاط والخلوة بالأجنبية).

### بڕگەی یەکەم: مانای مانەوە (معنى القرار)

مانەوە لە شوێنێك، دابەزین ونیشتەجێ بوون. کە گووترا فلان کەس ماوە: مانای ئاسوودەو ونیشتەجێ بوو. هەروەها بە مانای سەنگینی بە حەیایی دێت (الوقار).[1]

مانای(البَرَجُ): هەموو شتێکی بەرز ودیار. کاتێ بە منارەکان و تەلارەکان دەڵێن (البروج) چونکە بەرزو دیارن. بۆ ئافرەتان بەمانای دیارخستنی جوانی و ڕازاوەیی دێت. بەمانای دەرکەوتنی ئافرەت بۆ بزواندنی ئارەزووی پیاو دێت. هەروەها بەمانای ڕۆیشتنی بەلارولەنجە، بەرز ڕوانین، قەشەنگی دێت.[2]

سەید سابق دەڵێت: لە بنچینەوە بەمانای هاتنە دەرەوە لە کۆشك و تەلار دێت، لە دوایی بەکار هێنرا بۆ هاتنە دەرەوەی ئافرەت لە چوارچێوەی پۆشتەیی وحەیاو شەرم، دەرخستنی جوانی وڕازاوەیی بۆ خەلکی بێگانە.[3]

ماڵ بریتیە لە شوێنی سەرەکی ونیشتەجێ بوونی ئافرەت، شوێنی بنچینەی ژیانی ئافرەتە بۆ پەروەردەکردنی نەوەکانی دواڕۆژ گۆشکراو بە پەروەردەیەکی ڕاست ودروست، لە ژێر چاودێری دایك، لە ئامێزی پڕ سۆزو بەزەیی، کەش و هەوایەکی لەبار بۆ گەشەی مێشك وئارامی دەرون ونەشونمایی جەستەیی. هەر کاتێ منداڵ بەردەوام لای دایکی بوو ئەوا شیری گەرم وئامادەی هەیە بەبڕو ئەندازەی پێویستی خۆی، لە ئامێز گرتنی سەرچاوەی ئاسوودەیی وکامەرانی منداڵەکەیە، نزیك بوونەوەیەکی وپێکەوەنووسانی جەستەیی ودەرونیە، کە زۆر

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 99/11.
2ـ ابن منظور، لسان العرب، 1/ 359.
3ـ سيد سابق، فقه السنة، 209/2.

پێویستە بۆ دوا ڕۆژی منداڵەکە. (بەدرێژی باسی سوودەکانی شیر پێدانی سروشتی کراوە بۆدایك وبۆ منداڵەکەی لە کتێبی– تەنها بۆ ئافرەتان) دانەر.

بۆ پاراستنی کۆمەڵگە لە کێشەی پەروەردەی منداڵ وتێکەڵاوی بێ سنوور، ئیسلام بەرنامەیەکی تایبەتی داناوە دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ژیانی ئافرەت لەناو ماڵ ولەدەرەوەی ماڵ واتە ناو کۆمەڵگە. خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾الأحزاب: 33.

ئیمامی ئیبن کثیــر لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێ: واتە ماڵ بکەنە شوێنی بەردەوامتان، تیایدا مەچوونە دەرەوە مەگەر بۆکاری پێویستی وەك چوونە مزگەوت، جێبەجێ کردنی پێویستیەکانیان نەبێ. موجاهد دەڵێ[1]: ئەگەر چووە دەرەوە بۆ ئەوەی لە نێوان پیاوان بڕوات، ئەوە تەبەروجە. قەتادە دەڵێ: ئەگەر لەماڵ چوونە دەرەوە بەلارولەنجە، بە ناز و دەلال ڕۆیشتن، ئەوەیە تەبەروج، هەر ئەوەشە خوای گەورە قەدەغەی کردووە. موقاتل کوڕی حەیان[2] دەڵێت: ئەگەر سەرپۆشەکەی بەجوانی توند نەکردو مل وملوانکەی دەرکەوت، ئەوە تەبەڕوجی نەفامانی پێشینەکانە.[3]

---

1ـ المجاهد: موجاهد کوڕی جەبر، ئەبو حەجاج المکي الأسود. شێخی خوێنەران وموفەسیرەکان بووە، زۆر فەرموودەی لە ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە، هەر لەو فێرە فیقهو وتەفسیر بووە، هەروەها زۆر زانستیشی لە ئەبو هورەیرەو عائیشە وەرگرتووە، ساڵ 100 کۆچی دوایی کردووە.الذهبي، سیر أعلام النبلاء، 449/4.

2ـ مقاتل بن حیان بن روال دور. پێشەولو زاناو موحەدیث، خاوەنی فەرموودەی زۆر، چاکە خوازو زاهید بوو، چووە کابول خەڵکێکی زۆر لە سەر دەستی موسوڵمان بوون. ساڵی 150 کۆچی دوایی کرد. الذهبي، أعلام النبلاء ،340/6.

3ـ ابن کثیر، تفسیر القرآن العظیم، 2805/6 وما بعدها. تفنج: بە ناز و دەلال.

## بڕگەی دووەم: مانەوە لەماڵ وفێربوون

لێرەوە دەمەوێت هەندێ خاڵی زانستی پزیشکی ودەروونی بخەمە ڕوو بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا ماڵ باشترین وگونجاوترین شوێنی کاری ئافرەتە.

1- توانستی شوێن دیاری کردن(القدرة المکانیة) [1] لە ئافرەتان لە هەردوولای دەماخدا بڵاوبۆتەوە بەبێ ڕێکخستن، بەڵام لە پیاوان یەك پارچەو کۆیە، لەیەك لای دەماخەوەیە. هەر بۆیە کچان ئاستی ئەنجامدانی یاریی تۆپی پێ وتۆپی تێنس و یاریەکانی تریان زۆر کەمترە لە کوڕان. لەبەر ئەو هۆیەشە زانایان دەڵێن توانای ئافرەت بۆ کارکردن لە شوێنەکی تەسك، وەك ماڵ باشترە لە کارکردنی لە شوێنەکی فراوانی بەربڵاو. هۆکاری ئەوەش دەگەڕێننەوە بۆ هۆرمۆنەکانی جینسی، بەڵام چۆنیەتی کاریگەری ئەو هۆرمونانە تاوەکو ئێستا نەدۆزراوەتەوە.[2]

2- کۆرپەی ئادەمیزاد جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ گیانلەبەرانی تر لە بواری پەروەردەکردن. دەبینین کۆرپەی ئادەمیزاد کاتێکی زۆرو چاودێریەکی توند ومانوو بوونەکی زۆری دەوێت، دەگاتە زیاتر لە دوو ساڵ، تاوەکو بتوانێ پێویستیە ژیانییەکانی خۆی جێبەجێ بکات وەك خواردن و نوستن وبەرگری کردن. سێ ساڵی یەکەمی ژیانی کۆرپەی ئادەمیزاد زۆر ناسکەو هەستیارە، بەبێ بوونی دایکی هەرگیز ناتوانی ژیانێکی ئاسوودەو بەختەوەر بباتە سەر، گەر نەمرێت ئەوا توشی چەندەها کێشەی دەروونی و جەستەیی دەبێت لە داهاتوودا. ئاماژەمان بە بابەتی دایکایەتی کرد لە بەشی سێ یەم لە بەرگی یەکەم.[3] ئەگەر منداڵ لەو تەمەنە لە ئامێزی دایکی ولەژێر سەرپەرشتی باوکی گەشەی کرد ئەوا پەیوەندیەکی توندی

1ـ القدرة المکانیة: بریتیە لە توانای ئافرەت بۆ دیاریکردنی شوێن، شوێنی ئەو کەل وپەلانەی لە دەوروبەری ئافرەتن لە شوێنەکی سێ لایەنی، توانای ئافرەت لەسەر پێکەوە بەستانی هۆکارەکانی بینین لەناو ئەو شوێنە سێ لایەنە.

عبد اللطیف یاسین، الفروق، ص169-170.

2ـ القصاب، عبد اللطیف یاسین، الفروق بین الذکر والأنثى، ص170.

3ـ بەرگی یەکەم/ بەشی سێیەم.

سۆزو بەزەیی، ڕێزگرتن، پەیوەندی دڵ وگیانی دروست دەبێت لە نێوان ئەو منداڵەو دایك وباوكی، لەگەڵ دروست بوونی مافی هەریەکیان بەرامبەر ئەوی تریان.

2- ووزەی ئافرەت ووزەیەکی شاراوەیە، بواری کاری ئەو ووزەیە ناوەکیە، توانای ئەو ووزەیەش بەکاردێت بۆ دروستکردن وشێوەکاری. هەروەك لە هێلکەی مێینە بینیمان، کەوا دوای پیتێن، هەموو ووزەی ئەو خانە نوێ یە لە هێلکە وەردەگیرێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك، تاوەکو هێلکە خۆی بە دیواری منداڵدانەوە هەڵدەواسێ کە دەگاتە 8-10 ڕۆژ. پاش ئەو ماوەیەش هەر دایکە بە خواردن و خوێنی خۆی بژێوی کۆرپەلە دابین دەکات.

3- ئەگەر بە ووردی سەرنجی ژیانی منداڵێکی مێینە بدەین، دەبینین هەر لەو تەمەنە ئارەزووی بەلای دروست کردنی خانوویەکی بچوك دەچێت، هەندێك کەل و پەلی ناو ماڵی تیایدا کۆ بکاتەوە. سەیر دەکەین زۆر بە ئیخلاص ودڵسۆزیەوە پارێزگاری دەکات هەر وادەزانێ ڕاستیە، گەر هەوڵی ئەوە بدرێت ئەو ماڵەی تێك بدرێت زۆر بە پەرۆشەوە بەرگری دەکات. درێژی ئەو بابەتە لە بەشی سێیەم / بەرگی یەکەمە.[1]

هەر بۆیە پێویستە یەکەمین کاری ئافرەت پەروەردەی منداڵ بێت، پێش ئەوەی بیر لە هەر شتێکی تر بکاتەوە، هەرچەندە ئەو کارە بۆ بەدەست هێنانی داهاتێکی ئابووری، فێربوونی زانیاری، سوودێکی کۆمەڵایەتی بێت، چونکە پەروەردەی نەوەی دوا ڕۆژ زۆر گرنگترە لە سوودێکی کاتی تاکی، مەگەر بۆ پێویستیەکی زۆر گرنگ بێت، وەك پەیوەست بە مان ونەمانی خێزانێك یان کۆمەڵگەیەك.

---

1- بەرگی یەکەم/ بەشی سێیەم .

## بڕگەی سێیەم: تێکەڵاوی (الاختلاط)

لە عمرەی کچی عبد الرحمن دەگێڕنەوە[1] ، کە عائشە ﵂ فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد، کاتێ ئافرەتەکان دەهاتنە دەرەوە داپۆشرابوون بە چارۆگەکەیانەوە، لەبەر تاریکی بەیانیش هەر نەدەناسرانەوە)) ((إن رسول اللهﷺ ليصلي الصبح، فينصرف النساء متلفعات* بمروطهن، ما يعرفن من الغلس[2])).[3]

زوهری دەڵێ ئوم سەلەمە ﵂ پێی ڕاگەیاندم: (( کاتێ پێغەمبەری خوا نوێژی تەواو کرد، ئافرەتەکان زوو هەڵدەستان و دەڕۆیشتن، بەڵام پێغەمبەرﷺ ماوەڵانی ماوەیەك دەمانەوە، کاتێ پێغەمبەرﷺ هەڵسا، ئەوکات ئەوانیش هەڵدەستان)). ((أن النساء في عهد رسول اللهﷺ كن إذا سلمن من المكتوبة قمن، وثبت رسول اللهﷺ ومن صلى من الرجال ما شاء، فإذا قام رسول اللهﷺ قام الرجال)).[4] ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: ئەوە بۆ ئەوە بووە تاوەکو ئافرەتەکان بڕۆن و، هیچ کەسێك لە پیاوەکان پێیان نەگات. ((نرى ــ والله أعلم ــ إن ذلك كان لكي ينصرف النساء، قبل أن يدركن أحداً من الرجال)).[5]

ئەو هەموو ئاگادارییە بۆ ئەوەیە تێکەڵاوی دروست نەبێت، چونکە هەر لە تێکەڵاویە مەوعدی مانەوەی تەنهایی دادەنرێت، هەر لە تەنهاییشەوە شەیتان بە هۆی هۆکارە ڕازاوە جۆراو جۆرەکانی خراپە کاریەکان ساز دەکات، هانی ئارەزووە خۆڕسکەکان دەدات بۆ بوون بە کرداری بەرجەستەی وەك زیناو فاحشە. هەر لەو کۆمەڵگانەی کە تێکەڵاوی زۆرە دەبینین زیناو منداڵی ناشەرعی وکێشەکانی تری

---

1ــ عمرة بنت عبد الرحمن بن أسعد بن زرارة البخاري: شا ژنی ئافرەتانی تابعیەکانە، شارەزایی زۆری لە فیقهو حەدیث هەبوو، خەڵکی مەدینەیە، فەرموودەی زۆری لە عائشە وەرگرتووە الزركلي، الأعلام ، 72/5. وكحالة، أعلام النساء، 1086/2.* المتلفعات: داپۆشەر. هەر شتێکە کە ئافرەت خۆی پێ دادە پۆشێت. الفيروز آبادي، قاموس المحيط:983

2ــ الغلس: تاریکی کۆتایی شەو. ابن الأثير، نهاية غريب الأثر، 377/3.

3ــ البخاري 16 ــ صفة الصلاة باب:79 الحديث: 829، 296/1.

4ــ البخاري 16 ــ صفة الصلاة باب: 79 الحديث : 828 ، 296/1.

5ــ المصدر نفسه، الحديث: 832 ، 296/1.

کۆمەڵایەتی زۆر بڵاوە. ئەوەش ڕاستی فەرموودەی پێغەمبەرمان بۆ دیاری دەخات. لە ئیمامی عومەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر پیاوێك بەتەنهایی ماوە لەگەڵ ژنێك ئەوا سێیەمیان شەیتانە)) ((ألا و لا يخلون رجل بامرأة فإن ثالثهما الشيطان)).[1] لە ئیبن عەباسەوە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نابێت پیاوێك وژنێك بەتەنها بمێننەوە مەگەر یەکی مەحرەمیان لەگەڵدابێ)) ((لا يخلوّن أحدكم بامرأة إلا مع ذي محرم)) [2]

لە عەقەبەی کوڕی عامرﷺ دەگێڕنەوە[3]، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((زۆر ئاگاداری تێکەڵاوی ژنان بن)) یەکێك لە پیاوانی ئەنساریەکان ووتی ئەی پێغەمبەری خواﷺ: دەربارەی ماڵە خەزوران؟ فەرمووی: ((خەزوران مردنە)). ((إيّاكم والدخول على النساء)).فقال رجل من الأنصار يا رسول الله: أ فرأيت الحمو؟ قال: ((الحمو الموت)).[4] واتە تێکەڵاوی ژن وپیاو هەرچەندە خزم ونزیکی یەکتری بن هەر ناشەرعی وقەدەغەیە، زۆر جاریش ترسناکترە، چونکە بەهۆی ئەو نزیکیەوە زیاتر تێکەڵاو دەبن، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا بە مردن ناوی بردووە.

بەم شێوەیە ئیسلام دەروازەکانی تێکەڵاوی نێوان ژن و پیاوی داخستووە، هەرچەندە نزیکی یەکتریش بن، چونکە فیتنەی تێکەڵاوی بۆ کۆمەڵگە گەورەترە لە خزمایەتی. خوای گەورە هەندێ خزمی نزیکی هەڵاوێردووە لەو قەدەغە کردنە، وەك: هەموو ئەو کەسانەی مەحرەمن لە پشتەوە(النسب) بێت یان بەهۆی شیر پێدان، ژن هێنان (الصهر)، وەك: باوکی مێردو منداڵەکانی، هەروەها ئەوانەی لەو

---

1ـ الطبراني المعجم الصغير حديث: 245 ، ص 108 ـ 109.

2ـ البخاري 70 ـ النكاح باب: 110 الحديث: 4935 ، 2005/5.

3ـ عقبة بن عامر بن عمرو الجهني: هاوەڵێکی بەڕێزە، فەرموودەی زۆری وەرگرتووە، ئیبن عەباس وزۆری تر فەرموودەیان لێ وەرگرتووە، شارەزایی زۆری هەبووە بە فەرزەکان، شاعیرێکی زمان پاراویش بووە، یەکێك لەوانە بووە قورئانی کۆ کردۆتەوە، زۆربەی جەنگەکانی دیووە، نامەکانی ئیمامی عومەری گەیاندوە کاتی فەتحی دیمەشق، لە شەڕشی صفین لەگەڵ معاویە بووە. ساڵی 47 کۆچی دوایی کردووە .ابن حجر، الإصابة، 482/2.

4ـ البخاري: 70- النكاح باب:10 الحديث : 2005/5،4934.

کۆمەڵایەتی زۆر بڵاوە. ئەوەش ڕاستی فەرموودەی پێغەمبەرمان بۆ دیاری دەخات. لە ئیمامی عومەرﷺ دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((هەر پیاوێك بەتەنهایی ماوە لەگەڵ ژنێك ئەوا سێیەمیان شەیتانە)) ((ألا و لا يخلـون رجل بامرأة فإن ثالثهما الشيطان)).[1] لە ئیبن عەباسەوەﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((نابێت پیاوێك وژنێك بەتەنها بمێننەوە مەگەر یەکی مەحرەمیان لەگەڵدابێ)) ((لا يخلوّن أحدكم بامرأة إلا مع ذي محرم)) [2]

لە عەقەبەی کوڕی عامرﷺ دەگێڕنەوە[3]، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((زۆر ئاگاداری تێکەڵاوی ژنان بن)) یەکێك لە پیاوانی ئەنساریەکان ووتی ئەی پێغەمبەری خواﷺ: دەربارەی ماڵە خەزوران؟ فەرمووی: ((خەزوران مردنە)). ((إيّاكم والدخول على النساء)).فقال رجل من الأنصار يا رسـول الله: أ فرأيـت الحمو؟ قال: ((الحمو الموت)).[4] واتە تێکەڵاوی ژن وپیاو هەرچەندە خزم ونزیکی یەکتری بن هەر ناشەرعی وقەدەغەیە، زۆر جاریش ترسناکترە، چونکە بەهۆی ئەو نزیکیەوە زیاتر تێکەڵاو دەبن، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا بە مردن ناوی بردووە.

بەم شێوەیە ئیسلام دەروازەکانی تێکەڵاوی نێوان ژن و پیاوی داخستووە، هەرچەندە نزیکی یەکتریش بن، چونکە فیتنەی تێکەڵاوی بۆ کۆمەڵگە گەورەترە لە خزمایەتی. خوای گەورە هەندێ خزمی نزیکی هەڵاوێردووە لەو قەدەغە کردنە، وەك: هەموو ئەو کەسانەی مەحرەمن لە پشتەوە(النسب) بێت یان بەهۆی شیر پێدان، ژن هێنان (الصهر)، وەك: باوکی مێردو منداڵەکانی، هەروەها ئەوانەی لەو

---

1ـ الطبراني المعجم الصغير حديث: 245 ، ص 108 ـ 109.

2ـ البخاري 70 ـ النكاح باب: 110 الحديث: 4935 ، 2005/5.

3ـ عقبة بن عامر بن عمرو الجهني: هاوەڵێکی بەڕێزە، فەرموودەی زۆری وەرگرتووە، ئیبن عەباس وزۆری تر فەرموودەیان لێ وەرگرتووە، شارەزایی زۆری هەبووە بە فەرزەکان، شاعیرێکی زمان پاراویش بووە، یەکێك لەوانە بووە قورئانی کۆ کردۆتەوە، زۆربەی جەنگەکانی دیووە، نامەکانی ئیمامی عومەری گەیاندوە کاتی فەتحی دیمەشق، لە شەڕی صفين لەگەڵ معاويە بووە. ساڵی 47 کۆچی دوایی کردووە .ابن حجـر ، الإصابة، 482/2.

4ـ البخاري: 70- النكاح باب:10 الحديث : 2005/5،4934.

ئایەتە پیرۆزەدا ناویان هـاتووە: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا﴾الأحـزاب: 55.

ئەگەر وولاتانی رۆژئاوای بێ باوەڕ رووتی وتێکەڵاوی فەسـاد وبەد ڕەوشتی بە پێشکەوتن دادەنێن، بەڵام ئەو ڕەوشتە نامۆیانە لای باوەڕداران تـەواوی نـەزانی و نەفامی یە. موسوڵمانان بە درێژایی یەك سەدە کەوتونەتە شوێن پێی بـێ باوەڕان لەو بەد ڕەوشتیە، ئایا چیان بەدەست هێنا لە زانست وزانیاری وپێشکەوتن؟ بێجگە لە سەرشۆڕی وخۆفرۆشتن ونۆکەرایەتی ودواکەوتن وخەسارەتی ئاین ودوارۆژ.

پێشکەوتن و بـەرزی کۆمەڵگـە بـە خۆدانەپۆشـین، تێکـەڵاوی، بـەدوا کـەوتنی ئارەزووەکانی جینسی نایەتە دی، بەڵکو پێشکەوتن، پێشکەوتنی وبەرزی ئەخلاق و ڕەوشـتە، ڕاسـتی وڕاسـتگۆیی، دەسـت پـاکی وئەمانەتـە، بەخـشین وهاوکاریـە، خۆبەخشین وقوربانی دانە لە پێناوی ڕاستی، یستنی خێروخۆشـی وولاتـە، لادانـی دەستی زالم و زۆردارە، پشت گرتنی لێ قەوماوانە.

لـە سـاڵی1964 سـەرۆکی وولاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا جـون کەنـەدی ڕایگەیاند: داهاتووی وولاتەکەمان لە مەترسـی دایـە، چـونکە گـەنج ولاوەکانمـان لـە ئارەزووە جینسیەکان نوقوم بوونە، ئەو لێپرسراویەتیەی لەسـەر شـانیەتی نـاتوانێ بەتەواوی جێبـەجێی بکـات، هـەر لـە حـەوت کـەس تـەنها یـەکیان دەشـێت بکرێنـە سەربازی دڵسۆز، چونکە ئەو ئارەزووەی تیایدا نوقوم بوون هەموو لیاقەی بـەدەنی ودەروونی لێ سەندوونە.[1]

لەو بارەیەوە نووسەرێکی ئەمریکی کاتی سەردانی بۆ قاهرەی پایتـەختی میـسر لە ساڵی 1962، وتەیەکی پێشکەش کرد، لە ڕۆژنامەی کۆماری بڵاوکرایەوە لە ژێـر ناونیشانی: قەدەغەی تێکەڵاوی بکەن، سەربەستی ئافرەت سنوور دار بکەن.

---

1ــ الخباز، عدنان، مرض الإيدز، ص12.

ئەو سنوورەی كە كۆمەڵگەی عەرەبی لەسەر ئافرەتی كەم تەمەنی داناوە- مەبەستم لە خوارووی20ساڵیە-ئەو سنوورو مەرجانە چارەسەرێكی بەسوودە بۆ زۆر نەخۆشی ناو كۆمەڵگە، هەر بۆیە داواتـان لێ دەكەم كەوا دەست بەخوورەوشت و داب ونەریتی خۆتانەوە بگرن، تێكەڵاوی قەدەغە بكەنەوەو سەربەستی بێ سنوور لا بەرن، بگەڕێنەوە سەر پۆشتەیی خۆتان، چونكە ئەوە زۆر باشتر وچاكترو سوودمەنترە لە بەدڕەوشتی و بەرەڵایی ناو كۆمەڵگەی ئەمریكاو ئەوروپا. ئەو سەربەستیەی ئێمە بەخشیمان بە كچە گەنجەكانمان، وای لێ كردن ببن بە دەستەی(جیمس دین)، دەستەی خوێن ڕشتن و ماددە بێ هۆش كەرەكان، دەستەی فڕاندنی منداڵ فرۆشتنیان وەك بەندە.[1]

دكتۆر عبد اللطيف القصاب دەڵێ:(ڕۆڵی ئافرەت دایكایەتیە، لەبەر بوونی هەندێ سیفاتی تایبەت، ئافرەتان بەگشتی دەتوانن زۆر بە كارامەیی ئەو ڕۆڵە ببینن. پەروەردەی منداڵ، چ بە واتای پەروەردەیی فراوان، چ بە بەمانای تەسكی ناو خێزان، بریتیە لە پیرۆز ترین ئەرك، كە ئافرەت دەیكات، هەر وایەو هەر ئاوا دەمێنێتەوە.

لەبەر ئەوەی ئافرەت لە توانای زمانی و ڕەوانی دەربڕین، لە ناسین و هەستكردن بەو گۆڕانكاریانەی كە لە دەووبەری ڕوویداوە، پشت بەستان بە ڕێگەكانی وەسفی بۆ ئیدراكی كەل و پەل وهەڵوێست، ڕەچاوكردنی دابە نەریت و بەها كۆمەڵایەتیەكان، لەمانە گشتیان پێشكەوتووە، بۆیە زانایانی پزیشكی و دەروونناسی دان بەوە دادەنێن كەوا ئافرەت بە باشترین شێوە دەتوانێ كاری پەروەردەی منداڵ جێبەجێ بكات، چونكە منداڵ لە قوناغەكانی یەكەمی تەمەنی فێری زمان و داب و نەریتی ئەو كۆمەڵگەی كە تیایدا دەژی وچۆنیەتی هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ ئەو داب ونەریتە، دروست بوونی بیردۆزەی وەسف كردنی شتەكانی دەووبەر دەبێت، بۆ فێربوونی هەموو ئەو شتانە دایك وەك سەرپەرشتی كار، چاودێر، پەروەردەكار، مامۆستا، باشترین كەسە كە ئەم كارە بكات، بۆ ئەوەی ئەو

---

1- سيد سابق، فقه السنة، 2/217-218.

منداڵە ببێتە کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری بەسود لە کۆمەڵگە. ئەوەش گرنگترین و ترسناکترین کارە کە ئافرەت دەیگرێتە ئەستۆ، زۆر گرنگتر وپیرۆزترە لەوکارانەی کە پیاو دەیکات. لێرەوە بۆمان دیار دەکەوێت کاری ئافرەت کاری بونیادنان و دروست کردنە.[1]

ئەگەر کاری دایکایەتی وپەروەردەی منداڵ بە ئافرەت سپێردرا ئەوا واتای ئەوە ناگەیەنێ کەوا ئافرەت وەك بەند کراوی لێ بێت، هەر لەماڵ نەچێتە دەرەوە.

ئەگەر مێژووی زێرینی ئیسلام بخوێنینەوە دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان بەشداری چالاکیە جیاجیاکانی کۆمەلایەتی، ڕۆشنبیری، پەروەردە وفێرکردن، تەندروستی، سەربازیان کردووە، ڕۆلی کاریگەرو بەرچاویان بینیوە، ڕەچاوی هەموو مەرجەکانی ئەو بەشداری کردنەشیان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی دایکایەتی و پەروەردەی منداڵیان بەجوانترین شێوە جێبەجێ کردووە، ڕۆڵەی وەك: ئەمیرەکانی مەڕوانیەکان ولوڕیەکان وئەیوبیەکانیشیان پێ گەیاندووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە کتابی دانەر(المرأة الكردية و دورها في المجتمع الكردى)، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتی ناوداری کوردی تیایە لە بوارە جیاجیاکان.

موسڵمانانی سەردەمی پەیامی خودایی، سەردەمی جێنشینەکانی پێغەمبەر، سەدەکانی زێرینی ئیسلامی گەیشتنە بەرزترین لوتکەی پێشکەوتن لە بوارەکانی کۆمەلایەتی، گەشەی فیکری، ئەخلاقی، هەروەها بەڕێوەبەرایەتی نیوەی جیهانیشیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هۆشیاربوون لەوەی نەکەونە شوێن ئەو ئارەزوانەی هۆکاری توش بوونن بە گوناهو تاوان، وەك دوور کەوتنەوە لە تێکەلاوی هەرچەندە گەر لەناو شوێنی خوا پەرستی وخوێندنیش بێت.

---

1ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق، ص254.

## بەندی سێیەم: حەیاو شەرم (الحیاء)

### بڕگەی یەکەم: مانای حەیا

الحياء: تەوبەو پەشیمانی وداپۆشینە، حەیا هۆبەیەکە لە ئیمان.

ئیبن ئە ثیر دەڵێت: حەیا هۆبەیەکە لە ئیمان چونکە ئیمان فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەیە، ئەگەر بەهۆی حەیاوە ئەو دوو شتە هاتە دی ئەوا بەشێکە لە ئیمان، ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر حەیا ناکەیت هەرچی ئارەزووتە بیکە)) ((إن مما أدرك الناس من كلام النبوة إذا لم تستح فاصنع ما شئت))[1] واتە حەیای نەماوە تاوەکو ببێتە بەربەست بۆ ئەنجام نەدانی کاری خراپە. فەرموودەکەش هانی موسڵمانان دەدات کەوا بە حەیا بن، وازهێنان لە حەیای بە نا پەسەند داناوە.

حەیا: ئەو توانایەیە وا دەکات مرۆڤ نەتوانێت هەنگاو بنێ بۆ کاری خراپ وناشرین. کاری ناشرین وفاحشەش ئەو کارەیە کە ئادەمیزاد هەر لە خۆڕسکەوە ڕقی لێیەتی.[2]

### بڕگەی دووەم: حەیای ئافرەت

خوای گەورە باسی حەیای ئافرەت دەکات لە چیرۆکی کچی شعیب پیغەمبەرو موسیعليه السلام: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ القصص:25.

ئافرەتی باوەڕدار هەر لە خۆڕسکەوە شەرم وحەیا دەکات کاتێ لەگەڵ پیاوی بێگانە گفتوگۆ دەکات. کاتی بە ڕێگە ڕۆیشتندا هیچ نازو دەلال ولارولەنجەی تیا بەدی ناکرێ، ئەو مەبەستەی دەیەوێت بە ڕوونی وجوانتریت شێوە، بەبێ پێچ و پەنا، بە کورترین ڕستە دەری دەبڕێت، هەر ئەوەش لە ئافرەتی فیترە پاك وساغ دەوەشێنەوە.

1ـ البخاري 78- الأدب باب: إذا لم تستحي الرقم: 6120 ، 642/10.
و المعجم الأوسط، الطبراني، 104/5. وسير أعلام النبلاء، 102/16.
2ـ ابن منظور، لسان العرب، 429/3.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( باوەڕ شەست و هەندێك هۆبەیە، حەیاش یەكێكە لەو هۆبانە)) ((الإيمان بضع وستون شعبة، والحياء شعبة من الإيمان)).[1]

لە عیمران كوڕی حەصین ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((حەیا هەردەم خێرو چاكە دەهێنێ)) ((الحياء لا يأتي إلا بخير)).[2]

حەیا ڕەوشتێكە مرۆڤ لە كاری ناشرین دوور دەخاتەوە، وای لێ دەكات مافی هەموو خاوەن مافێك بدات، هەر بۆیە لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە: (( حەیا هەموو چاكەو خێرە)) ((الحياء خير كله))، چونكە هۆكارە بۆ چاكە كاری وبەرگریە لە خراپە كاری، جا ئەو حەیایە لەجۆری خۆڕسكی بێت یان بەدەست هێنراو. پێویستە ئەو حەیایە بكار بهێنرێ بە ڕێگەیەكی زانستیانە وگونجاو لەگەڵ شەرعی خوا تاوەكو ببێتە هۆبەیەك لە ئیمان.[3]

ئافرەت حەیا دەكات، چونكە لە خەلیقەتەوە ئەو ڕەوشتە خۆڕسكیەی بۆ دانراوە، بەڵام ئەوەی پیاو لە ئەدەبەوە وەریگرتووە بە ویستی خۆی، بۆیە بە بنەچەی ڕەوشت دادەنرێ.[4]

ئافرەت خووی (ڕاهاتووە) بەحەیاوە گرتووە لە هەموو سەردەمەكان، لەسەری بەردەوام بووەو بەرزی نرخاندوە، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە پیاو ویستوویەتی لەخشتەی ببا بۆ ئابڕو بردنی بۆ گەیشتنە ئارەزووەكانی.[5]

ئافرەتان بەگشتی داوێن پاكن، خۆیان دوورە پەرێز دەگرن لە ئارەزووە جنسیەكان، هەرچەندە لەناخی دەرونیەوە ئارەزووی بۆ پیاو دەچێت، بەڵام خوای گەورە بە دوو بەربەست وقەلا پاراستوونی، یەكیان جەستەیی یە بریتیە لە پەردەی

1ـ البخاري: 1- كتاب الإيمان 3- باب: أمور الإيمان الرقم:90، 72/1.
2ـ البخاري: 78- الأدب باب: الحياء الرقم:6117،641/10.
3ـ ابن حجر، فتح الباري بشرح صحيح البخاري، 73/1.
4ـ العقاد، عباس محمود، المرأة في القرآن، ص30-36
5ـ الباجوري، جمال محمد، المرأة في الفكر الإسلامي، 52/1.

کچێتی، دووەمیان نەفسی ودەرونیە بریتیە لە حەیاو شەرمی خۆڕسکی.[1]

هەر لەبەر حەیاو شەرمی ئافرەتە حەنەفیەکان دەڵێن: نابێت ئافرەت خۆی وەلی خۆی بێت لە مارەکردن، چونکە لەوانەیە لەبەر شەرم و حەیای خۆی ڕازی بووە.[2]

واتە حەیا خۆڕسکە، ئەوەی خوای گەورە لەناو پێکهاتەی دەرونی ئادەمیزادان خولقاندوویەتی، یان لە باوەڕەوەیە، هەر ئەوەیە لە ترسی خوا قەدەغەی ئیماندار دەکات لە کرداری خراپ.

## بەڵگەی خۆڕسکی حەیاو شەرمی ئافرەت:

1- ئەو حەیایە خۆڕسکەی ئافرەت هەر لە قۆناغی هێلکەوە دەیبینین، جوولەی زۆر هێواشە، بەم لاو بەولادا ناڕوانێ وەك سپێرم، بە ژمارەکی زۆر لە خانەی کلکدار دەورە دراوەو هێواش هێواش پاڵی دەدەن ودەیجوولێنن ولەهەمان کات پارێزگاری دەکەن تاوەکو دەگەنە شوێنی مەبەستن (ئەویش سێ یەکی کۆتایی جۆگەی هێلکەیە)، لەو شوێنە دەمێنێ لەگەڵ خزمەتکارو پارێزکارەکانی وچاوەڕوانی ئەو سپێرمەن کە خودای گەورە بۆی داناوە سەربکەوێت ولەگەڵی جووت بێت وپیتێن ڕووبدات. هەرکاتێ کە پیتێن ڕوویدا هێلکە بە چوار دەوری خۆی دیوارێکی پتەو دروست دەکات ونایەڵێت سپێرمەکانی تر نزیکی بکەونەوە کە ژمارەیان سەدێکە هەرچەندە بەتواناو بەهێزیش بن، هەر هەموویان دەمرن بەغەم وپەژارەوە. ئەگەر بە وردی سەرنجی جولەو دیمەنی هێلکە کاتی دابەزین وچاوەڕوانی کردنی هاوسەری بدەین، دەبینین مانای حەیاو شەرمی پێوە دیارە. هەروەك ئەوەیە بڵێی خوای گەورە هەر لەسەرەتاوە ئەو سیفەتەی تیادا خولقاندووە.

2- لە لێکۆلینەوەیەك کە لوریا و روبین(Lurian&Rubin) لە ساڵی 1974 کردیان بۆیان دەرکەوت کەوا نێرینە بەم سیفەتە بۆماوەییانە ناسراوە: توندو ڕەق، زبر، بەهێز، گەورە لە بارستەو کێش وڕوکاری دەرەوە. بەڵام مێینە ناسراوە بە:

---

1ـ الخشت، محمد عثمان، وليس الذكر كالأنثى، ص36.

2ـ المرغيناني،علي بن أبوبكر، الهداية شرح بداية المبتدي، 196/1.

ناسك، نەرم ونیان، هەستیار، ڕوکار ئاسوودە.[1]

3- لە دوو لێکۆڵینەوەی جیا، یەکەمیان: کە تیمی (ئەلبیرت، فیرنـون، لینـدزی) لە ساڵی 1951 ئەنجامیادا، دووەمیـان: زانـا (ئـوتزل) لـە سـاڵی 1966 ئەنجامیـدا، بۆیان دەرکەوت کەوا مێینە زیاتر پابەندە بـە دابونەریتـە کۆمەڵایەتیـەکان، گرنگـی دان بـە بنـەماو یاسـاکانی سـلوك، جـوانی وجوانکـاری ، هاوکـاری کەسـانی تـرو چاودێریان، ئـارەزووی بـەلای کۆمـەك کـردن وپێکـەوە ژیـانی کۆمەڵایەتیـە. زیـاتر بەرەو لای خۆبەدەستەوەدان وملکەچ وگوێڕایەڵی ویژدان وپشت بەستان بە کەسانی تـرە، واتـە لـە سروشـتیاندا گوێڕایـەل وملکەچـن. بـەلام نێرینـە ئـارەزووی بـەلای کاروباری ڕامیاری و بیردۆزەیـی یـە (النظریة) ، زیـاتر گرنگـی دەدات بـە دەسـەڵات وکاریگەری کردن لە کەسانی تر.[2]

4- هەندێ لە زانایانی سەردەم سەبارەت بە حەیای ئافرەت دەڵێن: پێکهاتـەی مێینە وا خولقیندراوە هاوکات لە گەڵ بـوونی ئـارەزووی جینـسی، سـیفەتی حـەیاو شەرم وخۆ داپۆشین، دوور کەوتنەو بەرگری وبەربەست ئاوێتە کراوە. ئافرەتان کەم وزۆر ئەو سیفەتەیان هەیـە، هـەروەك چـۆن لـە مێینـەی زۆربـەی گیانـدارانی تـریش هەیە، بەلام ئەو سـیفەتانە لـە مێینـەی ئـادەمیزاد زۆر زیـاترو بـەهێز تـرە، تـاوەکو گەیشتووتە ئەو پلەی بۆتە سیفەتێکی خۆڕسکی.[3]

## بڕگەی سێیەم: حەیای پیاو

پیـاو حـەیای خۆڕسـکی هەیـە، بـەلام ئـەوەی زاڵـە بریتیـە لـەو حەیایـەی لـە پەروەردەی ماڵ وکۆمەڵگەو ڕۆشنبیری وەریگرتووە. حەیا بۆ ئافرەت زۆر پێویـست ترە، جوانی و پۆشتەییەکەی زیاد دەکات.[4]

---

*1—Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P:97*

2— سیرل بیرت، کیف یعمل العقل، ص162. القصاب، عبد اللطیف الفروق، ص206.

3 — عقاد، المرأة في القرآن، ص35. والمودودي، الحجاب، ص 195.

4— عقاد، المرأة في القرآن، ص35.

ئیمامی قورتبی لە شەرحی ئەو فەرموودەیەدا دەڵێت: ئەو جۆرە حەیایەی کە ئادەمیزاد لە ژیاندا بەدەستی دەهێنێ (المكتسب) ئەوەیە هۆیەك لە ئیمان، بەلام ئەوەی حەیای خۆڕسکی هەیە ئەوا دەبێتە پاڵپشتی بۆ زیاتر بەدەست هێنانی حەیا، تا وای لێ دێت حەیای بەدەست هێنراو وەك حەیای خۆڕسکی لێ دێت.[1]

## بڕگەی چوارەم: کاریگەری ژینگە لەسەر حەیاو شەرم

پەروەردەو فێربوونی خووڕەوشت هۆکاری بوژانەوەی ئەو غەریزە خۆڕسکیە شاراوەن. ئەو دوو هۆکارە بەردەوام وەك خۆراکن بۆ گەشەی حەیاو شەرم، تا گەیاندنی بەو ئاستەی بێتە خووڕەوشتەکی پتەو لەناو ناخ ودەروونی ئەو ئادەمیزادە، بۆ هەر لایەك بیبات گوێڕایەلی دەکات.

ئەو کەسەی حەیای نەما، ئارەزووە ئاژەڵیەکانی دەیکەنە بەندەی خۆیان، تاوەکو دەگاتە ئەو ئاستەی هەر خراپەو تاوان وگوناهێك لەبەرچاوی ئەو هیچ نیە. بەردەوامی لەسەر کاری خراپەش بەهەمان شێوە سیفەتی حەیا، هەست بە شەرم کردن ناهێڵێ لەناو دەروونی مرۆڤدا.

هەرچەندە هۆکاری بایۆلۆژی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر زۆر لە سیفەتەکانی هەردوو ڕەگەز، بەلام ئاست وجۆری ڕۆشنبیری هەر کۆمەڵگەیەك کاریگەری هەیە لەسەر سیفەت وهەڵسوکەوتی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بە هەردوو ڕەگەزیەوە. هەر ئەو هۆکارەنە وای کردووە لە پیاوەکان هەندێ جۆر هەڵسوکەوت بکەن، کە ئافرەتان نەتوانن، بەپێچەوانەوەش وای کردووە ئافرەتان هەندێ جۆر هەڵسوکەوتی تایبەت بە خۆیانەوە بکەن.[2]

هەندێکی تر لە دەروونناسان دەڵێن: جیاوازی زۆر هەیە لە توانای فێربوون لە نێوان هەردوو ڕەگەز، تاکەکانی ناو هەمان ڕەگەز، دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری کۆمەلایەتی ودەوروبەر، نەوەك بۆ هۆکارە خۆڕسکیەکان.[3]

---

1ــ ابن حجر، فتح الباري بشرح صحيح البخاري، 640/10.
2ــ طلعت منصور وآخرون، أسس علم النفس العام، ص98- 99.
3ــ برنهارت، علم النفس في حياتنا العملية، ص241.

زانای بەرزی فەرەنسی ئەلیکسیس کاریل دەڵێت: ئادەمیزاد لە خۆڵی سەر زەوی دروست بووە، بەو هۆیەوە جوگرافیای ئەو وڵاتەی کەتیایدا دەژی و سروشتی ئەو گیانەوەرو ڕووەکانەی کە دەیخوات کاریگەری بەرچاوی هەیە لە سەر چالاکیە فسیولۆژی وعەقلیەکانی.[1]

لە گوتەی زانایان بۆمان بەدیار دەکەوێ کەوا ئافرەت حەیاو شەرمی شاراوەی خۆڕسکی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەوروبەرو ژینگە کاریگەری دیارو بەرچاوی هەیە لەسەر حەیا، خووڕەوشت وداب ونەریتە کومەڵایەتیەکان و ئاینیەکان. واتە بەردەوامی کاریگەری ژینگە دەبێتە هۆکار بۆ گۆڕینی تەواوی ڕەوشت وحەیاو شەرم، یان ڕاست کردنەوەی، یان دووبارە بیناکردنەوەی بە شێوەیەکی نوێ، جا بەباری چاکی بێت یان خراپی، بەگوێرەی جۆری کاریگەرەکەو شوێن وئەو کۆمەڵگەی تیایدا دەژی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((هەموو کۆرپەلەیەك کە لە دایك دەبێت لەسەر فیترەی خوا پەرستیە، بەڵام دایك وباوك دەیکەن بە جوولەکە، مەسیحی، ئاگر پەرست...)) ((ما من مولود إلا یولد علی الفطرة فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه...)) ئەو فەرموودەیەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ژینگەو دەوروبەر کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ئاین وڕەوشت و جۆری ژیان.

1ـ الیکسیس کاریل، الإنسان ذلك المجهول، ص105.

# بەشی دووەم

## خوا پەرستی

## (نوێژ، ڕۆژوو گرتن، حەجی ماڵی خوا)

باسی یەکەم: نوێژ کردن

باسی دووەم: ڕۆژوو گرتن، حەجی ماڵی خوا

**دەروازە:**

بەندایەتی وخوا پەرستی بەشێکی گرنگە لە ئیسلام، پەیوەندی نێوان بەندەو خوای خولقێنەرە، حوکمەکانی بەشێکی گرنگ لە شەریعەت پێك دەهێنن، خوا پەرستی لە هەڵسوکەوتی بەندەکانی دەردەکەوێ وەك دیاردەیەکی بەرچاو لە ژیانی رۆژانەی ئیمانداران.

ئەو دەستووری بەرنامەی خوای گەورە بۆ بەندایەتی وخوا پەرستی دایرشتووە تا رادەیەکی زۆر نەگۆرە، ناگۆرێ بە گۆرانی چۆنیەتی ژیانی خەڵك وژیانی کۆمەڵگە، بەرەو پێشەوەچوونی شارستانیەت، بە جۆری رەگەزو نەتەوە، گەر گۆرانکاریش هەبێ زۆر کەم وسادەیە، وەك گۆرانکاری لایەنەکانی رامیاری وبەرێوەبەرایەتی وتەشریعی نیە، کە بە گۆرانی چۆنیەتی ژیانی خەڵك وژیانی کۆمەڵگە، بەرەو پێشەوەچوونی شارستانیەت گۆرانکاری زۆری دێتە سەر.

ئەو جیاوازیانەی کە بەدی دەکرێت لە حوکمەکانی پەیوەست بە بەندایەتی و خواپەرستی لە نێوان ژن وپیاو، هەندێکیان بۆ ئەوەیە قورسایەتی ئەو ئەرکانە لەسەر ئافرەت سووك بکات، هەندێکیان بۆ ئەوەیە تاوەکو جوانی رازاوەیی دیار نەکەوێت کاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە، هەندێکی تریان لەبەرداپۆشینی عەورەتە، ئەوی تریان بۆ ئەوەیە تاوەکو تێکەڵاوی تەنهایی دروست نەبێت، یان هۆکارن بۆ بەربەچ ودوورخستنەوەی گومان وشەرفرۆشی فاسقەکان و لەخوا یاخی بوان. بەگشتی ئەو حوکمانە بەسوودو قازانجی ئافرەتە بۆ پاراستنی کەرامەتی، لەهەمان کات بە سوودی پیاوە بۆ دوورخستنەوەی لە هۆکارەکانی ئارەزووە بزوێنەرە دەرەکیەکان. واتە هەموو ئەو حوکمانە رەحمەت و بەزەیی خوایە بۆ بەندەکانی تاوەکو کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکان تووشی ماندووبوون و حەرەج نەبن.

# باسی یەکەم

## نوێژ کردن

بەندی یەکەم: دەست نوێژ، خۆ دا پۆشین، بانگدان، چۆنیەتی نوێژ کردن

برگەی یەکەم: دەست نوێژ

برگەی دووەم: خۆ دا پۆشینی ئافرەت لەکاتی نوێژ

برگەی سێیەم: بانگدان و بانگی هەڵسان بۆ نوێژ کردن

برگەی چوارەم: چۆنیەتی نوێژ کردن

بەندی دووەم: نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت)، نوێژی هەینی ، جەژنەکان

برگەی یەکەم: نوێژی جەماعەت

برگەی دووەم: نوێژی هەینی

برگەی سێیەم: نوێژی جەژنەکان

## باسی یەكەم: نوێژ كردن

ئیسلام بەرنامەیەكی تێروتەسەل وگشتگیری بۆ ژیان داناوە، بۆ ئەوەی مەبەستەكانی لە چوارچێوەیەكی دروست و ڕوون ببێكێ ، سێ ڕێگەی هاوڕێكی یەك بە تەنیشتەوە یەكی گرتۆتەبەر، یەكەمیان: حەرام كردنی هەموو بارە چەوتەكانی ژیان كە لە بنەما ئەخلاقیە بۆگەنەكان سەرچاوەی گرتبوو، دووەم: ڕاست كردنەوەی بارە لارەكان، توندكردنیان، پاك كردنەوەیان لە گومان، سێیەم: دارشتنی بەرنامەو فەرمانی تەشریعی نوێ بەمەبەستی دانانی چوارچێوەیەكی ڕێك وساغ بۆ كۆمەڵگەی نوێ.[1]

### بەندی یەكەم: دەست نوێژ، خۆ داپۆشین، بانگدان، چۆنیەتی نوێژ كردن

خوای گەورە لەهەندێ كاتی تایبەت– كاتی بێ نوێژی، سك پڕی، زەیستانی– هەندێ لە ئەرك وفەرمانەكانی بۆ ئافرەتان جیاكردۆتەوە وەك رەحمەتێك و چاودێری كردنی پێكهاتەی جەستەیی ودەرونی لەوكاتە ناسكانەی ژیانی ئافرەت. هەروەك دەبینین لەكاتی بێ نوێژی، منداڵبوون، زەیستانی خوای گەورە نوێژی لە ئافرەت قەدەغە كردووە كە ئەنجامی بدات، كاتی پاك بوونەوەش ئەو نوێژانە ناگێڕێتەوە, چونكە ماندوو بوون وئەزیەت و نارەحەتی تیایە.[2]

#### بڕگەی یەكەم: دەست نوێژ (الوضوء)

هەموو حوكمەكانی پەیوەست بە دەست نوێژ لە واجبات و لە سونەتەكانی یەكسانن لە هەردوو ڕەگەزدا، تەنها مەسحی سەر نابێت. حەنبەلیەكان دەڵێن: بۆ پیاوان دەبێ سەریان هەموو مەسح بكەن(استیعاب مسح كل الرأس)، بەلام بۆ ئافرەتان هەروەك ئیبن قدامە دەڵێ: تەنها دەستی تەڕ بەسەریان دادەهێنن.[3]

---

1ــ جمال محفوظ وآخرون، موسوعة الحضارة العربية الإسلامية، 3/305-306.

2ــ جمال محفوظ، موسوعة الحضارة العربية الإسلامية، ص231.

3ــ ابن القدامة، المغني، 1/127.

مالکیەکان دەڵێن: ئافرەت لە کاتی مەسحی سەر، دەستی تەڕ بەسەری دادەهێنێ، بەڵام پێویست ناکات کەزی وسەر کەزی وبسکەکانی بکاتەوە وهەمووی مەسح بکات.[1]

دەست نوێژی ئافرەتی خوێندار(المستحاضة)[2]: فاتمەی کچی جحش ﷺ خوێنی لەبەر دەچوو، هاتە لای عائیشە ﷺ پرسیاری دەربارەی ئەو خوێن لەبەر چوونە کرد، عائیشە لە پێغەمبەری ﷺ پرسیار کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەو خوێنی لە ڕەگەکانەوە بۆ دێت، بێ نوێژی نیە، ئەگەر کاتی بێ نوێژی هات نوێژەکان مەکە، گەر ماوەی بێ نوێژی تەواو بوو خۆت پاك بکەوەو نوێژی خۆت بکە)) :((ذلك عرق ولیست بالحیضة، فإذا أقبلت الحیضة فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغتسلي وصلي)).[3]

ئیبن حجری عەسقەلانی لە شەرحی ئەو فەرموودەیە دەڵێ: هەر کات ماوەی بێ نوێژیەکە تەواو بوو- هەموو ئافرەتێك بە ماوەی بێ نوێژی خۆی شارەزایە کە چەند ڕۆژە- خۆی دەشوات، پاشان هەر خوێنەکی تر هات ئەوە خوێنداریەو بێ نوێژی نیە، حوکمی ئەوەش وەك حوکمی ڕووداوی (الحدث) بچوکە، واتە دەست نوێژ دەشوات ونوێژی خۆی دەکات، بەڵام پێویستە بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژی نوێ بشواتەوە، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ثم توضئي لكل صلاة)). هەر ئەوەش گوتەی سەرجەمی(جمهور) زانایانە.

حەنەفیەکانیش دەڵێن: دەست نوێژی ئافرەتی خوێندار پەیوەستە بە کاتی هەموو نوێژەکان، بەمەرجێ کاتی نوێژەکە بەسەر نەچووبێ.[4] ((المستحاضة تتوضأ

---

1ـ الحطاب، مواهب الجلیل لشرح مختصر الخلیل، 205/1.

2ـ المستحاضة: پێناسەو باسی ئافرەتی خوێن داری بەدرێژی کراوە لە کتابی (تەنها بۆ ئافرەتان) بانەر. بە کورتی ئەو خوێنەیە کەلە دامێنی ئافرەت دێتە خوارەوە پاش تەواو بوونی ماوەی بێ نوێژی (3-8ڕۆژ) یان لە هەندێ کاتی نا ئاسایی، ڕەنگ وبۆنی خوێنەکە جیاوازە لەگەڵ خوێنی بێ نوێژی، هەربۆیە حوکمی تایبەتی خۆی هەیە لە شەرع، لە زانستی پزیشکیش جیاوازیان زۆرە.

3ـ البخاري: 6- كتاب الحیض باب: إقبال الحیض وأدباره الرقم:320 ، 544/1.

4ـ ابن حجر، فتح الباري، 409/1-410.

لوقت كل الصلاة)).[1]

بەڵام ئیبن قدامەو شەوكانی دەڵێن: ئافرەتی خوێندار دەتوانێ دوو نوێژ پێكەوە كۆ بكاتەوە، وەك: نیوەڕۆ وعەسر، ئێواران وشێوان بەیەك دەست نوێژ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ، وا فەرمانی بە فاتمەی كچی جحش وسەهلەی كچی سهل كردووە ﷺ.[2]

## بڕگەی دووەم: خۆ داپۆشینی ئافرەت لەکاتی نوێژ (ستر المرأة في الصلاة)

لە بەشی یەكەم باسی مانای عەورەت و سنووری عەورەتمان كرد لە هەردوو ڕەگەز لە كاتی نوێژو كاتەكانی تر.[3]

داپۆشینی عەورەت، واجبە، یەكێكە لە مەرجەكانی دروستی نوێژ.[4] بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیە، كە ئەبو داود لە عائشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ((نوێژی مێینەیەكی پێگەیشتوو دروست نیە بەبێ خۆ داپۆشین بە كراسێكی درێژ)) ((لا يقبل الله صلاة حائض إلا بخمار)).[5]

ئیبن قدامە دەڵێت: مەزهەبەكان بەگشتی جیاواز نین لەوەی كەوا بۆ جائزە دیاركەوتنی دەست ودەم وچاوی. بۆ دیاركەوتنی دەست، دوو ڕوایەت هەیە، یەكەمیان: نابێت داپیۆشێ، چونكە ئیبن عەباس ﷺ لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ دەڵێ: وا پێویست دەكات كەوا دەست ودەم و چاو دەربكەوێت. دووەمیان: پێویستە دیار نەكەوێت، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئافرەت

---

1ـ الكاساني، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، 2/1.

2ـ ابن قدامة، المغني، 342/1. والشوكاني، نيل الأوطار، 303/1.

3ـ بەرگی دووەم/ بەشی یەكەم/ باسی یەكەم.

4ـ الفتوحي، ابن النجار، منتهى الارادات، 60/1.

5ـ مسند الإمام أحمد، الرقم:25209 ، 150/6. النمري، يوسف عبد البر، التمهيد لابن عبد البر، 259/6.

عەورەتـە)) (( المرأة عــورة)).[1] ئیمـامی تـەرمزی دەڵـێ: فەرموودەیـەکی ڕاسـت وباشە. واتای گشتی دەبەخشێ ئەگەر بەڵگەی تایبەتمەندی نەبوو.[2]

بەڵگـەی ئەوانـەی دەڵـێن دەسـت و دەم و چـاو جـائزە دیـار بکـەوێت، دوو فەرموودەیە، یەکەمیان: عائیشە دەفەرمووێ: ئەسمای خوشکم هاتـە ماڵمـان و بـە پۆشـاکێکی تـەنك خـۆی داپۆشـیبوو، پێغەمبـەری خـوا بەرپەرچـی داوەو فەرمووی: ئەی ئەسما گەر ئافرەت گەیشتە تەمەنی بێ نوێژی بێجگە لـە دەسـت و دەم وچاوی نابێت هیچ شوێنەکی تری دیار بکەوێت. (( یا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لا يصلح أن يرى منها إلا هذا وهذا )) وأشــار إلــى وجهــه وكفيــه.[3] دووەم: لە ئەبی هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردووە لەکاتی نوێژدا پیاو دەم و چاوی داپۆشێ. هەر بۆیە زانایان بە کۆمەڵ لەگەڵ ئەوەن کەوا ئافرەت لە کاتی نوێژو ئیحرام بەستاندا دەم وچاوی بەدەرەوە بێ. واتـە گـەر لەو دووکاتە پەسەند بێ، ئەوا لە کاتەکانی تردا گونجاو تـرو ڕەواتـرە. ((نهى عــن السَدْلِ في الصلاة، وأن يغطي الرجل فاه)). (لذلك أجمعوا على أن على المــرأة أن تكشف وجهها في الصلاة والإحرام).[4]

ئیبن قودامە دەڵێ: دەم وچاو داپۆشین مەکروهـە و، ناپەسـەندە بـۆ ئافرەتـان، چـونکە بەربەسـتی بەرکـەوتنی نێوچـەوان ولووتـە بـە زەوی، حـوکمی هـەروەك دانەپۆشینی دەمە لە پیاوان.[5]

---

1ـ صحيح ابن حبان:5598، 412/12. والطبراني، المعجم الكبير: 10115، 108/10. الترمذي :1173 ، 476/3، باب: كراهية للدخول على المغيبات.

2ـ الفتوحي، منتهى الارادات، 61/1.

3ـ سنن أبي داود كتاب: اللباس باب: فيما تبدي المرأة من زينتها حديث:4104 ، 62/4.

4ـ سنن أبي داود كتاب الصلاة باب: السدل في الصلاة، حديث:643 ، 174/1. والمالكي، ابن العربي، عارضة الأحوزي بشرح صحيح الترمذي ، كتاب الصلاة ، 170/2.

5ـ ابن قدامة، المغني، 603/1. والنووي، المجموع، 185/3.

## بڕگەی سێیەم: بانگدان و بانگی هەڵسان بۆ نوێژ کردن (الأذان والإقامة)

وا سونەتە لە بانگدان دەنگ بەرز بکرێت، سەرنجی بۆ ڕابکێشێ، گوێی بۆ شل بکرێت، ئەوانە تایبەتن بە پیاوانەوە. بەڵام بۆ ئافرەتان بانگدان و بانگی هەڵسان بۆ نوێژ نیە. بەڵگەش ئەو فەرموودەی کە ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لەسەر ئافرەتان بانگدان وبانگی هەڵسان بۆ نوێژ نیە)) ((ليس على النساء أذان ولا إقامة)). [1]

کۆمەڵی ئافرەتان دەتوانن بۆ خۆیان بانگی هەڵسان بۆ نوێژ کردن بدەن تاوەکو ئامادەبوان خۆیان ئامادە بکەن، چونکە دەنگ بەرز کردنەوەی تێدا نیە. بەڵام بۆیان نیە بانگدان، چونکە دەنگ بەرزکردنەوەی تیایە کە هۆکاری فیتنەیە، بەیەکچوون ولاسایی کردنەوەی پیاوانە، کەواتە دەنگ بەرز کردنەوەش حەرامە بۆیان.[2]

## بڕگەی چوارەم: چۆنیەتی نوێژ کردن (كيفية الصلاة)

1- ئافرەت هەروەك پیاو نوێژ دەکات، بەڵام واچاکە کاتی ڕکوع، سوجدە بردن خۆی خڕ بکاتەوە، کاتی دانیشتن لە تەحیات، هەردوو پێی خاو بکات(السدل) [3] ئاراستەی بۆ لای ڕاست بکات ودایان پۆشێت، یان چوارمشتە دانیشێ. [4]

2- ئەگەر ئیمام شتێکی لەبیرچوو لە نوێژ، پیاو تەسبیح(سبحان الله) دەکات، بەڵام ئافرەتان، لەجیاتی تەسبیح بەناو لەپی دەستێکی لە پشتی دەستەکەی تری خۆی دەدات.[1]

---

1ـ سنن الكبرى للبيهقي ، 408/1.

2ـ للهيتمي، تحفة المحتاج، 251/1.

3ـ السدل:(سدلَ الشَعر والثوب: الستر، سدل يَسدِلُه ويَسدُلُه سَدْلاً وأسدَلَه: شلی کرد وماتە خوارەوە).
لسان العرب، 218/6 . وابن الأثير، النهاية في غريب الحديث، 355/2.

4ـ ابن قدامة، المغني ،403/1. والفتوحي، منتهى الارادات، 83/1.

لە ئەبو هورەیرەﷺ دەگێرنەوە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:(( تەسبیح کردن بۆ پیاوانە لێدانی دەستیش بۆ ژنانە)) ((التسبیح للرجال والتصفیق للنساء)).[2]

ئیبن حجر دەڵێ: تەسبیح قەدەغە کراوە بۆ ئافرەتان چونکە لەسەریانە دەنگ بەرز نەکەنەوە لەکاتی نوێژ بە هیچ شێوەیەك چونکە دەنگیان هۆکاری فیتنەیە، لێدانی دەست لە پیاو قەدەغە کراوە چونکە لاسایی ئافرەتانە. [3]

3- کاتێ ئافرەتان لەگەڵ پیاوان نوێژ دەکەن پێویستە لە ریزی دواوەی پیاوان بن، گەر لە ریزی پیاوان بوون ناپەسەندەو مەکروهە بەڵام نوێژیان بەتاڵ نابێت.[4]

## بەندی دووەم: نوێژی بە کۆمەڵ، نوێژی هەینی، جەژنەکان (صلاة الجماعة، الجمعة والعیدین)

### برگەی یەکەم: نوێژی بە کۆمەڵ (صلاة الجماعة)

1- بۆ ئافرەتان جائزە لە ماڵ دەرچێت بۆ ئامادەبوونی نوێژی جەماعەت لەگەڵ پیاوان. لە عمرەی کچی عبد الرحمنﷺ دەگێرنەوە، کە عائشە فەرموویەتی:((پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بەیانی دەکرد، کاتێ ئافرەتەکان دەهاتنە دەرەوە داپۆشرابوون بە چارۆگەکانیانەوە، لەبەر تاریکی بەیانیش هەر نەدەناسرانەوە)) )):(( إن رسول الله لیصلّي الصبح، فینصرف النساء متلفعات بمروطهن[5]، ما یعرفن من الغلس)). [1]

---

1ــ ابن قدامة، المغني، 15/2. والفتوحي، منتهى الارادات، 86/1.

2ــ مسند للشافعي، محمد بن إدریس، مسند الشافعي، ص49. ومسند أبي یعلى، الرقم: 5955، 364/10.

3ــ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري بشرح صحیح البخاري ،77/3.

4ــ ابن قدامة، المغني، 150/2. والفتوحي، منتهى الارادات، 116/1.

5ــ المتلفعات بمروطهن: خۆیان پێچاوەتەوە بە چارۆگەکانیان.ابن الأثیر نهایة غریب الأثر،261/4.

2- چاکترە بۆ ئافرەت لەماڵ نوێژ بکات.

لە ئیبن مەسعودەوە دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (( ئافرەت هەموو بەدەنی عەورەتە، گەر لەماڵ دەرچوو شەیتان لە پێشوازیدایە، نزیکترین کاتی لە خوا ئەو کاتەیە کە لە ماڵەوەیە)) ((المرأة عورة إذا خرجت استشرفها الشيطان، و أقرب ما تكون من الله ما كانت في بيتها)).[2]

لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((نوێژی ئافرەت لە ژوورەکەی خێرترە لە نوێژەکەی لە حوجرەکەیدا، لە حوجرەکەیدا خێرترە لەماڵەکەیدا، لەماڵەکەیدا خێرترە لە مزگەوت)) ((لأن تصلي المرأة في بيتها خير من أن تصلي في حجرتها، ولأن تصلي في حجرتها، خير لها من أن تصلي في الدار، ولأن تصلي في الدار خير لها من أن تصلي في المسجد)).[3]

3- چوونە مزگەوت ڕێگەی پێدراوە بۆ ئافرەت، بەلام گەر ترسی فیتنەی تیابوو بە هۆی دیارکەوتنی لەناو خەڵك دەبێتە مەکروه، لەو کاتەدا خێرترە لە ماڵ نوێژ بکات.[4]

ئیمامی نەوەوی دەڵێت: زانایان چوونە دەرەوەی ئافرەتیان بۆ مزگەوت بە چەند مەرجێك بەستووە: بۆنی لە خۆی نەدابێ، دەنگی خڵخاڵ وخشڵەکانی نەیەت، کەس گوێی لە دەنگی نەبێت، پۆشاکی گران بەها نەبێت، تێکەڵاوی پیاو نەبێت، گەنج نەبێت ببێتە هۆکاری فیتنە، لە ڕێگەی چوونە مزگەوت ترسی ئەوەی نەبێت تووشی فەساد بێت.[5]

---

1ـ البخاري 16- صفة الصلاة باب:79 الحديث: 839، 296/1. وسنن الكبرى للبيهقي، 132/3.

2ـ عارضة الأحوزي، بشرح صحيح الترمذي: كتاب الرضاع، 337/4. وصحيح ابن خزيمة:1685، 93/3.

3ـ الحديث: سنن أبي داود كتاب:الصلاة، باب: خروج النساء إلى المسجد، 227/2. ومسند أحمد ،371/6.

4ـ ابن قدامة، المغني، 242/2. والفتوحي، منتهى الارادات، 110/1.

5ـ صحيح مسلم بشرح النووي، بيروت، دار إحياء التراث العربي،6 مجلد، ط2 ،1974م، 161/4.

پێویستە لەسەر ئافرەت هەتا دەتوانێ نەچێتە دەرەوە، چونکە گەر بتوانێ خۆی بپارێزێ و لەخۆی ئەمین بێت، ئەوا ناتوانێ بڕیار بدات خەڵك لە فیتنەی ئەو پارێزراون. ئەگەر چووە دەرەوە با لەسەر شێوەیەکی جوان نەبێت، ڕێگەی چۆل بگرێتە بەر وله تەنیشتە ڕێگە بڕوات، نەچێتە ناو کوچەو کۆڵان وبازار، هەوڵ بدات دەنگی دەرنەچێ.[1]

عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ: ((ئەوەی ئێمە ئێستا دەیبینین، گەر پێغەمبەری خوا بیدیایە ئەوا قەدەغەی دەکردن بێنە مزگەوتەکان، هەروەك چۆن ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل قەدەغەکران)) ((لو أدرك رسول الله ﷺ ما أحدث النساء ما نرى لمنعهن، كما مُنِعَت نساء بني إسرائيل)).[2]

4- ئەگەر ئافرەتان کۆمەڵ بوون، چاکتر وایە بۆیان یەکێکیان پێش نوێژیان بۆ بکات، لە ناوەندیان بوەستێت.[3] بە بەڵگەی ئەوەی عائشە رضي الله عنها بەنەرمی بانگی دەداو، بانگی هەڵسانی بۆ نوێژی بۆ دەکردن، لەناوەندیان دەوەستاو پێش نوێژی بۆ دەکردن. ((أنها كانت تؤذن وتقيم، وتؤم النساء وتقوم وسطهن)).[4]

## بڕگەی دووەم: نوێژی هەینی (صلاة الجمعة)

نوێژی هەینی لەسەر ئافرەتان واجب نیە، گەر چووە نوێژ، ئەوا نوێژەکەی دروستە. زانایان هەموویان کۆن لەسەر ئەوەی کە ئافرەت نوێژی هەینی بە کۆمەڵ لەسەر واجب نیە، هەروەك ئیبن منذر دەڵێت.[5]

---

1ـ الهيثمي، تحفة المحتاج، 390/1. وابن الجوزي، أحكام النساء، ص209.
2ـ البخاري: 10-كتاب الأذان 163- باب انتظار الناس قيام الإمام العالم، الرقم:869، 451/2.
3ـ ابن قدامة، المغني، 428/1. والفتوحي، منتهى الارادات، 115/1.
4ـ الصنعاني، أبو بكر، مصنف عبد الرزاق، 140/3. المستدرك للحاكم، 204/1. وسنن الكبرى للبيهقي، 408/1.
5ـ ابن قدامة، المغني، 250/2 - 253.

## بڕگەی سێیەم: نوێژی جەژنەکان (صلاة العیدین)

لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کەوا ئافرەتان ئامادەی نوێـژی جەژنەکان بن، هەروەك لـە ئـوم عطیـــة ﵂ دەگێڕنـەوە[1] (( پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی کـرد لـە نوێـژەکانی جـەژن بـە هاتنـە دەرەوەی هـەموو ئافرەتـان ئـازادو بەندەکان وبە نوێژو بێ نوێژ، بێ نوێـژەکان نوێـژی جـەژن ناکـەن، بـەڵام بەشـداری دوعاو پاڕانەوە دەبن، خێریان بۆ دەنوسرێ، ئەوەی چارۆگەو سەرپۆشی نـەبوو لـە خوشکی موسڵمانی بە ئەمانەت وەردەگرێت)) ((أمر رسول الله ﷺ في يوم العيد أن تخرج العواتق وذوات الخدور والحيض، فيعتزلن المصلى، ويشهدن الخير ودعـــوة المسلمين، فقالت امرأة من المسلمين، وإحداهن لا يكون لها جلباب، قـــال: لتلبـــسها أختها من جلبابها)).[2] هەروەك ڕوونمـان کـردەوە کـە چـوونە دەرەوەی ئـافرەت بـۆ نوێژ دروستە، گەر ترسی فیتنە هاتنە پێشەوە بۆ خۆی، یان بۆ خەڵکی تر، ئەوا نە چوونە دەرەوە باشترە چونکە پـەروەردەی ئافرەتـان وپیـاوانی سـەردەمی یەکـەم وەك ئەوانەی سەردەمی ئێستا نەبوون.[3]

دەربارەی بۆن خۆش کردنی ئافرەت کاتی چـوونە دەرەوە بـۆ نوێـژو کاتـەکانی تر، لە بەش وباسەکانی داهاتوو بە درێژی باسی دەکەین.

ئەو مەرجانەی لەسەر ئافرەت دانـراون کـاتی چـوونە دەرەوە، لەبـەر ئـەوە نیـە ئیسلام بە چـاوێکی سـووك و بـێ متمانـەیی تەماشـای ئـافرەت دەکـات، بـەڵکو بـۆ پاراستی خودی ئافرەت وکۆمەڵگەیە لە فیتنەو فەساد کە هۆکـاری سـەرەکی گـشت کێشە کۆمەلایەتیەکانە.

---

1ـــ أم عطية:نوسەیبەی کچی کەعبی مازنی ئەنـصاریە، هـاوەڵێکی بـەرز وئـازابووە، بەیعـەی عەقەبـەو ئوحدو حودەیبیبەی دیووە، لە ئوحد ئازایەتی زۆری نواندو لەگەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ مـاوە تـاوەکو کۆتـایی شەرەکە، لە شەڕی یەمامە دەستێکی قرتا. الإصابة: 418/4، الرقم ، 1056. وكحالة، أعلام النساء، 151/5.

2ـــ البخاري 13-العيدين 15- باب خروج النساء والحيض إلى المصلى حديث: 974 ، 463/2. ومسلم 7- كتاب صلاة العيدين 1- باب ذكر إباحة خروج النساء فـــي العيـــدين إلـــى المصلى، 606/2.

3ـــ ابن الجوزي، أحكام النساء ، ص207.

# باسی دووەم

## ڕۆژو گرتن، حەجی ماڵی خوا

بەندی یەکەم: ڕۆژو گرتن

بەندی دووەم: حەجی ماڵی خوا

بڕگەی دووەم: مۆڵەتی هاوسەر

بڕگەی یەکەم: مەرجەکانی حەج کردن کە جیاوازن لە نێوان ئافرەت و پیاوان

بڕگەی سێیەم: ئافرەتەکە لە عیدەی تەلاق، یان مردنی هاوسەرەکەی نەبێ

بڕگەی چوارەم: داپۆشینی دەم وچاو وسەر

بڕگەی پێنجەم: دانەماڵینی پۆشاکی دورواو

بڕگەی شەشەم: تەلبیە کردن

بڕگەی حەوتەم: تەوافی ماڵئاوایی

بڕگەی هەشتەم: نزیک بوونەوە لە ماڵی خوا

بڕگەی نۆیەم: ئافرەت وهەروەلەی تەواف

بڕگەی دەیەم: دەرخستنی شانی ڕاست

بڕگەی یانزەهەم: سەرکەوتنی سەر صەفاو مەروە

بڕگەی دوانزەهەم: کورت کردنەوەی قژی سەر

## باسی دووەم: ڕۆژو گرتن وحەجی ماڵی خوا

### بەندی یەکەم: ڕۆژو گرتن (الصوم)

گرنگترین ئەو جیاوازیانەی بەدی دەکرێت لەحوکمەکانی ڕۆژوو لەنێوان ئافرەت و پیاو، ئەوەیە: کەوا واجبە ئافرەت لە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو نەبێت کاتی کەوتە بێ نوێژی، منداڵبوون وماوەی زەیستانی. هەروەها جائزە لە کاتی سک پڕی وشیر پیدان بە ڕۆژوو نەبێت، گەر ڕۆژووەکە کاریگەری سەلبی هەبوو لەسەر تەندروستی خۆی یان منداڵەکەی، بەڵام پێویستە ئەو ڕۆژووانە هەمووی بگرێتەوە لە کاتەکانی تردا، چونکە ماندوو بوونی زۆری تیا نیە ئەو گێرانەوەیە وەك لە گێرانەوەی نوێژەکان بەدی دەکرێت.[1]

بێ نوێژ و زەیستان پاش پاك بوونەوە، لەسەریان واجبە ڕۆژووەکان بگرنەوە.[2]

سک پڕو شیردەری منداڵ، ئەگەر ئافرەتەکە لە ژیانی خۆی ترسا ئەوا تەنها ڕۆژووەکە دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر لە ژیانی منداڵەکەی ترسا بەوەی نەوەك تووشی لەبارچوون بێ، یان بەهۆی کەم بوونەوەی شیر منداڵەکەی تووشی زیان بێت، ئەوا ڕۆژووەکەی دەگرێتەوەو خۆراکی هەژارێك دەبێت بدات بۆ هەر ڕۆژێك.[3]

ئیمامی تەبەری دەڵێ: ئافرەت گەر ترسا لە ژیانی ئەوەی لە سکیەتی، ئافرەتی شیردەر گەر ترسا لە منداڵەکەی، ئەوانە لەسەریانە خۆراکی هەژارێك بۆ هەر ڕۆژێك.[4]

ئافرەت دەتوانێ ڕۆژووەکان بگرێتەوە بە جیا، دەتوانێ دوای بخات بۆ پێش ڕەمەزانی ساڵی داهاتوو. هەروەك عائشە ﷺ فەرموویەتی: (( ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر بوو، نەم توانی بیگرمەوە، ئەوا دوام دەخست بۆ مانگی

---

1ــ ابن الجوزي، أحكام النساء، ص231.
2ــ النووي، سراج الوهاج، ص143.
3ــ الهيتمي، تحفة المحتاج ،717/1. وابن قدامة، المغني، 3/149-150.
4ــ الطبري، جامع البيان ، 2/184-185.

شەعبان)).[1]

ئیبن قدامە لە(المغنی) دەڵێت: دەتوانێ ڕەمەزان بە جیا وتاك بگرێت بەڵام لە دوای یەکتر باشترە.[2]

بۆ ئافرەت نیە ڕۆژووی خۆبەخشی بگرێت بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەکەی. هەروەك ئەبو هورەیرە‌ﷺ لەپێغەمبەری خوا ﷺدەگێڕێتەوە: ((بۆ ئافرەت نیە ڕۆژووی خۆبەخش بەبێ مۆڵەتی هاوسەری)) ((لا تصوم المرأة وزوجها حاضر إلا بإذنه)).[3]

## بەندی دووەم: حەجیماڵی خوا (الحج)

حەج یەکێکە لە کۆڵەگەکانی ئیسلام، لە سەر ئافرەتی ئازاد، پێگەیشتوو، هۆشدار، توانای ماددی وواتایی هەبێت، یەکێکی مەحرەمی لەگەڵ بێت، ئەوا حەج واجبە. هەرچەندە زانایان لە سەر بوونی مەحرەم جیاوازن. حەج گرنگی تایبەتی هەیە لە ژیانی ئافرەت چونکە لە شوێنی جیهادو تێکۆشانە.

عائیشەی کچی طلحە‌ ، لە عائشەی‌ دایکی موسڵمانان دەگێڕێتەوە، ووتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺلەگەڵ ئێوە دەرنەچین بۆ جیهاد، فەرمووی: ((نەخێر، جیهادی ئێوە حەجێکی بەبەرکەتە)) ((لا جهادکنّ الحج المبرور، هو لکُنّ جهاد)).[4]

---

1ـ الترمذي، کتاب الصیام باب: ما جاء في تأخیر قضاء رمضان، 486/3. ومصنف عبد الرزاق، باب: تأخیر قضاء رمضان، الرقم:7676، 245/4. وسنن الکبری للبیهقي، الرقم: 8212 ، 292/4.

2ـ ابن قدامة، المغني ،158/3.

3ـ البخاري کتاب النکاح باب: صوم المرأة بإذن زوجها تطوعاً،293/9. وسنن ابن ماجە:1760، 560/1.

4ـ البخاري: 56- کتاب الجهاد والسیر 62- باب: جهاد النساء الرقم:2876، 92/6.

## بڕگەی یەکەم: مەرجەکانی حەج کردن کە جیاوازن لە نێوان ئافرەت و پیاوان

### بڕگەی یەکەم: مەرجی توانایی، کە بریتییە لە مەحرەم و هۆکاری سەفەر (الراحلة والمحرم)

**یەکەم: مەزهەبی شافعی**

1- بوونی هۆکاری سەفەر یەکێکە لە مەرجەکانی توانای چوونە حەج بۆ ئافرەتان، جا سەفەرەکە دوور بێت یان نزیک، خێمەك هەڵدات لە سەر وڵاخەکە تاوەك لە سەرماو گەرما بیپارێزێ.

2- مەرجی بوونی هاوسەر، مەحرەم، ئافرەتانێك جێگەی متمانە بن، دوان یان زیاتر. لە کاتی بوونی ئاسایشی تەواو لە ناوچەکە دەتوانێ بەتەنها سەفەری حەجی فەرز بکات. بەڵام بۆ حەجی خۆبەخش، ناتوانێ سەفەر بکات لەگەڵ کۆمەڵی ئافرەتان هەرچەندە ژمارەیان زۆریش بێت.[1]

**دووەم: مەزهەبی مالکی**

1- دەبێت کاروباری سەفەری بۆ ئاسان کرابێت گەر ماوەکە درێژ بوو، ماوەی درێژ مەبەستمان ئەو ماوەیە نیە کە نوێژی تیادا کورت دەکرێتەوە، بەڵکو ئەو ماوەیەیە کە ئافرەت تیایدا ماندوو دەبێت، ئەوەش لەئافرەتێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ. مەرجە تیایدا بتوانێ خۆی داپۆشێ و خۆی بپارێزێت.

2- مەرجی بوونی هاوسەر، مەحرەم، ئافرەتانێك جێگەی متمانە بن. ئەگەر ئەمانە نەبوون ئەوا حەجی لەسەر واجب نیە.[2]

---

1ـ الشافعي، محمد بن إدريس، الأم، 117/2. والشربيني، مغني المحتاج، 467/1. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 636/1-637.

2ـ الشرح الصغير للدرديري وحاشية الصاوي، 263/1. الجزيري، الفقه على المذاهب، 634/1-635.

**سێیەم: مەزهەبی حەنەفی**

توانایی بریتیە لە پەیدا کردنی خۆراک، هۆکاری گواستنەوە(وولاخی سواری)، لەگەڵ مەحرەم، جا گەر ئافرەتەکە پیر بێ یان گەنج، ماوەکەش لە سێ ڕۆژ زیاتر بێ، بەڵام ئەگەر ماوەکە کەمتر بوو ئەوا حەجی لەسەر واجبە بەبێ مەحرەم. مەرجێکی تریان ئەوەیە نابێت ئافرەتەکە لە کاتی عیدّە بێت، جا چ عیدّە تەڵاق یان مردنی هاوسەر.[1]

**چوارەم: مەزهەبی حەنبەلی**

بوونی هۆکاری سەفەر یەکێکە لە مەرجەکانی توانای چوونە حەجە بۆ ئافرەتان، لەگەڵ مەرجی بوونی هاوسەر، مەحرەم، گەر نەبوو حەجی لەسەر واجب نیە.[2]

ئیبن قدامە دەڵێ: هەندێك لە زانایانی مەزهەبی ئیمە، لە ئیمام ئەحمەد دەگێڕنەوە، کە بوونی مەحرەم مەرج نیە، ئەوەش گوتەی ئیبن سیرینە.[3]

**بەڵگەی ئەوانەی مەرجی مەحرەمیان هەیە لەگەڵ ئافرەتدا بۆ حەج:**[4]

لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( بۆ هیچ ئافرەتێك نیە کە ئیمانی بەخواو ڕۆژی دوایی بێت، یەك شەوو یەك ڕۆژ بەبێ مەحرەم لە خانەوادەی خۆی سەفەر بکات)) ((لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر، أن تسافر يوماً وليلة إلا مع ذي محرم من أهلها)).[5]

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بۆ هیچ ئافرەتێك نیە کە ئیمانی بەخواو ڕۆژی دوایی بێت، سەفەر بکات سێ ڕۆژ

---

1ـ الكاساني بدائع الصنائع،123/2.والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 633/1-634.

2 ـ ابن قدامة، المغني، 236/3-237. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة،635/1.

3ـ ابن قدامة، المغني، 229/3.

4ـ المحرم: ماناى: هاوسەر، یان ئەوەی حەرام هەتا هەتایە لەپشتەوە وەك باوك، یان لە ڕێگەی شیر خواردنەوە وەك برای شیری، یان لە ڕێگەی ژن خوازی وەك باوکی مێردو کوڕی مێرد. ابـن منظور،لسان العرب،139/3. والفيروزآبادي ، قاموس المحيط 96/4.

5ـ البخاري: 18-كتاب تقصير الصلاة باب:كم يقصر الصلاة الرقم:1088، 730/2.

وبەسەرەوە، مەگەر لەگەڵ باوکی، کوڕی، هاوسەری، برای، مەحرەمی بێت)) :(( لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر سفراً يكون ثلاثة أيـــام فـــصاعداً إلا ومعها أبوها أو ابنها أو زوجها أو أخوها أو ذو محرم منها)).[1]

**بەڵگەی ئەوانەی مەرجی مەحرەمیان نیە لەگەڵ ئافرەتدا بۆ حەج:**

بەڵگەیان ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری دەگێڕێتـەوە، عومـەری کـوڕی خـەتاب ﷺ مۆڵەتی خێزانەکانی پێغەمبەری ﷺ دا کە بچنە حەج، عوسمان کوڕی عـەفان ﷺ[2] و عبـد الـرحمن کـوڕی عـەوفی ﷺ[3] لەگـەڵ نـاردن هەرسـێکیان لەسـەر ئـەو کـارە پێکهاتن، هیچ کەسێکیش لە هاوەڵان ئەو کارەیان بە نـا پەسـەند دانـەنا. هـەروەها ئەو فەرموودەی کە عودەی کوڕی حاتەم ﷺ دەیگێڕێتەوە: ((زۆری نەماوە بگەینـە ئەو سەردەمەی کە کەژاوەی ئافرەت لە حیرەوە بەڕێ دەکەوێت بۆ ماڵی خوا بـەبێ پاسەوان)) ((يوشك أن تخرج الضعينة من الحيرة بغير جوار أحد حتى تحج البيت، ويوشك أن يفيض المال حتى)).[4]

ئەوە تەنها مانای ئەوە نیـە ئـەو دیاردەیـە ڕوو دەدات، بـەڵکو بەڵگەشـە لەسـەر جائز بوون، چونکە هەواڵێکە بۆ مەدح، بەرزی ئاڵای ئیسلام. ئەوەشـە ڕای راجـح و پەسەند کە ماندوویەتی کەم دەکاتەوە، کار ئاسانی دەکات، پێغەمبـەریش هـەر بـۆ ئاسان کاری هاتووە.[5]

---

1ــ البخاري 18- تقصير الصلاة باب:4 الحديث:1086، 730/2. وصحيح مـسلم، كتـاب الحج، 108/9.

2ــ عثمان بن عفان: قورەیشی ئەمەویە، سێیەم خەلیفـەی ڕاشـدین بووە لـە 23-35 ك، هـەر لـە زووەوە موسوڵمان بوو، جیهادی کردوە بەماڵ وگیانی، دوو کچی پێغەمبەری ﷺ هێناوە روقیەو ئوم كلثـــوم، قورئانی کۆ کردەوە، چاکەکانی زۆر زۆرن، مەلائیکەت شەرمیان لێ دەکرد، لەماڵی خۆی شەهید کرا ساڵی 35ك. الذهبي،أعلام النبلاء، 122/2، 220/2.

3 ـ عبد الرحمن بن عوف: ئەبو موحەمەدی زوهریە، یەکێکە لـەو دە کەسـەی مـوژدەی بەهەشتیان پێدرا لە دونیادا، لە دوای ساڵی فیل بە 20 ساڵ لە دایك بووە، زۆر زوو موسوڵمان بوو، هەردوو هیجرەی کردووە، هەموو غەزوەکانی دیووە، بەرگری لە ئیسلام کردووە بە گیانی و ماڵی، چاکەکانی زۆرن، پێشتر نـاوی عەبدی کەعبە بووە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی گۆڕی بە عەبدولرەحمان. لە سـاڵی 32ك کۆچی دوایـی کردووە. ابـــن حجر، تهذيب التهذيب، 244/6. والزركلي، الأعلام، 95/4.

4ــ سنن دار القطني، الرقم:27 ، 221/2.

5ـــ العسقلاني، فتح الباري بشرح البخاري، 72/4.

دکتۆر یوسف القرضاوي لە کتێبی(فتـاوى معاصـرة)دا دەڵێت: لە بڕیاری بنچینەی شەریعەت وایە کە ئافرەت بەبێ مەحرەم سەفەر نەکا، بنچینەی ئەو بڕیارەش مانای ئەوە نیە گومانی خراپمان بە ئافرەتە، هەروەك هەندێ لە دڵ پیسەکان دەڵێن، بەڵکو وەسیلەیەکی پاراستنە بۆ سومعە. ئەگەر مەحرەمی نەبێت، بەڵام هەندێ پیاوی دەست پاك، هەندێ ئافرەتی جێگەی متمانە، ڕێگەکە ئاسایی و ئەمین بوو، هیچ بەرگریەك نیە بۆ سەفەری، بەتایبەتی سەفەری سەردەمی ئێستامان جیاوازە لەگەڵ سەدەکانی ڕابوردوو کە پڕ بوون لە ترس وماندوو بوون، بەڵام ئەوەی ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکە بە تایبەتی لەناو فڕۆکە، پاپۆڕی گەورە، سەیارەی تایبەتی هاتوچوون [1].

بەڕای من هۆکارو حیکمەتی بوونی مەحرەم، وەسیلەی سەفەر بۆ ئافرەت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانەی خوارەوە:

1- ئەگەر سەرنجی قۆناغی هاتنە خوارەوەی هێلکە بدەین دەبینین جوولەی بە هۆی کرژبونی ماسولکەکانی جۆگەی هێلکەیەو، ئەو شلەیەی کە لەناو جۆگەکەدا هەیە دەورە دراوە بە ژمارەیەکی زۆر لە خانەی پارێزەر، کە ئەم خانانە پارێزەرو ڕێگە ئاسانکارن بۆی تاوەکو دەگاتە شوێنی مەبەست. هەر بۆیە لە ژیانی دونیادا، هەمان ئاسانکاری و هاوکاری وپارێزگاری پێویستە.

2- ئافرەت هەر لەخۆڕسکەوە بەنازە، ماسولکەکانی تاڕاددەیەك ناسك و نەرم و بێ هێزە، بەرز بوون و نزم بوونی ئاست وڕێژەی هۆرمۆنەکانی زۆرە، واتە بڕی هۆرمۆنەکانی لە هەموو کاتدا وەك یەك نیە. هەر بۆیە توانای بەرگە گرتنی ئەرك و ماندوو بوونەکانی سەفەری نیە وەك پیاو، بۆیە ژمارەیەك لە ئاسانکاری پێویستە. ئەگەر ئەو ئاسانکاریانەی بۆ نەکرێت ئەوا زیانی زۆر زیاترە لە سوودو قازانجەکانی، یەکێك لە بنەما فقهیەکانیش دەڵێت: (لابردنی زیانەکان لە پێشەوەی بەدەست

1ـ ابن الجوزي، أحكام النساء، ص251 في الحاشية. نقلاً عن كتـاب فتـاوى المعاصـرة ليوسف القرضاوي، ص305-308

هێنانی سوودەكانە) (دفع المضار مقدم علی جلب المنافع).[1] ئەگەر سەرنجی نێرینە بدەین هەر لە قۆناغی سپێرمەوە دەبینین، كە ماوەیەكی دوور ودرێژ دەبڕێت بەتەنهایی، لەهەمان كات لەو ماوەیەدا بەربەرەكانی وململانێ دەكات بۆ گەیشتنە ئامانج، پێویستی بە هاوكاری كەس نیە، هەروەها لە ژیانی دونیاشدا بە هەمان شێوە، بارستی ماسولكەی زۆرە، بەهێز ترە، ئاست وبڕی هۆرمۆنەكانی تا رادەیەكی زۆر نەگۆڕە بەتایبەتی هۆرمونی تیستۆستیرون.

3- ئافرەتان زۆر تووشی گۆڕانكاری فسیۆلۆژی خۆنەویست دەبن وەك بێ نوێژی، سك پڕی ولەبارچوون، منداڵبوون و زەیستانی. هەریەكێك لەو كردارە فسیۆلۆژیانە ژمارەیەك لە گۆڕانكاری جەستەیی ودەرونی تیا ڕوودەدات، هاوكات لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لە نیشانەی بێ هێزی ونەخۆشی، وا لەو ئافرەتە دەكات لە بارێكی تەندروستی نا هاوسەنگ بێت.[2] هەر بۆیە لەوكاتانەدا زۆر پێویستی بەوەیە یەكێكی نزیك لەخۆی هاوكاری بكات بۆ دابین كردنی پێویستیەكانی ژیانی ڕۆژانەی. فەرمانی بوونی مەحرەم ودابین كردنی وولاخی سەفەر بۆ ئافرەت، یەكێكن لە بەزەیی وڕەحمەتییە خوایەكان لە نێوان ڕەحمەتە زۆرەكانی خوای گەورەوە كە بە ئافرەتی بەخشیوە، مەگەر خۆی ئینكاری لێ بكات. هەروەها بەڵگەشە لەسەر ئەوەی خوای گەورە ئاگاداری كەم وكورتی وپێویستیەكانی هەموو كەسێكە، موراعات وچاودێری باری جەستەیی، دەرونی، تەندروستی، كۆمەڵایەتی هەموو تاكێكی كۆمەڵ دەكات.

پوختەی باسەكە: لە كۆتاییدا بۆمان دیار دەكەوێت كەوا بوونی مەحرەم و هۆكاری سەفەرو گواستنەوە پێویستن بۆ ئافرەت، چونكە چاكترو باشترە لە ڕووی دەرونی بۆ ئافرەت، پاكترو وبێ گومان ترە لە ڕووی كۆمەڵایەتی، پاڵپشت و هێزە

---

1ــــ خلاف،عبد الوهاب ، علم أصول الفقه، ص235.

2ــــ بۆ زانینی زانیاری زیاتر لە سەر ئەو گۆڕانكاریە فسیۆلۆژیانەی لە ئافرەتدا ڕوودەدات لە كاتی بێ نوێژی وسك پڕی ومنداڵبوون وزەیستانی بڕوانە كتابی (تەنها بۆ ئافرەتان) دانەر.

لە ڕووی جەستەیی. هەر ئەوانەن وا دەکەن هەموو کارێکی نالەبارو سەخلەت لە ئافرەتەکە دوور بخەنەوە.

## بڕگەی دووەم: مۆڵەتی هاوسەر (إذن الزوج)

1- مەزهەبی شافعی: ئافرەت ناتوانێ حەجی خۆبەخش(التطـوع) بکات بەبێ مۆڵـەتی هاوسـەری، هـەروەها نـاتوانێ حـەجی واجبـیش ئـەنجام بـدات بـە ڕای زۆربەیان.[1]

2- مەزهەبی حەنەفیەکان: دەتوانێ لەگەڵ مەحرەم سەفەری حەجی فەرز بکات بەبێ مۆڵەتی هاوسەری، بەمەرجی بوونی خـۆراك وهۆکـاری گواسـتنەوە. بـەڵام بـۆ حەجی خۆبەخش ناتوانێ بێ مۆڵەتی هاوسەری.[2]

3- مەزهەبی حەنبەلیەکان: ڕایان هەروەك ڕای حەنەفیەکانە، پێویستە ئـافرەت مۆڵەت لە هاوسەری وەرگرێ، ئەگەر ڕێگەیدا ئـەوا باشـە، ئەگـەر ڕێگـەی نـەدا ئـەوا لەگەڵ بوونی مەحرەم بەبێ مۆڵەت سەفەری حەجی فەرز دەکات.[3]

4- مەزهەبی ظاهریەکان: پێویستە پیاو خێزانی خۆی ببا بۆ حەجی فەرز، گـەر وای نەکرد تاوانبارە، لەوکاتە خۆی حەجی فەرز دەکات بەبێ مۆڵەتی ئەو، بۆی نیە قەدەغەی بکات. بەڵام بۆ حەجی خۆبەخش پێویستی بە مۆڵەت هەیە.[4]

## بڕگەی سێیەم: ئافرەتەکە لە عیدەی تەلاق، یان مردنـی هاوسـەرەکەی نـەبێ زانایان لەو بارەوە ڕای جیاوازیان هەیە:

1- ڕای حەنەفیەکان: نابێت بۆ سەفەری حەج بچێت لە هەردوو باردا.[5]

---

1ـــ الشربيني، مغني المحتاج، 468/1.

2ـــ الكاساني، بدائع الصنائع، 124/2.

3ـــ ابن قدامة، المغني ، 240/3.

4ـــ ابن حزم الظاهري، المحلى، 47/7.

5ـ الكاساني، بدائع الصنائع، 124/2. والدر المختار ورد المختـار،465/2. و الجزيـري، الفقه على المذاهب الأربعة، 634/1.

2- ڕای حەنبەلیەكان: نابێت بۆ سەفەری حەج بچێت لە عیدەی مردنی هاوسەر، چونكە مانەوە لە ماڵ واجبە لە عیدەی مردنی هاوسەر. دەتوانێ لە عیدەی تەڵاقی بائن بچێت بۆ حەج.[1]

## بڕگەی چوارەم: داپۆشینی دەم وچاو وسەر

زانایان لەو بارەوە ڕای جیاوازیان هەیە:

1- ڕای شافعی وحەنەفیەكان: ئافرەت دەتوانێ دەست، دەم وچاوی داپۆشێ بەمەبەستی پەنهانی لە بێگانەكان، بەمەرجێ ئەو سەرپۆشە بەر دەم وچاوی نەكەوێ.[2]

2- ڕای مالكیەكان: ئافرەت دەتوانێ دەم وچاوی داپۆشێ بەمەبەستی پەنهانی لە بێگانەكان، كاتێ هەستی كرد هەندێ كەس تەماشای دەكەن، ئەگەر زۆر جوان بوو، گومان هەبوو كە تەماشا دەكرێت. ئەوەش بەمەرجێ ئەو سەرپۆشە بەر دەم و چاوی نەكەوێ، گرێدانی تیا نەبێ، گەر ئەو مەرجانەی تیا نەبوو ئەوا فیدیەی لەسەرە.[3]

3- ڕای حەنبەلیەكان: ئافرەت دەتوانێ دەم وچاوی داپۆشێ كاتی پێویستی وەك تێپەڕ بوونی بێگانە بەلایدا، بەمەرجێ ئەو سەرپۆشە بەر دەم وچاوی نەكەوێ.[4]

ئیبن قدامە دەڵێ: ئافرەت دەتوانێ دەم وچاوی داپۆشێ كاتی پێویستی وەك تێپەڕ بوونی بێگانە بەنزیكیدا. ئەوەش بەهۆی هێنانە خوارەوەی پارچەیەك لە سەرپۆشەكەی بۆ سەر دەم و چاوی.[5]

كۆمەڵی زانایان لەسەر ئەوەن كەوا ئافرەت دەتوانێ دەم وچاوی داپۆشێ كاتی پێویستی چونكە ئافرەت خۆی عەورەتە.[1]

---

1- ابن قدامة، المغني، 240/3.
2- الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 645/1.
3- الجزيري، 645/1.
4 - ابن قدامة، المغني، 301/3.
5 - ابن قدامة، المغني، 303/3، 305/3، 393/3، 453/3.

## بڕگەی پێنجەم: دانەماڵینی پۆشاکی دوورواو(عدم التجرد من المخیط)

زانایان لەو بارەوە ڕای جیاوازیان هەیە:

1- ڕای حەنەفیەکان: ئیبن قدامە دەڵێت: پۆشاکی دوورواو لەبەر دەکات وەك کراس، چارۆگە، سەرپۆش، بەڵام بۆی نیە نیقابی[2] دەم وچاو داپۆشین لەبەر بکات، هەروەها دەستەوانە. ئەگەر ویستی دەم وچاوی داپۆشێ ئەوا بە هۆی داگرتنی سەرپۆشەکەیەوە دەتوانێ ئەوە بکات، بەمەرجێ بە پێستەی دەم وچاوی نەکەوێ. دەنگی خۆی بە تەلبیە بەرز ناکاتەوە، بۆن لە خۆی نادات، نینۆك وقژی سەری کورت ناکاتەوە، ڕاوی گیانەوەران ناکات، بەڵام دەتوانێ خەنە بەکاربهێنێ، نابێ شێوەی ناڕێك بێت.

ئەگەرئافرەت نیقابی دەم وچاو داپۆشین، یان دەستەوانەی لەبەر کرد ئەوا دیەی لەسەرە.[3]

2- ڕای شافعی ومالکی: بۆ ئافرەت نیە لە حەج بەکارهێنانی خەنەو کلی چاو، چونکە بۆنیان هەیە.[4]

---

1 ـ النقاب: للنُقبة: مانای ڕەنگ ڕووی دەبەخشێ، ئیبن ئەعرابی دەڵێ بۆیە پێی دەڵێن نیقاب چونکە ڕەنگی ڕوو دادەپۆشی وڕەنگی قوماشەکە دەردەکەوێ. بەمانای نیتاق: بەستەرەوە دێت. لە نیقاب تەنها هەردوو چاو دیار دەبێت. ابن منظور، لسان العرب، 251/14.

2 ـ القفازین: للقفاز: الضم والتشدید: داپۆشەری دەست وپەنجەکان وناولەپ، کە ئافرەتان بەکاری دەهێنن. ابن منظور، لسان العرب،255/11.

3ـ للرحیباني، مصطفی، مطالب أولي النهي في شرح غایة المنتهي، دمشق ،المکتب الإسلامي، 352/2. والفتوحي، منتهی الارادات،259/1. والجزیري، الفقه علی المذاهب الأربعة، 645/1.

4 ـ الجزیري، الفقه علی المذاهب الأربعة،646/1- 647.

## بڕگەی شەشەم: تەلبیە کردن (التلبية)

زانایان لەسەر ئەوەن کەوا بەرز کردنەوەی دەنگ بۆ ئافرەتان دروست نیە، چونکە هۆکاری فیتنەیە. هەر بۆیە بانگدان وبانگی هەڵسان بۆ نویژ کردنیان بۆ دروست نیە. ئەوە ڕای شافعی ومالکی وحەنبەلی وئەوزاعی یە.[1]

## بڕگەی حەوتەم: تەوافی ماڵئاوایی (طواف الوداع)

زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کەوا تەوافی ماڵئاوایی واجبە، ئەوەی نەیکات خوێنی لەسەرە، مەگەر ئافرەتێك کاتی دەرچوونی لە مەککەوە کەوتە باری بێ نوێژی، واتە نە تەوافی لەسەرەو نە خوێن. ئەوەش ڕای زۆربەی زانایانی ناوچە جیاجیاکانن (الأمصار).[2]

## بڕگەی هەشتەم: نزیك بوونەوە لە ماڵی خوا

وا پەسەندە بۆ ئافرەتان کەوا زۆر نزیك نەبنەوە لە کاتی تەواف کردن لە کاتی تەوافی پیاوان، بەڵکو لە دوورەوە بێت تاوەکو تێکەڵاوی پیاوان نەبێت. بەڵکەش ئەو فەرموودەیە کە ئوم سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: گلەییم کرد لای پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:((تەواف بکە لە دواوەی خەڵك وئەتو لەسەر وڵاخەکەتی. بەم شێوەیە تەوافم کرد وپێغەمبەری خواﷺ نوێژی دەکرد لەتەنیشت ماڵی خوا))[3]:((طوفي من وراء الناس وأنت راكبة. فطفت ورسول الله حينئذ يصلي إلى جنب البيت)).[4]

---

1ــ ابن قدامة، المغني، 305/3. والهيتمي، تحفة المحتاج، 251/1.
2ــ ابن قدامة،. المغني، 406/3.
3ــ النووي، المجموع، 369/7.
4ــ البخاري 65- كتاب التفسير باب:1الحديث:8،767/4853.وأبي داود، الرقم: 1882، 177/2.

### بڕگەی نۆیەم: ئافرەت وهەروەلەی تەواف (المرأة والرمل).[1]

زانایان بەگشتی لەسەر ئەوەن کەوا ئافرەت لە تەوافدا هەڕوەلە ناکات.[2]

وا پەسەندە لە سێ جاری یەکەمی سوڕانەوەی دەورەی کەعبە بە خێرایی بێت (هەروەلە)، لە چوار جارەکەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بێت. بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ئیبن عمرﷺ کە دەیگێڕێتەوە: ((پێغەمبەری خوایﷺ بە خێرایی ڕۆیشتووە لە سێ سووڕانەوەی یەکەم، لە چوارەکەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی تەوافی کردووە، لە هەردوو کاتی حەج وعمرەدا))

((سعى رسول اللهﷺ ثلاثة أشواط ومشى أربعاً في الحج والعمرة)).[3]

### بڕگەی دەیەم: دەرخستنی شانی ڕاست (الاضطباع)[4]

دەرخستنی شانی ڕاست لە کاتی ئیحرام بەستاندا لە سونەتەکانە، چونکە پێغەمبەری خواﷺ وای کردوە، هەروەك لە ئەبو داودەوە دەگێڕنەوە: ((پێغەمبەری خواﷺ تەوافی کردووە بە بوردەیەکی سەوز وشانی ڕاستی بەدەرەوەبووە)) ((أن النبيﷺ طاف مضطبعاً ببرد أخضر)).[5]

ئەوەش سونەتە بۆ پیاوان لە تەوافی(الإفاضة أو القدوم)، لە تەوافی ماڵئاوایی (الوداع) نیە.[6] بۆ ئافرەتان نیە چونکە پێچەوانەی خۆ داپۆشینە.[7]

---

1 ـ الرمل: بریتیە لە خێراکردنی ڕۆیشتن ونزیککردنەوەی هەنگاوەکان وجولانەوەی هەردوو شان، بەبێ بازدان. الجرجاني، التعريفات، ص65.

2ـــ النووي، المجموع، 679/8.

3ـــ البخاري 25-كتاب الحج باب:57 الرمل الحديث:1604، 593/3. وأبي داود، الرقم: 1890، 179/2.

4ـــ الاضطباع: مانای ئەوەیە ناوەندی ئیحرامەکەی بخاتە بن باڵی ڕاستی، شانی ڕاستی دەرکەوێت. ابن منظور، لسان العرب، 16/8.

5ـــ سنن أبي داود، كتاب: المناسك- الحج، باب: الاضطباع في الطواف، رقم الحديث:1883، 177/2، عن أبي يعلى عن أبيه.

6ـ ابن قدامة.المغني ،376/3.

7ـ النووي، المجموع، 365/7.

## بڕگەی یانزەهەم: سەرکەوتنی سەر صەفاو مەروە

بۆ ئافرەتان سونەت نیە سەرکەوتنی ئەو دوو بەرزاییە یە، هەروەك لە مەزهەبی مالکی وحەنبەلی دا هاتووە.[1]

## بڕگەی دوانزەهەم: کورت کردنەوەی قژی سەر (التقصير)

لە ئیبن عەباسەوە‏ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((تاشینی قژی سەر بۆ ئافرەتان نیە تەنها کورت کردنەوەیە)) ((ليس على النساء حلق إنما التقصير)).[2]

### ئیمامی شافعی دەڵێ:

کورت کردنەوەی قژی سەر بۆ ئافرەتانە، تاشین قەدەغەیە بە ڕای کۆمەڵی زانایان[3]، چونکە پێکچوون ولاسایی پیاوانە.[4]

### ڕای حەنبەلی و مالکیەکان:

کورت کردنەوەی قژی سەر بۆ ئافرەتانە، تاشین قەدەغەیە چونکە وەك هەتککردن وایە. لە نێوان زانایان جیاوازی هەیە لەسەر ئەو بڕەی کە ئافرەت لە قژەسەری خۆی دەبڕێ.[5]

هەیتەمی لە کتابی(تحفة المحتاج) دا دەڵێت: هەرگیز تاشینی قژی سەر بۆ مێینە نیە، تەنها ڕۆژی حەوتەمی دوای لە دایکبوون نەبێت، تاوەکو بە بڕی کێشی مووەکان سەدەقەو خێر بکرێت، یان بۆ چارەسەری نەخۆشی.[6]

---

1ــ الجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 660/1. وابن قدامة، المغني، 387/3.
2ــ سنن الكبرى للبيهقي، باب: ليس على النساء حلق، ،الرقم:9187 ، 104/5.
3ــ العسقلاني، ابن حجر، فتح الباري بشرح صحيح البخاري، 3/ 713.
4 ــ النووي، مغني المحتاج، 502/1.
5ــ ابن قدامة، المغني، 355/3. والجزيري، الفقه على المذاهب الأربعة، 668/1.
6ــ الهيتمي، تحفة المحتاج، 61/2.

# بەشی سێیەم

## ئافرەت وكاركردن، تێكۆشان وكاری قورس، ئەو مەرجانەی پێویستە ئافرەت جێبەجێی بكات كاتی چوونە دەرەوە لە ماڵ

باسی یەكەم: ئافرەت وكاركردن

باسی دووەم: تێكۆشان وكاری قورس

باسی سێیەم: ئەو مەرجانەی پێویستە ئافرەت جێبەجێی بكات كاتی چوونە دەرەوە لە ماڵ

ئەو سەردەمەی ئێستا ئێمە تیایدا دەژین وەك ئەو سەردەمە نیە کەوا باو باپیرانمان تیایدا دەژیان پێش سەد ساڵ، گۆڕانکاری زۆر بە سەریدا هاتووە لە خووڕەوشت و داب و نەریت وچۆنیەتی ژیان، هیوا ومەبەست ونارەزو، تاوەکو دەگاتە بیروباوەڕو مل کەچی وخوا پەرستی، لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی موسوڵمانان لە ئاینی ئیسلام وشوێن کەوتن ولاسایی کردنەوەی ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا لە گشت بوارەکانی ژیان.

لەو باسانەی کەوا بۆتە جێگەی گفتوگۆ لە ناو کۆمەڵگەی زۆربەی وولاتانی ئیسلامی لە نێوان خاوەن بیرو باوەڕە جیاجیاکان، بریتیە لە کارکردنی ئافرەت. ئایا ئەو کارکردنە قەدەغەیە، جائزە بە بێ مەرج، یان جائزە بە مەرجی تایبەت، جائزە بۆ هەندی کاری تایبەت وگونجاو.

# باسی یەکەم

## ئافرەت وکارکردن

بەندی یەکەم : ئافرەت وکارە گشتیەکان

برگەی یەکەم : ڕای کۆمەڵەی یەکەم

برگەی دووەم : ڕای کۆمەڵەی دووەم

برگەی سێیەم : ڕای کۆمەڵەی سێیەم

بەندی دووەم : بوارە گونجاوەکان بۆ کاری ئافرەت

برگەی یەکەم : کاروچالاکی ڕامیاری

برگەی دووەم : کاروچالاکی پەروەردەیی وبانگەواز کردن

برگەی سێیەم : کارو چالاکی کۆمەلایەتی

## باسی یەکەم: ئافرەت وکارکردن

هەروەك باسمان کرد ئاینی ئیسلام بەیەك ئاست تەماشای هەردوو ڕەگەز دەکات، هیچ بەرزی وگەورەییەك نیە بۆ یەکیان لە سەر ئەوی تریان تەنها بە تەقوای خوا نەبێ. بەڵام ئەوەی پێویستە بزانرێ کەوا خوای گەورە پێکهاتەی جەستەیی ودەروونی هەردووکیانی یەکسان نەخولقاندووە، ئەمەش مانای ئەوە نیە یەکیان فەزڵی لەسەر ئەوی تریان هەیە، بەڵکو بۆ تەواو کردنی یەکتریە. هەروەها ئیسلام هەندێ کاری بۆ پیاوان نا پەسەند کردووە چونکە دەبێتە هۆکارێك بۆ فەساد، هەندێ کاریشی بۆ ئافرەتان نا پەسەند کردووە چونکە هۆکارە بۆ فەساد. لە هەمان کاتدا هەریەکیان صەلاحیاتی تەواوی هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی پەیوەستن بە ڕەگەزی خۆیەوە، هەردووکیان تەواوکاری یەکترین.

### بەندی یەکەم: ئافرەت وکارە گشتیەکان (اشتغال المرأة بالعمل العام)

زانایان سێ ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی کاری ئافرەت بە گشتی.

#### برگەی یەکەم: ڕای کۆمەڵەی یەکەم

ئەو کۆمەڵە وا دەبینن کەوا کاری سەرەکی ئافرەت لە ماڵەوەیە، کە بریتیە لە پەروەردەی منداڵ وخزمەتی ماڵ وهاوسەر، چوونە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵ بە بێ هۆ، خۆ دانەپۆشین بە فەسادو ئارەزووبازی لە قەڵەم دەدەن. لەو باوەڕەدان کەوا زیانی بۆ کۆمەڵگە زۆر زیاترە لە سوودو قازانجی.

بەڵگەی شەرعی ئەو کۆمەڵەش بریتیە لەو ئایەت وفەرموودانە: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ﴾ الأحزاب:33. ئەو فەرموودەی عبد الله کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:((كلكم راع وكلّكم مسؤول عن رعيته، فالإمام راعٍ وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راعٍ وهو مسؤول، والمرأة راعية على بيت زوجها وهي مسؤولة، والعبد راع على مال سيده

وهو مسؤول، ألا كلكم راعٍ وكلكم مسؤول)).[1] واتـە: هـەر یـەك لـە ئێـوە شـوان و سەرپەرشتیاری ئەو کەس وکەل و پەلانەیە کە لەبەر دەستیەتی، ئیمام وپێشەوا، پیـاو، ئـافرەتیش شـوان وسەرپەرشـتیاری مـاڵ ومنداڵەکایـەتی، بەرپرسـیارە لـەو کارانەی لە ئەستۆیەتی، هەروەها بەندەو کۆیلەش بە هەمان شێوە بەرپرسـیارە لـە ماڵی خاوەنەکەی.

لـەو زانـا پایـە بەرزانـەی کـەوا خـاوەنی ئـەو رایانـەن بـریتین لـە: ئـەبو ئـەعلای مەودودی[2]، سەید قوتب[3]، فەرید وەجدی[4]، رەمەزان بوطی.[5]

1- کـاری سـەرەکی کـە بـە ئـافرەت سـپێردراوە بریتیـە لـە مانـەوەی نـەوەی مرۆڤایەتی، لە رێگەی سك پڕی ومنداڵبوون و پەروەردە کردنی. بۆ ئەنجامدانی ئـەو کارە گـەورەو پـیرۆزە، خـوای گـەورە چـەند سـیفەتێکی پـێ بەخـشیووە، وەك دڵ ناسـکی، نـەرمی، بـە سـۆزی. هـەروەها لەسـەر پیـاوی واجـب کـردوە کـە ژیـانی و ئداویـستیە زەروریـەکانی دابـین بکـات. چـوونە دەرەوەی ئـافرەت بـۆ کـارکردن پێچەوانەی ئەو مەبەستە گرنگەیە کە لە سەرەوە باسمان کرد.[6]

2- کـارکردنی ئـافرەت لـە دەرەوەی مـاڵ، پێـچەوانەی زۆر لـە بنـەماکانی

---

1ـ البخاري: 70-1 لنكاح بـاب:81، الـرقم: 4892، 1988/5. ومـسلم: 33- الإمـارة الرقم:20-1829، 1932/4.

2ـــ المودودي، الحجاب، ص324. ناوی ئـەبو الأعلى کوڕی ئەحمەد کوڕی حەسەن، لە سالی 1903 لە شاری حەیدەر ئابادی هندی لە دایك بووە، زانایەکی خاوەن بیرو باوەڕێکی پتەو بووە، دامەزرێنەری کۆمەڵی ئیسلامیە لە هندستان، پاشان چووتە پاکستان، یەکێکە لە بانگەوازانی چاکسازی. لە سالی 1980 کۆچی دوایی کردوە .الجمال حمد بن صادق ، أبو الأعلى المودودي-حياته وفكره. والعقيل، عبـد الله سليمان عقيل، من أعلام الدعوة والحركة الإسلامية المعاصرة، ص331-344.

3ـــ سيد قطب، في ظلال القرآن،493/1. سيد قطب، السلام العالمي والإسلام، ص54.

4ـــ وجدي، محمد فريد، المرأة المسلمة، ص71 .

5ـــ البوطي، محمد سعيد رمضان، إلى كل فتاة تؤمن بالله، ص52.

والبوطي، المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني، ص57 وما بعدها.

6ـ وجدي، محمد فريد، المرأة المسلمة، 70. وسيد قطب، السلام العالمي، ص54.

شەریعەتە، وەك سالاری مالّ، بژێوی دابین کردن، پلە بەرزی پیاو. لە بیرو فیکری ئیسلامیدا نەهاتووە ئافرەتان کاری پیاو بکەن، چونکە گۆڕینی تەشریع وئاینە. [1]

3- هاتنە دەرەوەی ئافرەت لە مالّ هەندێ شتی تری بەدواوە دێت وەك: خۆڕازاندنەوە، دەرخستنی جوانی وخشلّ، تێکەلاوی. ئەو شتانەی باسمان کردن حەرامن، واتە چوونە دەرەوە هۆکارە بۆ هاتنە کایەی ئەو دیاردە حەرامانە کەواتە خۆشی حەرام دەبێت، بەگوێرەی ئەو یاسا فیقهیەی دەلّێت: هەر شتێك حەرامی لێ بکەوێتەوە خۆشی حەرام دەبێت (وما يترتب عليه حرام فهو محرم). چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن هەرچەندە سوودو بەرژەوەندی ماددی تیایە، بەلام پۆشتەیی ئافرەت وتێکەلاو نەبوون لە بەرژەوەندی خێزان وکۆمەلّە، پەیوەندی دارە بە پاراستنی جۆرو نەوەی ئادەمیزاد، کە ئەو پاراستنی نەوەو جۆرە لە پێشتر، سەروترە لە بەرژەوەندی ماددی تاك یان خێزان. [2]

4- هەندێکی لەو زیانانەی کە لە چوونە دەرەوەی ئافرەت دەکەوێتەوە، وەك: تێکەلاو بوونی لێپرسراویەتی کۆمەلایەتی لە نێوان ئافرەت وپیاو. پچڕانی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی نێوان ئەندامانی یەك خێزان، نێوان هەردوو هاوسەر، نێوان دایك و مندالّەکانی.

5- کاتێ چوونە دەرەوەی دایك خێزان ناچار دەبێت بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری ناو مالّ پشت ببەستێت بە هێنانی خزمەتکار بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری مالّ، پشت بەستان بە داینگەکان لە جیاتی باوەش و سۆزی دایك، لە جیاتی سۆزی دایکایەتی لێدان وتوڕەیی سەرپەرشتیارانی داینگەکان، بەکارهێنانی شیری ووشك کراوەی مانگا لە جیاتی شیری دایك.

6- بەربەرەکانی کردن لەگەلّ پیاو بۆ پەیدا کردنی کار. بەمەش بێ کاری لە ناو پیاو زۆر دەبێت، کۆمەلّگە تووشی بارێکی لا سەنگی دەبێت.

1ـــ محمد محمد حسين، حصوننا مهددة من الداخل، ص138 وما بعدها.
2ـــ البوطي، ضوابط المصلحة في الشريعة الإسلامية، ص260.

## بڕگەی دووەم: ڕای کۆمەڵی دووەم

ئەو کۆمەڵە وا دەبینن کەوا ڕای کۆمەڵی یەکەم تەنها بریتیە لە زولم، تێ ڕوانینی ئافرەت بە چاوێکی نا مرۆڤایەتی، نەبوونی متمانە بە توانای ئافرەت.

ئەوانەی لەسەر ئەو ڕایەن کە پێویستە ئافرەت کاری گشتی بکات بریتین لە قاسم ئەمین[1]، موحەمەد عەبدە[2]، ڕوفاعە الطهطاوي[3]، هەندێکی تر.

**بەڵگەکانی کۆمەڵی دووەم:**

1- گەشە پێدانی کەسایەتی ئافرەت و فراوان کردنی ئاستی فیکریەتی.

2- ئافرەت چونکە نیوەی کۆمەڵە نابێ ئەو چینە لە کار بخرێت، بەمەش کۆمەڵگە تووشی ئیفلیجی و پەککەوتوویی دەبێت.

3- لەبەر ئەوەی خوای گەورە هۆش وبیری بە ئافرەت بەخشیوە، لە ئەرك وفەرمانەکانی شەرعی نە بەخشراوە. ئەمەش مانای ئەوەیە دەتوانێ بژێوی خۆی بەدەست بهێنێ، ئەگەر ڕێگەی پێ نەدرا ئەوا مانای ئەوەیە مافی پێ شێل کراوە.

4- ئافرەت بە کارکردن دەتوانێ هاوکاری وبژێوی ئەوانە پەیدا بکات کە

---

1ـــ قاسم لمين، المرأة الجديدة، ص9، ص19.

2ـــ محمد عمارة، الأعمال الكاملة للإمام محمد عبدة، 106/2. ناوی موحەمەد کوڕی عەبدە کوڕی حەسەنە، لە بنەماڵەی ئال تورکمانیە. موفتی میسر بووە، لە ساڵی 1849 لە دایك بووە. لە گەورە پیاوانە چاکسازی ونوێکردنەوەیە لە ئیسلام، لە گۆڤاری وەقائعی میسری کاری کردووە، بەند کراوە چەند جار، هەڵات بۆ سوریا، پاشان لە پاریس لەگەل جەمالەدینی ئەفغانی ڕۆژنامەی العروة الــوثقی دەرکردووە. لە ساڵی 1888 گەڕاوەتەوە میسر وبەشداری شۆڕشی ئەحمەد عرابی کردووە. خاوەنی گەلێ کتێبە ، لە ساڵی 1905 لە ئەسکەندەریەی میسر کۆچی دوایی کردووە .

الزركلي، الأعلام، 252/6.

3ـــ الطهطاوي، رفاعة رافع، المرشد الأمين للبنات والبنين، المطبــوع ضــمن الأعمــال الكاملة المجموعة له من قبل محمد عمارة، 2/ 393. ناوی ڕەفاعە ڕافعی بەدەویە، لە ساڵی 1801 لە شاری تەنتا لە دایك بووە، یەکێکە لە کۆڵەگەکانی گەشەی زانستی لە میسر، لە زانکۆی ئەزهەر خوێندوویەتی، حکومەتی میسری ناردوویەتی بۆ پاریس بۆ خوێندن، ڕۆژنامەی وەقائعی میسری داناوە، کتابی زۆری داناوە، زۆر کتابیشی لە فەرەنسیەوە کردۆتە عەرەبی، لە ساڵی 1873 کۆچی دوایی کردووە .

الزركلي، الأعلام، 29/3.

کەوتوونەتە ئەستۆی، بەتایبەتی کاتێ بێوەژن بوو یان هاوسەرەکەی توانای کاری نەبوو. واتە دەتوانێ منداڵەکانی لە تیاچوون بپارێزێت.

5- وەرگرتنی خاتوو شیفا [1] لێپرسراویەتی کاروباری ناو بازار لە خەلافەتی ئیمامی عومەر، مانای ئەوەیە ئافرەت دەتوانێ کاری دەرەوە بکات و جائزە.[2]

## برگەی سێیەم: ڕای کۆمەڵی سێیەم

ئەو کۆمەڵە ڕایان وایە ئافرەت لەگەڵ هەڵسوڕانی کاروباری ناو ماڵ و پەروەردەی منداڵ، دەتوانێ ڕۆڵێکی بەرچاو ببینێ لەناو کۆمەڵگە بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە بۆی گونجاوە، وەك کاروباری پەروەردە، تەندروستی، داینگەو باخچەی ساوایان، لەگەڵ ڕەچاو کردنی مەرجەکانی چوونە دەرەوە، پۆشاکی گونجاو، تێکەڵ نەبوون.

خاوەنی ئەو ڕایەش بریتین لە: موحەمەد عزە دروزە[3]، عەلی عەبدولواحد الوافی[4]، بەهی الخولی[5]، هەندێ زانای تر.

ئەوانە دەڵێن کاری سەرەکی ئافرەت لە ماڵەوەیە، بەڵام گەر کارێك گونجاو بێت لەگەڵ پێکهاتەی جەستەیی ودەروونی دەتوانێت ئەنجامی بدات، بەو مەرجانەی خوارەوە:

1- ئەو کارەی دەرەوە کار نەکاتە سەر کاری سەرەکی ماڵەوەی، لە ئەرکی و مافی هاوسەرو منداڵەکانی.

---

1ـ الشفاء: لەیلای کچی عەبدوڵای کوڕی خەلەفی قورەیشی عەدەویە. یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە زوو موسوڵمان بووە، خاوەنی بیرو هۆش وزانست بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردووەوپێی ووتوە حەفصەی خێزانم فێری سورەتی النمل بکە هەروەك چۆن فێری نوسینت کرد. ئیمامی عومەری ڕێزی تایبەتی بۆ دانابوو، زۆر جار ڕای وەردەگرت، بە سەرپەرشتیاری کاری بازاڕی دانابوو. ساڵی 20 ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. ابن حجر، الإصابة ،341/4. والزركلي، الأعلام، 168/3. وكحالة، أعلام النساء، 300/2.

2ـ الحجوي، محمد المهدي، المرأة بين الشرع والقانون، ص35 وما بعدها.

3ـ دروزة، محمد عزة ، المرأة في القرآن والسنة، ص51.

4ـ الوافي،علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام، ص31.

5ـ البهي الخولي، الإسلام والمرأة المعاصرة، ص221-248.

2- نەبێتە هۆکار بۆ زیانێکی کۆمەڵایەتی، وەك بەربەرەکانی لەگەڵ پیاو بۆ بەدەست هێنانی کارو دروست بوونی بێکاری پیاو.

3- بتوانێ پارێزگاری بکات لە پۆشتەیی وتێکەڵ نەبوون.

4- وەرگرتنی ڕەزامەندیی هاوسەرەکەی.

5- نا بێت کارێکی قورس بێت کار بکاتە سەر سیفەتە مێینەکانی.

بەڵگەی ئەو کۆمەڵەش ئەم خاڵانەی خوارەوە:

1- وەرگرتنی خاتوو شیفا لێپرسراویەتی کاروباری ناو بازار لە خەلافەتی ئیمامی عومەر، مانای ئەوەیە ئافرەت دەتوانێ کاری دەرەوە بکات و جائزە.

2- جائزە ئافرەت لێپرسراویەتی قەزاوەت وەربگرێ بەبێ مەرج، هەروەك ئیمامی طبري[1]، ئیبن حەزمی ظاهري[2]، کە بۆ قەزاوەت مەرجی نێرینەیان دانەناوە. ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: ئافرەت دەتوانێ قەزاوەت وەربگرێ لە هەموو شتێك تەنها لە سنوورەکانی خواو تۆلەسەندنەوە (القصاص والحدود) نەبێ[3]، بەو شێوەش شایەتی دانی ئافرەت هەر بۆ ئەو دوو شوێنە نابێت.

سەربەستی ئادەمیزاد لە کارکردن، بۆ هەردوو ڕەگەز گەر هیچ یاسایەکی تیا نەبێت، هەر یەکێك بە ئارەزووی خۆی چی لا خۆش بوو بیکات، بەبێ گوێ دانە یاساو ڕێسای شەرع و ئادابە کۆمەڵایەتیەکان، ئەوا لای زۆربەی زانایانی ئیسلامی بە دواکەوتنی ڕەوشت، هەڵوەشاندنەوەی کۆمەل، تێکچوونی باری خێزانداری و پەیوەندی هاوسەرێتی، سەرلێ شێواوی وسەرگەردانی منداڵەکان دەژمێردرێت. ئەو کارانەی ئافرەتان ئەنجامی دەدەن لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات داوا دەکات ئافرەتانی ئێمە ئەنجامی بدەن ئەوا لای ئێمەی موسوڵمان هەمووی ڕەت دەکرێتەوە.

---

1ـ القرطبي، بداية المجتهد ونهاية المقتصد، 395/2.

2ـ ابن حزم الظاهري، المحلّى ، 363/9. ناوی عەل کوڕی ئەحمەدی ئەندەلوسیە، فەقیهەکی بەرز ، ئەدیب ودانەر ، لە ساڵی 384 ی کۆچی لە قورتبە لە دایك بووە، لە ساڵی 456 ی کۆچی وەفاتی کردووە. أعلام النبلاء، 184/18. وشذرات من الذهب، 299/3.

3ـ المرغيناني، الهداية شرح بداية المبتدي، 107/3.

ئەو چالاکیانەی کەوا ئافرەتی موسوڵمان دەتوانێ ئەنجامی بدات وتا ڕادەیەکی باش تیایدا سەرکەوێت، بریتین لە کاری پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵان بەتایبەتی ئەوانەی ڕەگەزی خۆیانن، لەگەڵ ڕەچاوکردنی هەموو مەرجەکانی دەرچوونە دەرەوەو پۆشتەیی وڕازاندنەوە. هەروەها کار نەکاتە سەر ئەرکەکانی دایك بەرامبەر بە منداڵی کۆرپە وشیرەخۆر.

ئافرەتی موسوڵمان دەتوانێ لە بواری پزیشکی ئافرەتان ومنداڵان بەشداری بکات. ئەو کارانە زۆر پیرۆزن، زۆر گونجاون لەگەڵ پێکهاتەی فسیۆلۆژی ئافرەت، بەمەش خزمەتێکی زۆر پێشکەش بە کۆمەڵگەکەی دەکات.

بەڵگەمان لە سەر ئەوەی ئافرەت دەتوانێ ئەم چالاکیە کۆمەڵایەتی و زانستیانە ئەنجام بدات.

1- هەروەك پێشتر باسمان کرد کەوا ئافرەتان خاوەنی دەروونێکی ناسك و هەستیار وبەسۆزن، مامەڵە کردنیان لەگەڵ کەسانی تر نەرمە، بەتایبەتی ئەوانەی لە خۆیان بچوکترن. ئارەزووی هاوکاری وخزمەتی خەڵکانی تر کە لەگەڵیا دەژین بەرزە.

2- دەتوانێ بەشداری کاروچالاکیە کۆمەڵایەتیەکان بکات لە بەرەکانی جەنگ لە دواوەی هێڵەکانی بەرەنگاری، وەك: دابەش کردنی ئاو، برین پێچی، لادانی زامدارەکان. ئەو کارانە چونکە کارێکی کاتین وتوانایەکی جەستەیی زۆری ناوێت، کار ناکاتە سەر کارە سەرەکیەکانی ئافرەت لە ماڵ و لێپرسراویەتی بەرامبەر هاوسەرو منداڵ، دەتوانن بۆ ئەو شوێنانە منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان ببەن. زانایانی دەروونناسی پشتگیری گونجاوی ئەو جۆرە کارانەیان کردووە بۆ ئافرەتان، بۆیە ئافرەتان زۆر گونجاون بۆ ئەو کارانە. بە ئەنجامدانی ئەو کارانە لە لایەن ئافرەتانەوە، ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان کە دەبوایە ئەو کارانە ئەنجام بدەن، دەتوانن شوێنی تر وکارە قورسەکانی جەنگ بگرنە ئەستۆ.[1]

---

1- بەرگی یەکەم، بەشی سێیەم/ باسی دووەم.

## بەندی دووەم: بوارە گونجاوەکانی بەشداری ئافرەت

کارەکانی گونجاو بۆ ئافرەتان دەکرێتە چەند بەشەوە: کاروچالاکی ڕامیاری، پەروەردەیی وبانگەواز کردن، کۆمەڵایەتی.

### برگەی یەکەم: کاروچالاکی ڕامیاری

لە لاپەرەکانی داهاتوودا بەدرێژی باسی ئەو بابەتە دەکەین ، کاتێ باسی وەزارەت وسەروکایەتی وقەزاوەت دەکەین.

### برگەی دووەم: کاروچالاکی پەروەردەیی وبانگەواز کردن

ئافرەتی خاوەن باوەڕ، تێگەیشتوو، پێگەیشتووی ڕۆشنبیر، دەتوانێ لەو بوارەدا ڕۆڵێکی زۆر گرنگ و بەرچاو بگێڕێ، بە نووسینی ووتەو مەقالاتی گونجاو لەگەڵ ژیانی سەردەم دەربارەی چۆنیەتی پەروەردەی منداڵ وچاودێری کردنیان تاوەکو دەگەنە تەمەنی هاوسەری وجیابوونەوە لە دایك وباوك، هەروەها نووسین و بڵاوکردنەوەی پەڕاوی بچوك و گەورە لەسەر ئافرەتان وکاروباری ژیانیان وبەرهەڵستی کردنی ئەو هەموو تەوژمە دەرەکیەی دەکرێتە سەر ئافرەتان، وەڵامدانەوەیان بە شێوەیەکی زانستیانە وشەرعیانەی گونجاو لەگەڵ گیانی سەردەم و پێشکەوتنی کۆمەڵگە.

هەروەها ئافرەتان لە هەموو ئاستەکانی خوێندن و شوێنەکانی کار کردن دەتوانن ئەو کارە گرانکانە جێبەجێ بکەن بە هاوکاری یەکتری وبەشداری کردن لە یەکیەتیەکانی قوتابیان وئافرەتانی سەربەخۆ( گەر هەبێت).

### گرنگترین ئەو کارانەی ئافرەتان دەتوانن ئەنجامیان بدەن:

1- هەنگاونان بۆ لەناوبرنی نەخوێندەواری لەناو چینی ئافرەتان.

2- ڕێکخستنی هەڵمەتی ڕۆشنبیری وکردنەوەی خولی تایبەت بە بەرژەوەندیەکانی ئافرەت وفێرکردنی پیشەیی.

3- بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەی تایبەت بە پەروەردەکردنی منداڵ، بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری گشتی ئافرەتان، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە کاروباری خێزان.

4- لێکۆڵینەوەی زانستی واقیعی لەسەر ئایەت وفەرموودەکانی پەیوەندیدار بە ژیانی هاوسەرێتی و کاروباری خێزان، بۆ زیاتر شارەزا بوون لە حوکمەکان، تێگەیشتن لە مەبەستەکانی، گونجاویەتی لەگەڵ کات و شوێن و سەردەمدا.

5- چۆنیەتی بەرپەرچ دانەوەی ئەو هێرشە فیکریە نا ڕەوایانەی کە دەکرێت بەرامبەر بە حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام دەربارەی ئافرەت وخێزانداری وباری کەسایەتی.

6- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، ناودارەکانی کورد بەتایبەتی، چۆنیەتی بەشداریان لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا .

7- بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی شەرعی وزانستە سروشتیەکانی تر بەهەموو بەشەکانیەوە.

8- پێشکەش کردنی پرۆژەی خزمەت گوزاری تایبەت بە ئافرەتان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

9- نووسینی گوتاری گونجاو لەگەڵ ژیانی سەردەم، دەربارەی چۆنیەتی پەروەردەی منداڵ و چاودێری کردنیان، هەروەها نووسین وبڵاوکردنەوەی پەڕاوی بچوك وگەورە لەسەر ئافرەتان وکاروباری.

ئەگەر ئەو خاڵانە جێبەجێ بکرێت ئەوا ئافرەت دەبێتە قوتابخانەیەك بۆ خۆی، دەتوانێ بەرەنگاری هەموو جۆرە بیروبۆچوونێکی نامۆ ببێتەوە، لە هەمان کاتدا ببێتە پاڵپشتی هەموو کارێکی چاکەی پەیوەندیدار بە کەسایەتی ئافرەت وخێزان و کۆمەڵگە.

هەروەك یەکێ لە حەکیمەکانی یۆنانی(سیولون)[1] دەربارەی گرنگی ڕۆڵی دایك

---

1- سیولۆن: یەکێکە لەحەوت حەکیمەکانی یۆنان،دانەر و داڕێژەری یاساکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی و رامیاری بووە، ڕێگە خۆشکەر بووە بۆ دەرکەوتنی دیموکراتی کلیسینس. المنجد في الأعلام، ص316.

دەڵێت: پەروەردەی منداڵ پێویستە پێش لە دایکبوونی بە 20 ساڵ دەست پێ بکات ئەویش بە پەروەردەی دایکی.[1]

هەروەها شاعیری بەناوبانگ حافظ إبراهیم[2] دەڵێت:

دایك قوتابخانەیە گەر پەروەردەت کرد واتە: گەلێکی ڕەگ پاکت ئامادە کرد

## بڕگەی سێیەم: کارو چالاکی کۆمەڵایەتی

لەبەر ئەوەی ئافرەت زۆر سیفاتی خۆڕسکی ودەست کەوتووی تیایە، بۆیە دەتوانێ ئەم کارو چالاکیە کۆمەڵایەتیانە بکات.

1- کارکردن لە پێناوی بەهێز کردنی پەیوەندیی خێزانداری، هاوکاری کردن بۆ چارەسەری کێشەکانی ناو خێزان.

2- هەوڵدان بۆ کردنەوەو دروست کردنی ناوەندە کۆمەڵایەتی وڕاوێژکاریەکان، بۆ لێکۆڵینەوە لەو کێشانەی پەیوەستن بە ئافرەت، دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆیان.

3- کار کردن بۆ کەم کردنەوەی ئەو هۆکارانەی بەربەستن لە ڕێگەی پێکەوەنانی خێزان، وەك: بەرزی مارەبڕین، ژن بە ژنی، گەورە بەبچوك، مارە بڕینی کچی بچوك.

4- گەشە پێدانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی، کار کردن بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو بیرو باوەڕە هەڵانەی کە بەرامبەر بە ئافرەت ڕسکاوە لە ناو کۆمەڵگە، بە تایبەتی ئەوانەی بە ناوی ئیسلامی پیرۆزەوە دە گوترێ ودەکرێت.

5- گرنگی دان بە پێکەوانی خێزان لە سەر بنەمای شەرعی ودروست، وەك:

---

1ـ فؤاد حسين، المرأة في الشعر الكردي، ص123.

2ـ حافظ إبراهيم: لە ساڵی 1872 لە میسر لە دایك بووە، لە شاعیرە گەورەکانی سەردەم بووە، بە شاعیری نیل ناسرابوو، دیوانێکی شیعری هەیە، کۆمەڵێ شیعری بەناوی لیالي سطیح بلاو کردۆتەوە، لە ساڵی 1932 کۆچی دوایی کردووە. المنجد في الأعلام ، ص212.

دەست نیشان کردنی هاوسەر، ڕێز گرتنی هەردوو لا، هاوسەنگی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری.

6- کارکردن لە پێناوی هاوکاری ئافرەتە پیرەکان، دەربەدەر بووەکان، لێقەوماوەکان، نەخۆش و پەککەوتەکان، قوربانیانی کێشە کۆمەڵایەتیەکان. هەروەها کار کردن لە پێناوی دابین کردنی مافەکانیان، ڕێز گرتنیان لە ناو کۆمەڵ.

7- کار کردن بۆ گرنگی دان بە منداڵان لە سەر ئاستی خێزان وکۆمەڵگە، هەروەها چەسپاندنی مافەکانی خوێندن وڕۆشنبیری وکۆمەڵایەتیان.

8- داکۆکی کردن لە سەر شیاوی تەواوی ئافرەت لە مافی خاوەن مولکیەتی و سەربەستی ئابوری، مافی وەرگرتنی میرات.

9- هەڵدان بۆ کردنەوەی خولی پراکتیکی بۆ فێربوونی کۆمپیوتەر، دوورین، چنینین، پیشەکانی تری دەستی.

10- کار کردن بۆ گرنگی دان بە کردنەوەی ناوەندی چاودێری دایکان ومنداڵان.

11- کار کردن لە پێناوی زیاد کردنی نەخۆشنانەی پەیوەست بە نەخۆشیەکانی ئافرەتان ومنداڵبوون، نەخۆشیەکانی منداڵان.

لە کۆتاییدا برگەیەك لە نووسینەکانی شێخ موحەمەد ئەبو زەهرەتان بۆ دەهێنمەوە کە دەربارەی گرنگی دان بە کاری تایبەت بە ئافرەتانەوەیە: ئەگەر ئافرەت وەزارەتی ئافرەتان بە ڕێوە ببات، بێگومان ئەوا گرنگی دەدات بەو کارو بارانەی پەیوەستە بە ڕەگەزی خۆیەوە، لەگەڵ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکانی ئافرەت وخێزان و دەروبەری.

لەو کاتەدا ئەو بەربەست وکێشانەی دێتە پێش ئافرەت لە کاتی کارکردن لە دەرەوەی ماڵ کە کۆمەڵی یەکەمی زایانان باسیان لێ کردووە زۆربەی نامێنێ، هەروەها ئەو بانگەشەی کۆمەڵی دووەم دەیکەن بۆ یەکسانی لە گشت شتێکدا

ئەویش پوچەڵ دەبێتەوە، ئافرەتیش چی تر بە دەنگ ئەوانەوە ناچێت کە بە بێ هێزی لە قەڵەم دەدەن و داوای مافیان بۆ دەکات وهەوڵ دەدەن هەردەم ئافرەتان لاسایی پیاوان بکەنەوە. ئەو ئەمانەتەی لە سەر ئافرەت دانراوە دیارە، هەر هەنگاوێکیش بۆ چوونە دەرەوە لەو بازنەیەدا بە ئەمامەتیەکی گەورە دادەنرێت لەسەر تاك وكۆمەڵ ونەوەی دوا ڕۆژ هەروەك ئێستا لە زۆر شوێنی جیهان دەیبینین. شتێکی ناڕەواشە ئافرەت تاوەکو ئێستا نەزانێ نامەی ژیانی چیەو چۆن ئەنجامی بدات.

هەروەها دەڵێت: بە هەمان شێوە بۆ وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، چونکە کاری ئەویش هەر پەیوەستە بە هاوکاری هەژاران ولێقەوماوان، هەتیوان و پەککەوتەی شەرەکان، هەروەها سەرپەرشتی منداڵان وهەرزەکاران، ئەوانەش گشتیان پێویسیان بە سۆزو دڵ نەرمی وسەبر و ئارام گرتن هەیە، کە هەموو ئەو سیفەتانە لە ئافرەتاندا هەیە وئارەزوو دەکات ئەنجامیان بدات، چونکە هەر ئەو کارانەن تەواوکەرو تێربوونی ئارەزوەکانی ژیانی ڕۆژانەیەتی.[1]

---

1ــ فؤاد عبد المنعم، مبدأ المساواة في الإسلام، ص242.

## باسی دووەم

## تێکۆشان و کاری قورس

بەندی یەکەم: چۆنیەتی بەشداری ئافرەت لە تێکۆشان

بەندی دووەم: زیانەکانی کاری قورس لەسەر ئافرەت

برگەی یەکەم: زیانەکانی لەسەر کرداری بێ نوێژی

برگەی دووەم: زیانەکانی لەسەر ئافرەتی دوو گیان وکۆرپەلە

برگەی سێیەم: زیانی شەرعی کۆمەلایەتی

برگەی سێیەم: زیانی شەرعی کۆمەلایەتی

بەندی سێیەم: هۆکاری واجب بوونی تێکۆشان لەسەر پیاو

## باسی دووەم: تێکۆشان وکاری قورس

### بەندی یەکەم: چۆنیەتی بەشداری ئافرەت لە تێکۆشان

مەرجەکانی واجب بوونی جیهادو تێکۆشان حەوتن: ئیسلام، پێگەیشتوویی، عەقل وهۆش، ئازادی، نێرینە، تەندروستی تەواو، توانای جەستەیی.[1]

بەڵگەکان لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ عائیشەی دایکی موسوڵمانان رضي الله عنها فەرمووی داوام کرد لە پێغەمبەری خوا کە رێگەم بدات بۆ جیهاد وتێکۆشان فەرمووی: ((جیهادی ئێوە حەجیماڵی خوایە)): ((جهادكن الحج)).[2]

ئەو فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا جیهاد واجب نیە لە سەر ئافرەتان، بەڵام مانای ئەوەش نیە کەوا خۆی بەخش نەکات بۆ بەشداری لە جیهاد، بە مەرجی پۆشتەیی ودوور کەوتنەوە لە تێکەڵاوی لەگەڵ پیاو. گەر ئەو مەرجانە نەبوو ئەوا حەج باشترە لەو بەشداری کردنە.[3]

خوای گەورە هەڵگرتنی شیرو تیرو چەك و بەکارهێنانیان، ئامادە بوونی لە گۆرەپانەکانی شەڕ لە سەر ئافرەتانی واجب نەکردووە، چونکە پێچەوانەی سیفەتە خۆڕسکیەکانی ئافرەتە، بەڵام باوەشی گەرم وسۆزی دایکایەتی پێبەخشیوون تا بێتە گۆرەپانی گەشەو پەروەردەی جگەر گۆشەکەی ونەوەی دواڕۆژ، هەروەها سەبرو ئارامی پێبەخشیوە تاوەکو ببێتە مامۆستاو قوتابخانەی کۆرپەکانی. بەڵام زۆر جار وڵات ڕوو بەڕووی هێرشی دوژمنانی دین و زۆردارو داگیر کەران دەبێتەوە، یان وا پێویست دەکات موسوڵمانان زۆرداران لەسەر تەختی فەرمان ڕەوایی لادەن تاوەکو بە ئازادی بانگەوازی خوا بەجێ بگەیەنن، لەو دوو کاتەدا زۆرجار لەبەر بەردەوامی شەڕو تیاچوونی ژمارەیەکی زۆری پیاوان واپێویست دەکات ئافرەتان

---

1ــــ مصطفى البغا، التهذيب في أدلة متن الغاية والتقريب- متن أبي شجاع، ص226.
2ــــ البخاري: 6- كتاب:الجهاد والسير باب: جهاد النساء الرقم:2876، 93/6.
3ــــ فتح الباري بشرح البخاري، 93/6.

بەشداری بکەن بە هاوکاری وەك: هاندان وئاو هێنان ، خزمەتگوزاری تەندروستی، بەرگری کردن لە خۆیان تاوەکو نەکەونە بەردەستی دوژمن. بەڵام ڕاستەوخۆ ئافرەت نەهاتۆتە ناو خۆ بەخشین بۆ ڕاهێنان ومەشق، کردن وکاری سەربازی و هاتنە ناو گۆڕەپانی جەنگ، چونکە هاتنە ناو ئەو کارە زیان دەبەخشێ بە تەندروستی ئەو ئافرەتە هەرچەندە خۆشی لە تەندروستی باشدا بێت، هەروەها لەگەڵ پێکهاتەی ئێسکان وجومگەو بارستەی ماسولکەو پێکهاتەی دەرونی ناگونجێ. ئەگەر ئافرەتەکەش بکەوێتە باری بێ نوێژی ومنداڵبوون وزەیستانی ئەوا تەندروستی زۆر زیاتر بەرەو ناڵەباری وپشێوی دەڕوات. ئەگەر تەماشای مێژووی ئیسلام بکەین دەبینین خێزانەکانی پێغەمبەری خواﷺ ئافرەتانی موسوڵمان بەشداری جەنگیان کردووە بەڵام بەشداریەکەیان لەو سنوورەی باسمان کرد دەرنەچووە، تەنها چەند نموونەیەکی کەم نەبێت، ئەویش ناکرێتە بەڵگەیەکی شەرعی بۆ ئەو بەشداریە.

لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: لە کاتی هەڵاتنی هەندێ لە موسوڵمانان لە شەڕی ئوحد، عائیشەو ئوم سەلەمەم دیت کەوا کراسی خۆیان توند کردبوو، گۆزەیان لەسەر شان بوو، دەچوون بە خێرایی ئاویان دەهێناو دەیاندایە شەڕکەرەکان، پاشان بە خێرایی دەگەڕانەوە دووبارە ئاویان دەهێنا.((ولقد رأيت عائشة بنت أبي بكر وأم سليم وإنهما لمشمرتان[1] أرى خدم سوتهنّ تنقزان القرب[2]. وقال غيره: تنقلان القرب على متونهما ثمّ تفرغانه من أفواه القوم. ثم ترجعان فتملآنها ثم تجيئان فتفرغانه في أفواه القوم)).[3]

---

1ــ الشَمَرُ: کورتکردنەوە، واتە خۆیان گورج وگۆڵ دەکرد بە توند کردنی کراسەکانیان وهەندێك بڵند کردنی. ابن منظور، لسان العرب، 190/7.

2ــ نقَز :ينقِز نقْزاً ونقَزاناً نِقازاً ، ونقْزاً: ڕۆیشتنی بە گورج وگۆڵ، بازدان و بڵند بوونەوە، واتە گۆزە لەسەر شان وخێرا ڕۆیشتن. ابن منظور، لسان العرب، 260/14.

3ــ البخاري:6-كتاب:الجهاد والسير، باب:غزو النساء وقتالهن مع الرجال، الرقم:2880، 96/6.

هەروەها لە ڕەبیعەی کچی مەعوذ[1] دەگێڕنەوە دەڵێت: ئێمە لە گەڵ پێغەمبەری خوا بووین لە کاتی جەنگدا، ئاومان دەدا شەڕ کەران، برین پێچیمان دەکرد، شەهیدەکانیشمان بۆ شاری مەدینە دەهێنایەوە.[2]

ئەو فەرموودانە بەڵگەی تەواون لە سەر ئەوەی کەوا بەشداری ڕاستەوخۆی ناو شەڕ بۆ ئافرەتان واجب نیە. هەروەها ئایەتی سورەتی(الزخرف) نا ڕاستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئافرەتان لە کاتی جەنگ وڕووبەڕوو بوونەوە دیار نین، چونکە پەروەردەی ناو نازو جوانی وڕازاوەیی وخشڵ وزێڕە. (أَوَ مَنْ يُنَشَّؤُا فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ)الزخرف:18.ئیبن عەباس دەڵێ مەبەستی لە (ئافرەت و کەنیزەیە).[3]

## بەندی دووەم: زیانەکانی کاری قورس لەسەر ئافرەتان

لە لایەنی پزیشکیەوە زیانەکانی کاری قورس وکاری سەربازی لەسەر ئافرەتان زۆرە بەو بەڵگانەی خوارەوە:

### برگەی یەکەم: زیانەکانی لەسەر کرداری بێ نوێژی

ڕاهێنانی وەرزشی توندو بەردەوام وچالاکی سەربازی وا دەکات ئاستی هۆرمونەکانی جینسی زیاد بکات، بەمەش کرداری زیندەچالاکی هۆرمونەکان دەشێوێ، هەروەها کاتی وەرزشی توند ئافرەت تووشی بارێکی جەستەیی ودەرونی ناجێگیر دەبێت بەمەش نیزامی بێ نوێژی مانگانەی تێك دەچێت، وەك لەو حاڵانەی

---

1ـ الربيع بنت نعوذ بن عفراء: یەکێکە لە بەشدار بوانی بەیعەی (تحت الشجرة) ، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەری خوا هەروەها لە عایشە، ئەویش گیراویەتەوە بۆ خالید کوڕی زەکوان و خەڵکی تر. ابن حجر، تهذيب التهذيب، 418/12.

2ـ البخاري:6- كتاب:الجهاد والسير، باب:مداواة النساء الجرحى في الغزو، الرقم: 2882 ،98/6.

3ـ الطبري، جامع البيان، 73/13.

خوارەوە باسیان دەكەین.

یەكەم: دواكەوتنی بێ نوێژی 'Delay menorche'.

دووەم: پشێوی لە كارو چالاكی زەردە تەن 'Luteal dysfunction'.

سێیەم: پچڕانی بێ نوێژی 'Amenorrhea'، بێ نوێژی نا ڕێك ماوە كورت تر دەبێت لە پێشتر.[1]

## بڕگەی دووەم: زیانەكانی لەسەر ئافرەتی دوو گیان وكۆرپەلە 2

یەكەم: زیانەكانی لە سەر كۆرپەلە:

1- كێشی كۆرپەلە بچوكتر دەبێت لە كێشی سروشتی خۆی
2- پشێوی بۆ كۆرپەلە دروست دەكات
3- هۆكارە بۆ دروست بوونی نەخۆشیەكانی زگماكی كۆرپەلە
4- ئازارو بریندار بوونی كۆرپەلە
5- دواكەوتنی گەشەی كۆرپەلە

دووەم: زیانەكانی لە سەر ئافرەتی دوو گیان

1- لە دایكبوونی پێش وەختە
2- ئازارو بریندار بوونی ماسولكەكان
3- پشێوی لە كاری دڵ وبۆریەكانی خوێن
4 – دابەزینی ڕێژەی شەكری ناو خوێن

## بڕگەی سێیەم: زیانی شەرعی و كۆمەڵایەتی

ئافرەت لەبەر بێ هێزی جەستەیی و بەرزی ئاستی سۆزو دڵ نەرمی، ئەگەری بەدەستەوەدان و كەوتنە بەردەستی دوژمنانی زۆرە، ئەوانەش هۆكارن بۆ ئەوەی

1 – *Kenneth. Principe of Endocrinology. P: 71, 804.*
2- *Sheldon . Complication of Pregnancy. P: 74- .75*
-*Leon Speroff. Clinical Gynecologic Endocrinology&Infertility. P: .202-200*

سوکایەتی پێ بکرێت لە لایەن دوژمنانەوە، ئەوانەش زیان وهۆکارن بۆ ئابڕو چوونی موسوڵمانان، بۆیە بەشداری کردنی واجب نیە.[1] لەو بارەیەوە جیاوازی نیە لە نێوان ئافرەتی شووکردوو، یان شوو نەکردوو، چونکە مافی ئادەمیزاد لە مافی خوا لە پێشترە لەو بارەیەوە.[2]

## بڕگەی چوارەم: زیانەکانی دیمۆگرافی

شەهید سەید قوتب دەڵێت: یەکێك لە حیکمەتەکانی خوا کەوا کوشتارو جەنگی لە سەر ئافرەتان واجب نەکردووە ئەوەیە: کاتی جەنگ ژمارەیەکی زۆر لە نێرینە دەبنە خۆراکی ئەو شەڕە، بەڵام مانەوەی ئافرەت ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە بە کرداری شوو کردن و چەند ژنی، بەڵام کاتێك نێرینەو مێینە وەك یەك ژمارەیان کەم بێتەوە بە هۆی شەڕەوە، ئەوا لا سەنگیەك دروست دەبێت لە نێوان تیاچوون و منداڵبوون. هەر بۆیە ئاینی ئیسلام لەو کاتانەدا چەند ژنی بە چارەسەرێکی گونجاو داناوە، بە هەمان شێوە لە کاتی ڕوودانی کارەسات. لە لایەکی ترەوە هەزار پیاو ناتوانن وا بکەن یەك ئافرەت بەرهەمی منداڵبوون زیاد بکات هەروەك یەك پیاو دەتوانێت، چونکە توانای ئافرەت سنووردارە، هەرساڵێ یەك منداڵی دەبێت گەر یەك پیاوی لا بێت وەیان هەزار پیاو.[3]

لە بەر ئەو هەموو هۆیانە خوای پەروەردگار ئەو جۆرە کارە قورسانەی لە سەر ئافرەتان واجب نەکردووە، تەنها لە یەك کاتدا نەبێت ئەویش کاتی داگیر کردنی وڵاتی ئیسلامە لەلایەن بێ باوەڕانەوە، لەو کاتەدا جێنشین وسەرۆکی موسوڵمانان بڕیاری دەرچوونی گشتی (النفیر العام) دەدات بۆ بەرپەرچی دوژمنان، لەو کاتەدا دەبێت نێرو مێ بەشدار بن بەبێ جیاوازی.[4]

---

1 ــ ابن العابدين، حاشية رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار، 220/3. وابن قدامة، المغني، 366/10.

2ــ ابن العابدين، رد المحتار، 220/3.

3ــ سيد قطب، في ظلال القرآن ،345/2.

4ــ الشربيني، الخطيب، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج ،219/4.

## بەندی سێیەم: هۆیەکانی واجب بوونی تێکۆشان وکاری قورس لە سەر نێرینە

**هۆیەکانی واجب بوونی تێکۆشان وکاری سەربازی و کاری قورس لەسەر نێرینە:**

1– نێرینە ئارەزووی چوونە پێش وخۆ هەڵکێشان، جورئەت ودوور بینین وبیر کردنەوەی پێش چوونە ناو کاری لە ئاستێکی بەرز دایە.

2– ئاستی هۆرمونەکانی ئەندروجین لە نێرینە 10 جارە بەرامبەر ئاستی ئەو هۆرمونە لە مێینە. ئەو هۆرمونەش هۆکاری توندو تۆڵی ماسولکە، زۆری بارستایی ماسولکە، توانای بەردەوامی کاری قورس، چوونە پێش وجورئەت، دژواری یە.

3– نێرینە بارستایی ماسولکەو هێزی زیاترە، لە ئافرەتان بارستەی چەوری زیاترە، تاوەکو بە دیمەنێکی جوان خۆی نیشان بدات.[1]

4– راهێنانی توندو بەردەوام، وا دەکات ماسولکەکانی نێرینە توندترو گەورەتر بکات، بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆرمۆنەکانی نێرینە(ئەندروجینەکان). ئەو هۆرمونەش کار ئاسانی دەکات بۆ دروست بوونی پرۆتینی ناو ماسولکە خانەکان، بەمەش ماسولکە خانەکان گەشە دەکەن وبارستەو توندوتۆڵیان زیاد دەکات. ئەو بارستە زیادیەش وا دەکات رێژەیەکی زیاتر لە شەکریگلایکۆجین دابکات(خزن) وەك سەرچاوەیەکی یەدەگی ووزە، بۆ بەکار هێنانی لە کاتی کاری قورس و بەردەوام.

5– توانای ماسولکەو جومگەو ژێیەکانی نێرینە زیاترە بۆ سوڕانەوەو مناوەرە، چونکە توندترو بەهێز ترن.

6– گەورەیی قەبارەی دڵ وسیەکان، زۆری ژمارەی خڕۆکە سوورەکان، هۆکارن بۆ زیاتر هەڵگرتنی ئۆکسجین، کاتی هێرش و تەنگانە.[1]

---

*1–Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 940 ,949.*

ئەو جیاوازیانە ئەوە ناگەیەنێ ئافرەت هەر لە ماڵ دانیشێ وهەرگیز نەچێتە دەرەوە، بەڵام مانای ئەوەیە پێویستە لە هەموو شوێنێك وكات و ساتێكدا پێویستە شوێن وكاری گونجاوی بدرێتی تاوەكو بتوانێ ڕۆڵی بەرچاوی خۆی تیا ببینێ، ئەوەك كارێكی وا بێت تیایدا سەرگەردان بێت، لە جیاتی بەدەست هێنانی سوود و قازانج، كاری سەلبیش بكاتە لە جەستەو دەرونی. هەروەك باسمان كرد كەوا چۆن ئافرەتانی موسوڵمان بەشداری هەموو كارو چالاكیەكانیان كردووە لە گشت ساتەكانی خۆشی وناخۆشی وتەنگانەو كاری سەربازی، بە ڕەچاو كردنی سنوورەكانی شەرعی و هەڵبژاردنی كاری گونجاو بۆ جەستەو دەرونیان.

لە بەر بەشداری نەكردنی ئافرەتە لە كاری سەربازیدا، پێغەمبەری پێشەوا وەسیەتی كردووە بە جەنگاوەرانی ئیسلام كاتی ڕوو بەڕوو بوونەوە لە گەڵ بێ باوەڕان، هیچ ئافرەتێك، منداڵێكی بچوك، پیاوێكی پیر نەكوژن. لە سولەیمانی كوڕی بورەیدەﷺ دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((اغزوا باسم الله وفي سبيل الله، قاتلوا من كفر بالله، لا تغلّوا ولا تعذروا ولا تجنبوا، ولا تقتلوا وليداً ولا امرأة ولا شيخاً كبيرا)).[2] ئەوەش لەبەر ئەوەی كەوا زۆربەی كات ئافرەتان جەنگاوەری سەرەكی نەبوون بۆیە كوشتنیان تاوانە.

---

1ـ ئەرك وفەرمانی ئەو هۆزمونانە وهۆزمونەكانی تر بە درێژی باسكراوە لە بەرگی یەكەم، هەر كۆمەڵەو لە بەندی وبڕگەی تایبەتی خۆی.

2ـ الطبراني، المعجم الصغير حديث رقم 341، ص148.

## باسی سێیەم: مەرجەكانی شەرع دایناوە بۆ ئافرەتی موسوڵمان كە پێویستە پیادەی بكات كاتی چوونە دەرەوەی لە ماڵ

1- تێكەڵاوی نەبوون و نەمانەوە بە تەنهایی لەگەڵ پیاوی بێگانە وكەوتنە ناو قەدەغەكراوەكان، هەر چەندە گەر ئەو شوێنە شوێنی خواپەرستی ونوێژ كردنیش بێت. ئەو كارانە هۆكارن بۆ بزواندنی ئارەزووی جینسی وڕاكێشان بۆ ناو حەرام و گوناهو تاوان.

2- پۆشتەیی وخۆ داپۆشینی تەواو بە هەموو مەرجەكانیەوە، هەروەك لە پێشەوە باسمان كرد.[1]

چوونە دەرەوە بۆ خوێندن وكار كردنی پێویست بۆ ئافرەت بۆ پەیدا كردنی بژێوی خۆی ومنداڵەكانی كاری پیرۆزن بە مەبەستی بەرەو پێشەوە چوونی كۆمەڵگەو وڵات، بەڵام نابێ ئەو شوێنانە بكرێنە شوێنی پێش بڕكێی جوانی پیشاندان، ڕازاندنەوە، بۆنی خۆش بڵاو كردنەوە، كێش كردنی هەست وئارەزووی پیاوان بۆ لای خۆیان وسەرلێشواندنیان. ئەگەر ئەو ئارەزووانە ئازاد وسەربەست كران ئەوە مەبەستی چوونە دەرەوەكە نا شرعی دەبێت، كۆمەڵگە بەرەو نەمان و تیاچوون دەبات لە جیاتی پێشكەوتن وزانست وزانیاری وبەرهەم هێنان.

3- وەرگرتنی ڕەزامەندی دایك وباوك، ڕەزامەندی هاوسەر دوای شووكردنی. یەكەمیان: وەك ڕەوشت وئەدەبێكی ئاینی بەرامبەر چاكەكانی دایك و باوك، دووەمیان: وەك واجبێكی شەرعی لەسەر ئافرەت.[2]

4- پێویستە ئەو كارەی ئافرەت ئەنجامی دەدات، كۆمەڵگە پێویستی پێ بێت، پیاوان نەتوانن بەو شێوە ئەنجامی بدەن هەروەك ئافرەتان ئەنجامی دەدەن، چونكە تایبەتە بە ڕەگەزی ئافرەتان، وەك: كاری پزیشكی ئافرەتان ومنداڵبوون،

---

1- بەرگی دووەم/ بەشی یەكەم.

2- نور الدين عتر، ماذا عن المرأة، ص139.

وانە ووتنەوەی کچان لە ئاستە جیا جیاکان، شوێنەکانی خزمەت کردنی ئافرەتی پیرو پەککەوتە. ئەوانەش لە بابی ئەو بنەما شەرعییەیە کە دەڵێت: هەر شتێك واجبێکی شەرعی پێ تەواو ببێت ئەوا خۆشی دەبێتە واجب، ئەو شتەی ڕێگە خۆش دەکات بۆ حەرام خۆشی حەرام دەبێت. بڕو زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی ئەو کارانە دەکەن بە گوێرەی پێویستی کۆمەڵگە دەبێت بۆ ئەو کارە، واتە فەرزی کیفایەیە(فرض الكفاية).[1]

5- ئەو کارە، کاردانەوەی سەلبی نەبێت لەسەر کاری سەرەکی ئافرەت لەماڵەوە، وەك: پەروەردەی منداڵ، خزمەت کردنی هاوسەرو منداڵەکانی.

6- شوێنی ئەو لە ناو کۆمەڵگەی ئافرەتان بێت، باشترە دوور بێت لە پیاوەکان.[2]

7- کارێکی زۆر قورس نەبێت، وەك ئەو کارانەی دەبنە هۆی شێواندنی دیمەن و ڕووکاری ئافرەت وکارو فەرمانی هۆرمونەکانی، یان ئەو کارانەی نەفسی مرۆڤی دروست بە ڕەوای نابینێ ئافرەتان ئەنجامی بدەن وەك: پاککردنەوەی جادەو کۆڵانەکان وبۆیە کردنی پێڵاوی خەلك لەسەر شۆستەکان.[3]

لەو چەند ساڵەی دوایی ئافرەتی موسوڵمان بەشداری زۆر لە چالاکیەکانی کردووە، بەتایبەتی لە بواری خوێندنی باڵاو تەندروستی وکۆمەڵایەتی، توانیویانە زۆر پلەی زانستی بەدەست بهێنن، لەگەڵ جێبەجێ کردنی مەرجەکانی پۆشتەیی و مەرجەکانی چوونە دەرەوە، کە ئەو مەرجانە نەبوونە بەربەرست لەبەر دەم

---

1 ــ فرض كفاية: ئەو کارەیە کە فەرزە، گرنگ ئەوەیە کەوا هەندێك لە موسوڵمانان ئەنجامی بدەن، بەبێ تەماشاکردنی ئەوانەی ئەنجامیان داوە، بەڵکو گرنگی لەوەیە بێتە دی، هەروەك نوێژی جەنازە. هێتو، محمد حسن، الوجيز في أصول التشريع الإسلامي، ص79.

2 ــ صالح فوزان، تنبيهات على أحكام تختص بالمؤمنات، ص12. البوطي، المرأة بين طغيان الغرب ولطائف الإسلام، ص 139.

3ــ الكسيس كاريل، الإنسان ذلك المجهول ، ص71.

فێربوون و چوونە پێش ودەست کەوتنی زانستی وزانیاری هەروەك دوو ڕوەکان و بەکرێ گیراوەکانی ناو وولاتانی ئیسلامی بانگەشەی بۆ دەکەن. لە هەمان کاتیشدا ئەرك وواجبی ماڵەوەشیان جێبەجێ کردووە ومنداڵەکانیشیان پەروەردەیەکی دروست کردووە.

لە کۆتاییدا بە پێویستم زانی بەشێك لە گووتەی هەندێ لە زانایان کە دەربارەی ئافرەت وکارکردنی ئافرەت نووسیویانە، هەروەها گووتەی هەندێ لە سەرکردەی بانگەوازی ئازادی و سەربەستی ئافرەتانتان بۆ باس بکەم، لەگەڵ بارەی کۆمەڵایەتی وولاتانی بەناو دیموکراسی کە تیایدا دەناڵێنن، ئەنجامەکەشی بەرەو کوێ سەر دەبات؟

پرۆفیسۆری پزیشکی ئەلیکسس کاریل دەڵێت: پێویستە ئافرەتان شوێنی کار کردنیان بگوازنەوە بۆ ماڵەوە، چونکە نێرینەو مێینە یەکسان وبەك شێوە نین، ئافرەت لە پیاو گرنگ ترو پێویست ترە لە پاراستنی ڕەگەزی ئادەمیزاد لە سەر زەوی، هەروەها پلەی ئافرەت بەرزترە بۆ پێشکەوتنی شارستانیەت، لەسەر ئافرەتیش پێویستە بەو پلەو شهادە بەرزە ڕازی بێت، نەوەك بکەوێتە شوێن پێی پیاوو چاو لێکەری ئەو بکات لە گشت شتێکدا. ئەوەش باشترە بۆ ڕەگەزی مێینە بە گشتی.[1]

زانا شوبنهور دەڵێت: سروشت لە ژیاندا بۆ ئافرەتی داناوە ڕێگایەکی هێمن ودڵ ئارام، ئەو گیروگرفتانەی نایەتە بەردەم کە دێنە بەردەم نێرینە، وەك: لە خۆبایی و دەرچوون لە ئاستی سروشتی لە زۆر لە کردەوەکانی، توش بوون بە ئازاری جۆراوجۆر، هەروەها ژیان پەیامێکی گرنگ وسەرەکی بە ئافرەت سپاردووە کە بریتیە لە پێگەیاندنی کۆرپەلە ومنداڵ لە سەرەتای تەمەنی، گەشەپێدانی هۆش وبیری، ئەو پەیامەش هەموو مانای بوونی ئافرەتە لە ژیاندا.[2]

---

1ـــ ألسيس كاريل، الإنســان ذلك المــجهول ، ص71.
2ـــ كحالة، عمر رضا، المرأة في القديم والحديث،17/1.

زانا موحەمەد فەرید وەجدی دەڵێت: هیچ ئافرەتێك ناگاتە پلەی کەمال وپێگەیشتن گەر نەبێتە دایك وپەروەردەی منداڵ نەکات، پەروەردەیەکی ڕاست و دروست. ئەوەش مانای ئەوە نیە تەنها ئەو ئەرك و فەرمانە بۆ ئافرەت دانراوە، بەڵکو هەموو هیواو داهێنان وئارەزووی ئەو کارە پیرۆزەیە، چونکە بە جەستەو دەروون وگیانەوە گونجاوە بۆ ئەم کارە.[1]

فەیلەسوفی ئەڵمانی نیتشە دەڵێت[2]: سوکایەکی (ســـخافة) زۆر هەیە لەو بزوتنەوەیە– بزوتنەوەی ئازادی ئافرەتان– سوکایەتی وگاڵتە پێکردنی پیاوەکانە بە ئافرەتان، هەموو ئافرەتێکی هەستیار وهۆشدارو پەروەردەکراوێکی دروست شەرم دەکات بچێتە ناو ئەو بزوتنەوەیە، پێویستە ئافرەت پارێزراو بێت وچاودێری بکرێت وهاوکاری بکرێت.[3]

بیتریم سارۆکین دەڵێت: ئەمریکا بە خێراییەکی زۆر بەرەو کارەساتێکی جینسی دەڕوات، بە هەمان ئەو ئاراستەیە دەڕوات کەوا ئیمپراتۆریەتی ئەغریقەکان و ڕۆمەکان پێیدا تێپەڕین بووە هۆی ڕوخانیان. ئێمە لە هەموو لایەك دەورە دراوین بە تەوژمەکی توندی فەسادی جینسی، هەموو ژوورەکانی بینایەی ڕۆشنبیری لێ داگیر کردووین، وای لێهاتووە بگاتە گشت بوارەکانی تری ژیان. ئەو شۆڕشە ژیانی هەموو نێرو مێیەکی ئەمریکی داگیر کردووە زیاتر لە هەموو شۆڕشەکانی تری ئەو سەردەمە.[4]

---

1ـ وجدي، محمد فريد، المرأة المسلمة، ص181.

2ـ نيتشە، فريدريك، 1844ـ 1900م. فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە، مەزهەبی بەرەو پێشەوەچوونی هەڵبژاردووە لە ژیان، یەکێکە لە بناغە دارێژەکانی عەقلیەتی ئەڵمانی. لە بەرهەمەکانی: هەرهەڵدانی ئەهامەتی وگیانی موسیقا، زەردەشت بەم شێوەیە دوایە. المنجد في الأعلام، ص582.

3ـ أبو خليل، شوقي، الإسلام في قفص الاتهام، ص245. نقلاً عن مجلة :المـــصور ،العدد : 1689، ص4.

4ـ بيتريم ساروكين، الثورة الجنسية، نقلاً عن : أبو خليل، شوقي، الإســلام فــي قفــص الاتهام، ص246. بيتريم ساروكين : وهو مدير الأبحاث بجامعة هارفارد الأمريكية.

نووسەری ڕوسی ئەنتوان نیمیلاف دەڵێت: بە ڕاستی هەموو کرێکارەکانمان کەوتوونەتە ناو زەلکاوی فەسادی جینسی، ئەو دیاردەیەش زۆر ترسناکە و نیزامی ئیشتیراکی بەرەو ڕوخان دەبات، بۆیە پێویستە بە هەموو شێوەیەك بەرگری لێ بکرێت، چونکە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ترسناك و بە کێشەیە. هەزارەها نموونەم لایە بۆتانی باس بکەم کەوا دیاردەی بەد ڕەوشتی وفەسادی جینسی کە بە شێوەیەکی وا بڵاو بۆتەوە و تەشەنەی کردووە بەرگە گرتنی کارێکی ئاسان نیە، چونکە تەنها لە ناو نەفام ونەزانەکان نیە بەڵکو گەیشتۆتە ناو چینی ڕۆشنبیرو سەرکردەی کرێکارەکان.[1]

هەرچەندە سەرکردەی بانگەشەی ئازادی ئافرەت ومافی ئافرەتان ئاگاداری هەموو ئەو سلبیاتانەن کەوا لە ئەنجامی ئەو بانگەوازە ڕوودەدات، لە گەڵ ئەوەشدا شەو وڕۆژ کار دەکەن بۆ تێکدانی باری خێزان وباری کۆمەڵایەتی خەڵك، بە دژایەتی کردنی ئیسلام لە لایەك وگۆڕینی یاساکانی باری کۆمەڵایەتی لە لایەکی ترەوە.

1ــ المودودي، الحجاب، ص210.

# بەشی چوارەم

## باری کەسایەتی

## (الأحوال الشخصية)

باسی یەکەم: بالاّ دەستی (سالاری) و تەلاق

باسی دووەم: چەند ژنی

باسی سێیەم: میرات

## پێشەكی پێویستە ڕەچاوی سێ خاڵ بكەین:

1- ئیسلام كاتێ باڵا دەستی بە پیاو داوە وەك ئەركێكە نەوەك خەڵات، بۆ هەڵسوڕاندنی كاروباری خێزان، لە فەرمان بە ئەنجامدان وقەدەغەكردن (الأمـــر والنهي) بەمەرجێ ئەو باڵا دەستیە بەكارنەهێنێ بۆ زوڵم كردن لە ئافرەت و لەوانەی لەبەر دەستیان.

2- پێویستە هەموو هەلێك بڕەخسێت بۆ ئافرەت تاوەكو لە میانەی ئەوەوە گەشە بە هەموو بەهرەو داهێنانەكانی خۆڕسكی خۆی بدات، لە چوار چێوەی سنوورەكانی كۆمەڵایەتی، ئەمانەش لە پێناوی خزمەتی كۆمەڵ وشارستانیەتە.

3- گەر ئافرەت گەیشتە پلەی سەركەوتن وبەرزی لە ژیان، ئەوا پێویستە ئەو ئەنجام ودەستكەوتانە لەو سنوورە بێت كە ئەو ئافرەتە، نەوەك بۆ دژایەتی پێكردن وململاتێ لەگەڵ ڕەگەزی نێرینە بێت.[1]

پەیوەندی نێوان هەردوو هاوسەرلە سەر بنەمای شەرعی ویەكسانی ئەخلاقیە. هەركاتێك پیاو ویستی ئەو باڵا دەستیەی خۆی بە خراپی بەكار بهێنێ، ئەوا یاساكانی ئیسلام بۆی لە سەنگەر وەستاون، سزای تایبەتی داناوە بۆ هەر یەكێك لە سەر پێچیەكان.[2]

---

1ـ أبو الأعلى المودودي، الحجاب، ص240.

2ـ خيرت، أحمد، مركز المرأة في الإسلام، ص81. والصالح، صـــبحي، معـــالم الـــشريعة الإسلامية، ص205.

# باسی یەکەم

## باڵا دەستی و تەڵاق

بەندی یەکەم : باڵا دەستی

بڕگەی یەکەم : هۆکارەکانی فیتری وکۆمەڵایەتی

بڕگەی دووەم : هۆکارەکانی خانەوادەیی وکۆمەڵایەتی

بەندی دووەم : تەڵاق دەست لێکبەردان (دابڕان)

بڕگەی یەکەم : بۆچی لە ئیسلامدا بڕیاری تەڵاق بە دەست پیاوە

بڕگەی دووەم : بڕیاری تەڵاق بە دەست ئافرەت بێت

## باسی یەکەم: بالاّ دەستی(سالاری)و تەلاّق

### بەندی یەکەم : بالاّ دەستی- سالاری (القوامة)

لە زمانی عەرەبی بالاّدەستی: بە واتای پارێزگاری وچاکەسازی دێت. بەواتای وەستان وخۆڕاگری وعەزیمەت دێت.[1] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾النساء: 34.﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾البقرة: 228.

پیاوان بالاّ دەستترن لە ئافرەتان: بە واتای ئەوە دێت کە کارەکانیان ئەنجام دەدەن، بژێویان دابین دەکەن، لێپرسراون بەرامبەر پاراستنی ئابڕوو، بەرگری لێکردنیان، دەبێت ئافرەتانیش فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن، بە مەرجێ سەرپێچی خوای گەورەی تیا نەبێ.[2]

لەبەر هەندێ هۆکاری خۆڕسکی وفیتری وکۆمەلاّیەتی لە پیاوان، وای کردووە پلەوپایەی بەرزتر بێت لە ئافرەتان لە هەندێ بواردا.[3]

### بڕگەی یەکەم: هۆکارەکانی فیتری وکۆمەلاّیەتی

#### یەکەم: هۆکارەکانی فیتری لە ئافرەتان

1- سۆزو بەزەیی وعاتیفە بەهێزترین فاکتەری جولانەوەی هێزو دەروونی ئافرەتە. ئەو هەستە دەروونیە قولانە شتێکی زۆر بنەڕەتی وسەرەکین لە ژیانی ئافرەت، کە خۆیان دەنوێنن لە: هەڵچوونی خێرای سۆز، خێرا وەلاّمدانەوەی

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 354/11.

2ـ الطبري، جامع البيان، 614/2-617، و 290/8. والقرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 168/5. وابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 465/1. والشوكاني، فتح القدير، الجامع بين فني الرواية والدراية في علم التفسير، 460/1. والرازي، تفسير الكبير، 88/10.

3ـ الطبري، جامع البيان، 614/2-617.

پاڵنەرەکانی دەرەکی، خێرا بەدەمەوەچوونی ڕووداوی عاتیفی. ئەگەر جڵەوی کار بدرێتە ئەو سیفەت وئارەزووانە، ئەوا دەبینین سۆزو عاتیفە زاڵ دەبێت بەسەر گشت کارو بڕیارەکان، هەر بۆیە زۆربەی ئافرەتان میزاجیان هەڵبەزین ودابەزینی زۆری تیایە، (تەبع)یان نا جێگیرە، ئارەزوویان جۆراو جۆرە.

هەروەك لە بەشی سێیەم بەدرێژی باسی سیفەتە سەرەکیە دەرونیەکانی ئافرەتمان کرد کە بریتی بوون لە: نەرمی، سۆزو بەزەیی، خێرا هەڵچوون، خۆگونجان وملکەچی، ئامێزگرتنەوە بۆ هاوکاری، خۆبەخشین، دوورەپەرێزی.[1] هەر ئەو سیفەتانەش بوونەتە پاڵنەرێك بۆ دروست بوونی هەستێکی دەرونی قووڵ کە هەردەم پێویستی بە هاوکاری پیاوو چاودێری ئەو هەیە.

2- بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هۆرمۆنی مێینە، گۆڕانی ڕێژەی ئەو هۆرمونانە بە بەردەوامی لە کاتی بێ نوێژی وسك پڕی ومنداڵبوون وزەیستانی، لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریە جەستەیی ودەرونیانەی ڕوودەدات بە هۆی گۆڕانی ڕێژەی ئەو هۆرمونانە، وای کردووە ئافرەتان بەگشتی: میزاج گۆڕاوو کەم خۆڕاگرو کەم بەردەوام بن لە سەر کارو پڕۆژەکانیان.

3- ئەو سیفەتانە شتی ڕوکاری وبێ بایەخ نین لە ژیانی ئافرەتان هەروەك هەندێ لە خەڵکان وای تێدەگەن، بەڵکو ڕەگ وریشەی بەناخ ودەرون و جەستەی ئافرەتدا ڕووچووە، چووەتە ناو قووڵایی پێکهاتەی یەکەم خانەی ژیانی ئافرەت کە هێلکەی مێینەیە، چۆن کاتی هاتنە خوارەوەی بۆ ناو بۆڕی هێلکەدان ومنداڵدان دەبیبینین دەورەدراوە بە ژمارەیەك لە خانەی پارێزەرو ڕێگە نیشاندەر تاوەکو دەگاتە شوێنی تایبەت ودیاری کراو وگەیشتن بە هاوبەشی ژیانی. ئەو سیفەتە خۆڕسك وفیتریانەی کە باسکران دەربارەی ئافرەت نیشانەیەکی ناپەسەندو نامۆ نیە بە ئافرەتەوە لکابێ، بەڵکو دروشم ونیشانەی هەموو ئافرەتێکی بەرزو ڕەوشت جوان ودروستە.

---

1- بەرگی یەکەم/ بەشی سێیەم، باسی یەکەم.

## ب- هۆکارەکانی فیتری لە پیاوان

1- پیاو لە خۆڕسکەوە توندو کردەوە زیرە، سیفەتی چەسپاوی بەرگری هەیە، ئارەزووی چوونە پێش وڕووبەڕووبوونەوەی هەیە، خاوەن عەزیمەیەکی توندە، کەم هەڵدەچێ و وەلامدانەوەی لەسەرەخۆیە، میزاجی نەگۆڕە، بیرو هۆش بەکار دەهێنێ لە جیاتی سۆزو عاتیفە پێش وەلامدانەوە وهەنگاونان بۆ کاروکاردانەوە. ڕێژەی هۆرمۆنەکانی نەگۆڕە. ئەو سیفەت وسیمەتانە لەناخ ودەرون وپێکهاتەی نێرینە ڕووچووەو لەگەڵیدا ڕاهاتووە.[1]

زۆربەی زانایان ئەو باڵا دەستیەی پیاوان کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە دەگەڕێننەوە بۆ ئەو هۆیانەی خوارەوە:

2- ئەو سیفەتانەی کە لە پیاودا هەیە، وەك: زیادەی هێزو عەزیمەت وهزر، زیاتر کارکردن بە بیروهۆش وتێڕوانینی ئەنجامەکان ودوور ڕوانین. ئەو سیفەتانەش خوای گەورە بەخشیویەتی بە نێرینە بۆ کەس نیە ڕەخنەی لێ بگرێ، کەسیش ئەو توانایەی نیە ئەو سیفەتانە لە نێرینە زەوت بکات ولێی داماڵێ پێش لە دایك بوون یان دوای لە دایك بوون، چونکە گۆڕانی بڕو ڕێژەی هۆرمۆنەکان کارێکی وا سووك و ئاسان نیە هەروەك نەفامەکان زۆرجار بیری لێ دەکەنەوە.[2]

3- خوای گەورە لەسەر پیاوی داناوە: پەیداکردنی بژێوی ماڵ، خەرجی ماڵ، مارەیی ئافرەت[3]، لێپرسراویەتی دابین کردنی خواردن وپۆشاك وشوێنی حەوانەوە(هەندێ لە مەزهەبەکانی ئیسلام جگە لەوانە خزمەتکاریشی بۆ زیاد کردووە)[4]. ئەو کارو فەرمانانە لەسەر ئافرەت لادراوە، ئایا ئەوە ڕێزگرتنە یان نا یەکسانی وسوکایەتی پێکردنە.

---

1ـ بڕوانە: بەرگی یەکەم/ بەشی سێیەم، باسی یەکەم.

2ـ النسفي، أبو البركات، تفسير النسفي- مدارك التنزيل وحقائق التأويل، 313/1. والرازي، تفسير الكبير، 88/10.

3ـ الجزائري، أبو بكر جابر، فصل الخطاب في المرأة والحجاب، ص 25. والخصاف، أدب القاضي، ص651 .

4ـ الغزالي، أبو حامد، الوجيز، 111/2. وابن قيم، زاد المعاد، 55/1.

4- نەگۆڕی وهاوسەنگی هۆرمۆنەکانی لە کاتە جیاجیاکانی ژیان، وای کردووە پیاوان زیاتر خۆڕاگرین لەسەر کار، فەرمانەکانیان بەجێ بگەیەنن بە بەردەوامی و لە داهێنان وهێنانە بەرهەم بالا دەست تر بن. هەر ئەو هۆکارەشە وای کردووە نێرینە زیاتر متمانە بە خۆی بکات وپشت بە خۆی ببەستێ.

5- بە درێژایی مێژوو بارو گوزەرانی خەڵك وکۆمەڵگە هەر وا ڕۆیشتووە کە نێرینە پارێزگاری مێینەو نەوەکانی بکات، کاروباری ژیانیان بۆ دابین بکات و بەڕێوەی ببات.

## بڕگەی دووەم: هۆکارەکانی خانەوادەیی وکۆمەلایەتی

1- پیاو پێویستە لەسەری بژێوی خێزان و منداڵەکان پەیدا بکات، هەرچەندە گەر ئافرەتەکە دەوڵەمەندیش بێت، ئەوەش هۆکارێکە وای کردووە کە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت وگوێڕایەڵی بکرێت.[1] دەربارەی گرتنە دەست ولێپرسراویەتی کاروباری ماڵ لە زۆربەی یاساکانی نوێی وولاتاندا هاتووە: (ئەوەی خەرجی بگرێتە ئەستۆ ئەو لێپرسراویەتی وەردەگرێ، ئەوەی خەرج دەکات ئەو چاودێری دەکات).[2] ئەو یاسایانەش زۆر لەیەکچووە لە گەڵ یاساکانی ئیسلام.

2- ئافرەت لە ڕووی دەروونیەوە ئارەزومەندە کە یەکێك کاروباری ماڵی بۆ بەڕێوە ببات، گەر خۆی بەتەنها دیت لە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵ ئەوا هەست بە خەم وپەژارەو بێ کەسی ودابڕان دەکات. هەر لە ژیانی ڕۆژانەمان زۆرجار دەبیستین ئافرەتان گلەیی لە هاوسەرەکەیان دەکەن کە ناتوانن کاروباری لێپرسراویەتی ماڵ بە شێوەیەکی جوان و ڕێك بەڕێوە ببەن، گەر ئەو شعورو ئارەزووە فیتری یە نەبوایە، ئەوا دەبوایە ئافرەتان لەکاتی کەمتەرخەمی پیاوان گلەییان نەکردبایەو خۆیان ڕاستەوخۆ بێ دواکەوتن ئەو ئەرکەیان بگرتایە ئەستۆ.

3- دیارترین وجوانترین سەلماندنی ڕاستی فەرمانەکانی ئیسلام ونەفامی وکورت

---

1ـ الشربيني، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، 432/3 .

2 ـ الوافي، علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام، ص52.

بینی دوژمنانی ئەوەیە: دەبینین لە گشت ئاستەکانی سەرۆکایەتی، ئاستی بەڕێوەبەرایەتیەکان وسەرکردەی لەشکرو سوپایەکانی جیهان، بە شێوەیەکی گشتی لە ئەستۆی پیاوانە. لەکاتی شەڕو تەنگانەشدا ئافرەتان هیوایانە پشت ببەستن بە پیاوانی خاوەن عەزیمەت وهەڵمەت وخۆ ڕاگر. واتە بالا دەستی پیاو ولێپرسراویەتی بە ڕێوەبردنی کاروباری ماڵ ڕاستیەکی نەگۆڕو چەسپاوە، کەسێك نکۆڵی لێ ناکات تەنها یەکێکی لەخۆ بایی بوو، دوور لە واقیع ونەزان بە کاروباری ژیان ومێژووی مرۆڤایەتی.

4- هێزوبازوی پیاو لە هەموو کات وساتێکدا جێگەی سەر سوڕمانی ئافرەتان بووە، هەروەك لە قورئانی پیرۆز باسی چیرۆکی هەردوو کچەکەی شوعەیب دەکات لەگەڵ پێغەمبەر موسی(علیه السلام)﴿ قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾القصص: 26

5- ئەو منداڵانەی گەشە دەکەن لەناو ئەو خێزانانەی کەوا سالاری لەدەست پیاودا نیە، چ بەهۆی بێ هێزی بێت، یان بەهۆی کۆچ کردنی، کەم لە منداڵەکانی گەشەیەکی دروست و تەواو دەکەن، زۆربەیان ئارەزووی بەلای لادان ودەرچوون دەکەن لە بنەماکانی کۆمەلایەتی ، کاریگەری دەروونی سەلبی لە کاروکردەوەکانیان دەردەکەوێت.[1]

خوای گەورە بەرنامەی سالاری و بالا دەستی ماڵی داناوە بۆ پاراستنی یاساو ڕێسای کۆمەلایەتی، پاراستنی خووڕەوشتی خێزان ودوور خستنەوەی کۆمەڵگە لە پشێوی ولێك هەڵوەشاندنەوەو خزان بەرەو فەسادو فیتنەی ناوەکی ودەرەکی. خوای گەورە ئەو ئەرکە قورسەی بە پیاو سپاردووە بۆ دابین کردنی ژیانێکی ئاسوودەو خۆش وکامەران بۆ گشت ئەندامەکانی، بەرامبەر ئەوەش لەسەر ئەوانی پێویست کردووە گوێ ڕایەڵی وملکەچی بکەن لە چوار چێوەی بەرنامەی تایبەت.

1ـ سيد قطب، في ظلال القرآن ،651/2.

مرۆڤایەتی تووشی نەهامەت وگیروگرفتی زۆر هاتووە لە ئەنجامی دەرچوون ئەو یاسا خواییانە، وای لێهاتووە پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز لە مالَ تەنها بۆ بەسەر بردنی کات وتێرکردنی ئارەزووە ئاژەڵیەکانە هەر وەك لە ئەوروپا دەبینین.

پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین پلەی سالاری وبالاّ دەستی کە دراوەتە پیاو پلەیەکی تەشریف وڕێزگرتن نیە، بەڵکو بریتیە لە پلەی ئەرك وڕاپەراندنی کاری جۆراو جۆرە، ئەوەش واتای ئەوە ناگەیەنێ کەوا ئافرەت هەموو مافێکی لێ زەوت کراوە، نابێ هیچ کارێك بکات بەبێ فەرمانی پیاو، لە کۆتاییدا هەر ڕای پیاو کاری پێ دەکرێت، بەڵکو زۆربەی ئەرکەکانی پیاو لەماڵ بریتیە لەئامۆژگاری و چاودێری و ئاراستەکردن بۆ کارە چاك و باشەکان.

## بەندی دووەم: تەڵاق (دابڕان)

پەیوەندی نێوان هەردوو هاوسەر لە سێ بنەمای سەرەکی بەندە، هەروەك ئەو ئایەتە پیرۆزە نیشانەی بۆ دەکات: ئاسوودەیی، خۆشەویستی، بەزەیی.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الروم:21.

ئاینی ئیسلام دەرگای دابڕان وتەڵاقدان ناکاتەوە لەگەڵ دروست بوونی یەکەم کێشە لە نێوان هەردوو هاوسەر، ئەوەش بۆ ئەوەیە تاوەکو بناغەی خێزان توندو تۆڵ بێت ولەگەڵ یەکەم پشێوی وکێشە نەکەوێتە لەرزین وداڕمان وتەپین. بەڵکو ئاینی ئیسلام هەندێ ڕێگەی تر دەگرێتە بەر بۆ چارەسەری کێشەکانی خێزان پێش دابڕان.

ئەو ڕێگەچارانەش بۆ ملکەچ کردنی ئافرەت، یان سووکایەتی پێکردن نیە، بەڵکو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەر هەڵدانی سەرەتاکانی لێك زوێربوون ولێك جیابوونەوەیە، دەست بەسەراگرتنی هەموو لادانێك دەکات کە ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێت بێتە

هۆی داڕووخانی خێزان. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّۖ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ النساء: 34-35.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات یەکەم هەنگاو بریتیە لە ئاگادارکردنەوەو سەرنج ڕاکێشان و ئامۆژگاری. ئەوەش بە تاوتۆکردنی کێشەکە بە شێوەیەکی جوان دێتە دی، بەکارهێنانی حیکمەت ونەرمی، تاوەکو کارەکان دەگەڕێنەوە شوێنی ئاسایی خۆیان. هەنگاوی دووەم بریتیە لە خەوتن لەیەك جێگە، بەڵام پشتی تێ دەکات و ڕوی خۆی ناداتێ. هەنگاوی سێیەم: لێدان بۆ ئەو ئافرەتانەی کە هیچ هۆکارێکی تر سوودی نیە لەگەڵیان، یان ئەوانەی تەنها هیوایان ئەوەیە بە ئارەزووی خۆیان هەنگاو بنێن و خۆی باڵا دەست بکات بۆ گەیشتن بە ئارەزووە نادروستەکان و ئەنجامدانی کارە سەرپێچی کەرەکانی.

مەرجەکانی لێدان بریتیە لە لێدانێکی نەرم، نەگاتە پلەی ئازار پێگەیاندنی گەورە. ئیبن عەباس ﷺ لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێ: (لیێ دوور کەوتنەوە لە خەوتن، گەر گەڕاوە باری ئاسایی باشە، گەر نا لێدانێکی بێ ئازار، گەر شکانی ئێسکانی تیا بوو ئەوا دیەی لەسەرە، قەتادە دەڵێ: نابێ لێدانی تۆڵەسەندنەوەو سوکایەتی پێکردن بێت). هەروەها نا بێت لە بەر چاوی منداڵەکانی، یان بەرچاوی خەڵك بێت، یان خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە، چونکە ئەوانە هۆکارن بۆ بەردەوام بوونی لەسەر سەرپێچیەکانی.[1]

1ـ الطبري، جامع البيان، 96/4.

هەنگاوێکی تر ئەوەیە گەر ئافرەت ترسا لەوەی هاوسەرەکەی پشتی تێ بکات و پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنێ و مافەکانی پێ شێل بکات، ئەوا بانگی دوو دادوەر دەکرێت، یەکێك لەلایەن خزمانی ئافرەتەکەو ئەوی تر لەلایەنی خزمانی پیاوەکە، تاوەکو دەست نیشانی سەرچاوەی و بنەڕەتی کێشەکە بکەن ولادەرو سەرپێچیکەر دیاری بکرێت، لەگەڵ بڕیاردانی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکە.

تەڵاق قۆناغی کۆتاییە لە پەیوەندی هاوسەریەتی نێوان هەردوو ڕەگەز، ئەویش دوای سەرنەکەوتنی هەنگاوەکانی تر دێت بۆ بەیەك گەیاندنی دڵەکان وکۆکردنەوەی ئەندامانی خێزان هەروەك باسمان کردن، ژیانی نێوانیان وەك دۆزەخی لێهات وچیتر ناتوانن لەگەڵ یەکتری بژین، ئەوکات تەلاق وەك چارەسەرێکی مام ناوەندی وبەشێوەیەکی پلە بەندی دەگیرێتە بەر. ئەو پلە بەندیەش بۆ ئەوەیە تاوەکو بواری پەشیمان بوونەوەی تیابێ هەرکات هەردوو هاوسەر لێك جیا بوونەوە بۆ ماوەیەك وژیانی تەنهاییان بینی، لەوانەیە لە ڕەفتارەکانی پێشتریان پەشیمان دەبنەوە.
هەروەك ئاگادارن لە فیقهی ئیسلامی تەلاق جۆری زۆرەو لقی زۆریشی لێدەبێتەوە بە گوێرەی کات وئەو زروفەی تەڵاقەکەی لێ دراوە وەك: تەڵاقی بیدعی، تەڵاقی سوننی، ڕەجعی...هتد.[1]

لە ئیبن عومەر دەگێڕنەوە دەڵێت، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی ﷺ :((ابغض الحلال إلى الله الطلاق)).[2] واتای ئەوەیە کە خوای گەورە ڕقی لێیەتی تاوەکو زیاتر لێی دوور بکەونەوە، نەوەك لەبەر ئەوەیە کە حەڵاڵ نیە.[3]

---

1ـ طلاق السنة:( هو أن يطلق الرجل امرأته طلقة واحدة في طهر غير مجامع فيه، أو يطلقها وهي حامل. والبدعة: هوأن يطلق الرجل امرأته ثلاث طلقات في لفظ واحد، أو يطلقها وهي حائض، أو يطلقها في طهر جامعها فيه. والرجعي: هو الطلاق الذي يقعه الزوج على زوجته التي دخل بها حقيقة ايقاعاً مجرداً عن أن يكون في مقابلة مال). متن أبي شجاع، التهذيب، ص173.

2ـ سنن ابن ماجه: كتاب الطلاق: الرقم: 2018، 650/1.

3ـ الهيتمي، تحفة المحتاج، 423/3.

## برگەی یەکەم: بۆچی لە ئیسلامدا بڕیاری تەڵاق بە دەست پیاوە

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەو هۆیانەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:

**یەکەم: هۆیەکانی فیتری(خۆڕسکی)**

1- هەڵچوونی خێرای سۆز، خێرا وەڵامدانەوەی پاڵنەرەکانی دەرەکی، خێرا چوون بەدەمەوەچوونی ڕووداوی عاتیفی. بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هۆرمۆنی مێینە، گۆڕانی ڕێژەی ئەو هۆرمونانە بە بەردەوامی لە کاتی بێ نوێژی وسک پڕی ومنداڵبوون وزەیستانی، لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریە جەستەیی ودەرونیانەی ڕوودەدات بە هۆی گۆڕانی ڕێژەی ئەو هۆرمونانە، وای کردووە ئافرەتان بەگشتی میزاج گۆڕاوو کەم خۆڕاگر بن بەرامبەر ڕوداوەکان. بەردەوام بن لە سەر کارو پڕۆژەکانیان.

پیاو لە خۆڕسکەوە سیفەتی چەسپاوی هەیە، خاوەن عەزیمەیەکی توندە، کەم هەڵدەچێ و وەڵامدانەوەی لەسەرەخۆیە، میزاجی نەگۆڕە، بیرو هۆش بەکار دەهێنێ لە جیاتی سۆزو عاتیفە پێش وەڵامدانەوە هەنگاونان بۆ کاروکاردانەوە. ڕێژەی هۆرمۆنەکانی نەگۆڕە.[1]

2- هەروەك چۆن لە ژیانی هێلکەو سپێرمدا بینیمان کەوا هێلکە خۆی ڕازاندۆتەوەو لە شوێنێکی تایبەت چاوەڕوانی نێرینە دەکات، بەڵام سپێرم لە پۆیشتن وگەڕان بە دوای هێلکەیە، ڕێگایەکی دوورو درێژ دەبڕێت تاوەکو دەگاتە ئامانجی، هەروەها لە ژیانی دونیادا هەمان دیمەن خۆی دووبارە دەکاتەوە، ئافرەت لە ماڵی باوکی لەناو کەس وکاری دانیشتووەو پیاو دێت بۆ خوازبێنی، لەگەڵ گرتنە ئەستۆی هەموو خەرجی و پێداویستی ژیانی هاوسەریەتی(شوێنی حەوانەوە، بژێوی ڕۆژانە، چاودێری وپارێزگاری..هتد)، بۆیە بڕیاری سەرەکی کۆتایی هێنانی ژیانی هاوسەریەتی دەبێت بەدەست پیاو بێت. چونکە باری قورس وگران لە سەرەتاو کۆتایی ژیانی هاوسەریەتی لەسەر ئەوە. مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی وا هاتووە، تەنها لە هەندێ باری تایبەت نەبێت کە لە دواییدا باسی دەکەین.

---

1- بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم، باسی دووەم. هەروەها بەرگی یەکەم/ بەشی سێیەم، باسی یەکەم.

3- پیاو هەست بە لێ پرسینەوەی کۆمەڵایەتی وئابووری دەکات کاتێ کە ژیانی هاوسەریەتیەکەی سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، هەست بەوە دەکات ڕۆڵی باوکایەتی وچاودێری وسەرپەرشتی وون دەکات ولە دەستی دەدات بۆیە وا بەئاسانی بڕیاری تەلاق نادات.[1]

دووەم: هۆیەکانی خێزانی وکۆمەڵایەتی

1- هەرکاتێ ئافرەت ڕەزامەندی خۆی دا لەسەر ژیانی هاوسەرێتی، ئەوا پیاو هەموو پێداویستیەکانی ژیانی خێزان دابین دەکات، ئەمەش نا ڕاستەوخۆ وا دەگەیەنێ کەوا ئافرەت ڕەزامەندی هەیە لەسەر ئەوەی پیاو جلەوی کاروباری خێزان بگرێتە ئەستۆ، هەروەك بەدەنگەوەچوونی فیترەو بەرژەوەندی کۆمەڵگە.[2]

2- کاتی دابڕان وجیابوونەوە ئافرەت هیچ پاڵەپەستۆیەکی ئابووری وکۆمەلایەتی ناکەوێتە ئەستۆ، بەڵام پیاو زۆر جۆر لە غەرامەی ئابووری دەکەوێتە ئەستۆ، وەك:

أ- ئافرەت مافی مارەیی دواخراوی دەکەوێت.

ب- ئافرەت مافی شوێنی حەوانەوەو خەرجی دەبێت تاوەکو بەسەرچوونی ماوەی عیدە.[3]

ج- خەرجی شیردانی منداڵ ولە ئامێز گرتنی منداڵ دەکەوێتە ئەستۆی پیاو.[4]

د- دابین کردنی خەرجی و پێداویستیەکانی پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتی نوێ لەلایەن پیاوەکەیە.

ئەم هەموو زیانە ئابووریانەی کە دەکەوێتە ئەستۆی پیاو، وادەکات پەلە نەکات لە بڕیاری تەلاقدان.

---

1ـ عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص254.
2ـ البوطي، المرأة بين الطغيان الغربي ولطائف الإسلام، ص59.
3ـ المرغيناني، الهداية ، 44/2.
4ـ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن ،197/3.

## برگەی دووەم: بڕیاری تەڵاق بە دەست ئافرەت بێت

ئاینی ئیسلام ڕێگە دەدات تەڵاق بەدەست ئافرەت بێت بەیەکێك لەو شێوانەی خوارەوە:

1- (ئافرەت لەکاتی مارەکردندا مەرجی ئەوەی هەبێ کە تەڵاق بە دەست ئەو بێت، پیاوەکەش پەسەندی بکات وموافق بێت).[1]

2- یان پیاوەکە بە ئافرەتەکە بڵێت: (دەتوانی خۆت تەڵاق بدەیت هەرکات ویستت، یان ووتی: بڕیاری خۆت بەدەست خۆتە هەرکات ویستت ودیاریت کرد).[2]

3- ئافرەت دەتوانێت بەهۆی قازی ودادگا خۆی بەتەڵاق بدات بەهۆی بەند بوونی، وون بوونی، دوور کەوتنەوەی هاوسەرەکەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن.

---

1ـ ابن العابدين، الرد المختار، 485/2 . وابن الهمام، الفتح القدير شرح الهداية، 116/3.
2ـ المرغيناني، الهداية ، 243/2.

# باسی دووەم

## چەند ژنی

بەندی یەکەم : جینس پێویستیەکی بایولوجیە

بەندی دووەم: هۆیەکانی زیادی ژمارەی ژنانان لە ژمارەی پیاوان

بەندی سێیەم: حیکمەتی چەند ژنی

برگەی یەکەم: هۆکارەکانی کۆمەڵایەتی و کەسایەتیەکان

برگەی دووەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە کۆمەڵگەو دەوڵەت

## باسی دووەم: چەند ژنی

### بەندی یەکەم: کرداری جینسی وەك پێویستیەکی بایۆلۆژی

مێژووی نیزامی چەند ژنی لە کۆنەوە باو بووە لە ناو زۆر لە کۆمەڵگەکان، دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ پێش ئیسلام وەك: عیبریەکان، گەلی سلافیەکان، عەرەبی جاهیلی، گەلی جەرمانیەکان، هەروەها ئێستاش هەرباوە لە ناو زۆر لە گەلانی تر کە باوەڕیان بە ئیسلام نیە، وەك: هەندێك لە گەلانی کیشوەری ئەفریقیا، ژاپۆن، هیندستان. لە ناو ئەو گەلانە فرە ژنی باو بووە(واتە ژمارەیەکی زۆر، کە پتر لە 10 دەکات).[1] کەواتە چەند ژنی ئاینی ئیسلام داهێنەری نەبووە، بەڵکو ڕێگەی پێداوەو سنوور داری کردووە(لە فرە ژنی بۆ چەند ژنی، دیاری کردووە لە چوار زیاتر نەبێ) لە گەڵ دانانی مەرجی تایبەت بۆی. ڕێگە پێدانی ئیسلام بە چەند ژنی لەبەر زۆر هۆکار بووە کە وای کردووە هەر دەبێ ببێ، تاوەکو ڕەوڕەوەی ژیانی مرۆڤایەتی پشێوی وکێشەی کۆمەلایەتی وتەندروستی تیا بلاو نەبێتەوە.

ئیمامی قورتبی دەڵێ: (کەواتە ئیسلام چەند ژنی دانەهێناوە وەك فەرمانێك و واجبی کردبێت، بە چاك وباشەش لەقەلەمی نەداوە، بەڵکو تەنها حەلاڵی کردووە، تاکە ژنی بە چاکتر داناوە چونکە نزیکترە لە ڕاستی ودادوەری، دوورکەوتنەوەیە لە هەژاری بە هۆی زۆری منداڵ هەروەك ئیمامی شافیعی هەمان ڕای هەیە).[2]

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴾ النساء: 3.

---

1ـ سید سابق، فقه السنة، 122/2. وەری گرتووە لە کتێبی (حقوق الإنسان في الإسلام) علي عبد الواحد الوافي،.

2ـ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 21/5-22.

ئەو کاتەی ئاینی ئیسلام حەلاڵی کرد بۆ پیاو کە چوار ژن بهێنێ، ئەوا هەندێ مەرجی بۆ داناوە، لەوانە:

1- دادوەری بکات لە نێوانیان لە خواردن وخواردنەوەو جێگەی حەوانەوەو خۆشەویستی وهاتووچۆ.

2- توانای بژێوی ئافرەت ومنداڵەکانی هەبێ.

3- توانای پاراستنی پاکی وئابڕووی ئافرەتەکانی هەبێ.[1]

ئەگەر پیاو نەیتوانی ئەو مەرجانە بەجێ بگەیەنێ ئەوا بۆی باشترە یەك خێزانی هەبێ، تاوەکو تووشی زیانی کۆمەڵایەتی وئەدەبی وئابووری نەبێت.

چالاکی جینسی یەکێکە لەپێویستیەکانی ئادەمیزاد، تاوەکو هەندێك لەوئەندام و ئورگانانە کاری فسیۆلۆژی خۆیان جێبەجێ بکەن. جگە لەوەش چالاکی جینسی تەنها پێویستیەکی بایۆلۆژی نیە، بەڵکو پێویستیەکی دەرونی وکۆمەڵایەتیشە، لە هەمان کاتدا تێر بوونی یەکێك لە ئارەزووە فیتریەکانە. هۆکاری دەرونی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕن لە هەڵچوون ودامرکاندنەوەو شەهوەی جینسی، ئەگەر یاساو سنووری بۆ دیاری نەکرێت ئەوا لادان و دەرچوونی پێوە دیار دەبێت لەگەڵ ئەو کێشانەی کە بە دوایدا دێن. کەواتە چالاکی جینسی هەر تەنها پێویستیەکی فسیۆلۆژی یان تێرکردنی ئارەزوو نیە، بەڵکو هۆکاری پاراستنی نەوەکانە، نەهێشتنی پشێوی دەرونیە، بناغەی دروست بوونی خۆشەویستیە، فراوانکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە، سەرچاوە و بناغەی پێکەوەنانی ماڵ و ماڵداری و ئابووریە. لەبەر بوونی ئەو پەیوەندیە توندەی نێوان چالاکی جینسی و بوارە کۆمەڵایەتیە جیاجیاکان، بۆیە دەبێت هەر بڕیارێك دەربارەی ئەو بابەتە کە دەدرێت ڕەچاوی هەموو لایەنە کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری وئاینی ئەو کۆمەڵگەیە بکرێت .[2]

---

1ـ الطبري، جامع البيان، 315/3. والرازي، تفسير الكبير، 172/9. والزمخشري، الكشاف، 496/1.

2ـ السامرائي، هاشم جاسم ، المدخل في علم النفس، ص85-86.

بۆ تێر بوونی ئەو ئارەزووە جینسیە فیتریە، فسیۆلۆژیە، بایۆلۆژیە، دەروونیە، کۆمەڵایەتیە، ئاینی ئیسلام ژن هێنان وپێکەوەنانی خێزانی داناوە وەك ڕێگایەکی ڕاست ودروست. هەموو پەیوەندیەکانی تری جینسی حەرام کردووە، وەك: زینا، نێربازی، پەیوەندی جینسی لەگەڵ ئاژەڵ، پەیوەندی جینسی لە نێوان دوو ڕگەزی لەیەکچوو...هتد.[1]

## بەندی دووەم: هۆکارەکانی زیادبوونی ڕێژەو تەمەنی ژنان بەبەراورد لەگەڵ پیاوان

1– نێرینە زیاتر ئارەزووی بەلای خواردن وخواردەمەنی شیرینە، باجی ئەو جۆرە خواردنانەش بریتیە لە نەخۆشیەکانی دڵ وشەکرەو بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن ونەخۆشی موولوولەکانی خوێن.

2– ڕێژەی جگەرە کێشان ومەی خواردنەوە لە پیاوان زیاترە لە ژنان لە زۆربەی وولاتانی جیهان دەگاتە 1:2.

3– ئافرەتان لە تەمەنی زاوزێ کەمتر تووشی نەخۆشی دڵ دەبن بەهۆی بوونی هۆرمونی ئیسترۆجین، کە وادەکات ڕێژەی کولیسترول چڕی بەرز زیاد بکات لە ناو خوێن (ئەو جۆرە کۆلیسترۆلە بەرگری لە تەسك بوونەوەو گیرانی بۆڕیەکانی خوێن دەکات).

4– زۆربوونی کێشەو شەڕوشۆڕ لە جیهاندا، کە سووتەمەنیەکەی ئاسن وپیاوە. وا مەزەندە دەکرێت تاوەکو یەك ئافرەت تیادەچێت، 4000 پیاو تیا بچێت. لەو کاتەی چەند هەزار ئافرەتێك لە جەنگی جیهانی دووەم لەناو چوون، ئەوا نزیکەی 55 ملیون پیاو لەناوچوون.[2]

---

1ــ الصابوني، محمد علي، روائع البيان في تفسير آيات الأحكام، 2/40-45. وسيد السابق، فقه السنة، 2/94. وموسى،محمد يوسف، أحكام الأحوال الشخصية، ص120. وعويس، عبد الحليم، نظام الأسرة في الإسلام، ص201-202..

2ــ الخشت ، محمد عثمان، ليس الذكر كالأنثى، ص115.

5- زۆر ئەو کێشەو نەخۆشی وکارە ترسناکانەی کە پیاوان تووشی دەبن لە ئەنجامی کار کردن لە کارگەکانی پیشەسازی وکانەکانی خەڵوزو، کارە قورسەکانی وەك: ئاگر کوژاندنەوە، بەرگری میللی، کەشتیەوانی، ئاوەدان کردنەوە، ژێر دەریاوانی...هتد.

6- چونکە نێرینە زیاتر ئارەزووی بەلای دژایەتی وبەربەرەکانی وململانێ و وەرزشی توندە، بۆیە توشی جۆرەها کارەسات و ڕووداو مردن دەبن.

7- پیاوان کەمتر بە دوای چارەسەری خۆیان دەگەڕێن کاتێ تووشی نەخۆشی دەبن وەك خۆ بە گەورە زانینێك، یان دیار نەکەوتن بە بێ هێزی و لاوازی بەرامبەر بەخەڵکان، یان متمانە بە خۆ بوون و پشت نە بەستان بە کەسانی تر. بەرامبەر ئەوەش ئافرەت زۆر سەردانی پزیشك دەکات و چاودێری تەندروستی خۆیەتی. لە بەرگی یەکەم باسمان کردووە.[1]

8- هەروەك لە بەرگی یەکەم باسمان کرد هەموو کرۆمۆسومەکانی جەستەیی وەك یەکن، تەنها کرۆمۆسومی جینسی(x&y) نەبێ کە یەکیان زۆر گەورەیە ئەویش کرۆمۆسومی مێینەیە وئەوی تریان زۆر بچوکە کە کرۆمۆسومی نێرینەیە. زانایان وای بۆ دەچن کەوا هەردوو کرۆمۆسومی جینسی کاتی خۆی یەك قەبارە بوون و لەیەکچوون (وەك دوو جمك وابوون)، لە زۆر شوێن ئەو دوو کرۆمۆسومە بەیەکەوە لکابوون (التأشب - Recombination) (ئەو پێکەوە لکانە هاوکارە بۆ مانەوەی کرۆمۆسومەکان، ئەگەر خاڵی پێکەوە لکان نەما ئەوا کرۆمۆسۆمە بچوکەکە هەر بوونی نامێنێ). زانایان ئێستا دۆزیویانەتەوە کەوا 95٪ ی کرۆمۆسۆمی نێرینە"y" پێکەوەلکانی نەماوە لەگەڵ کرۆمۆسومی مێینە" x"، هەرئەوەشە وای کردووە هەندێك لە جینەکانی سەر کرۆمۆسومەکانی ئەو ناوچانەی پێکەوە نەلکاون لە شوێنی خۆیان بجولێن وهەڵبەزنەوە بۆ شوێنی تر، ئەم کردارە پێی دەڵێن ( هەڵبەزینی بۆماوەیی- الطفرات الوراثية-Mutation). زانایان وا

---

1- بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم وسێیەم.

گومان دەبەن کەوا دەبێت شتێك ڕووی دابێت بۆتە هۆکار بۆ ئاڵوگۆڕ نەکردنی ماددەی"DNA" لە نێوان هەردوو کرۆمۆسومی "x&y". بەجولان و هەڵبەزینی ئەو جینانە بە شێوەیەکی بەردەوام دەبێتە هۆی نەمان وتیاچوونی هەموو کرۆمۆسومی نێرینە. زانایان پرسیاریان لە خۆیان کردووە ئایا دەبێت ئەو گۆڕانکاریە هەر بەردەوام بێت لە جولان وهەڵبەزینی جینەکان؟ گەر ئەو ڕووداوە بەردەوام بێت ئەوا دوای چەندەها ساڵی تر (لەوانەیە بگاتە چەند هەزار ساڵێك) کرۆمۆسومی نێرینە بوونی نامێنێ مەگەر زۆر دەگمەن نەبێت.[1]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( لە نیشانەکانی کۆتایی دونیاو نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە، کە زانستی شەرعی نامێنێ ، نەفامی بڵاو دەبێتەوە، مەی خواردنەوەو زینا زۆر دەبێت وبە ئاشکرا دەکرێت، ژمارەی ژنان ئەوەندە زۆر دەبێت تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی 50 ئافرەت یەك پیاویان هەیە)) (( إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويظهر الجهل ويشرب الخمر ويظهر الزنا ويقل الرجال ويكثر النساء حتى يكون في خمسين امرأة القيم الواحد)).[2]

لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( زەمانێك بەسەر خەڵکدا دێت کە زەکاتی زێر دەدرێت، بەڵام کەس نیە وەری بگرێت، هەر پیاوێك 40 ئافرەت دوای کەوتووە بۆ تێرکردنی ئارەزوو، ئەوەش لە زۆری ژمارەی ئافرەت وکەمی ژمارەی پیاوە)) ((ليأتي على الناس زمان يطوف الرجل فيه بالصدقة من الذهب ثم لا يجد أحداً يأخذها منه. ويُرى الرجل الواحد تتبعه أربعون امرأة يلذن به من قلة الرجال وكثرة النساء)).[3]

---

1ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص50-54.
2ـ سنن ابن ماجه: الرقم: 4045، 1342/2. وسنن أبي يعلي، 274/5.
3ـ البخاري: 24- كتاب: الزكاة 9- باب:الصدقة قبل الرد الرقم:3،355/1414، ومسلم باب: الترغيب في الصدقة قبل أن لا يوجد من يقبلها ،700/2.

ئەو ڕووداوە ڕاستی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوامانﷺ بۆ دەخاتە ڕوو، كە ووتەكانی لە وەحی وسروشەوە بۆ هاتووە، چونكە لەو كات نەزانستی كۆرپەلەو نەزانستی كرۆمۆسوم وجینەكان هەبووە، بەڵام بە ویستی خوا ویستوویەتی پێمان ڕا بگەیەنێ لە پێش كۆتایی دونیا ژمارەی ئافرەتان 40-50 جار زیاتر دەبێت لە ژمارەی پیاوان.

9- وا گومان دەبەم بەهۆی بڵاو بوونەوەی بانكەكانی فرۆشتنی ئاوی پیاو (سپێرم)، پیتێن بە هۆی بۆڕی تایبەت، تەكنۆلۆژیای دیاری كردنی جۆری ڕەگەز، پیتێنی هێلكە بە هۆی خانەكانی تری لەش، كۆپی كردنی مرۆڤ، شوو كردنی پیاو بەپیاو، شوو كردنی ئافرەت بە ئافرەت، ئەمانە گشتیان هۆكارن بۆ دروست بوونی جیاوازیەكی زۆر لە نێوان ڕێژەی ژن وپیاو لە ئایندەیەكی نزیكدا.

هەرچەندە تاوەكو كاتی ئێستامان ژمارەی منداڵبوونی نێرینە زیاترە لە مێینە ، ئافرەت ڕووبەڕووی كرداری منداڵبوون و ژمارەیەك لە نەخۆشی كوشندەی وەك شێرپەنجەی مەمك وهێلكەدان دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی ژنان لە كۆن و ئێستادا لە ژمارەی پیاوان هەر زیاترە.

## بەندی سێیەم: حیكمەت وپەندەكانی چەند ژنی

### بڕگەی یەكەم: هۆكارەكانی كۆمەڵایەتی و كەسایەتیەكان

1- پیاوان زیاتر ئامادەییان تیایە بۆ كاری جینسی و زۆر بوون، كرداری جینسی لە پیاوان دەمێنێ بۆ تەمەنی پیر بوون واتە 75+ ساڵ، بەڵام لە ئافرەتان ئەوپەڕی دەگاتە 45-50 ساڵ، ئافرەتان ماوەیەكی زۆر لە ڕۆژانی ساڵ دوورن لە كاری جینسی ومنداڵبوون وزۆر بوون لەبەر بێ نوێژی مانگانە دەگاتە 7-10 ڕۆژ، منداڵبوون و زەیستانی20-40 ڕۆژ، بێجگە لە كاتە نارەحەتەكانی سك پڕی و شیردان.[1]

---

1ـــ ألیكسیس كاریل، الإنسان ذلك المجهول، ص108.

2- هەندێ لە پیاوان لەبەر باری ژینگەو کەش وهەوا، وەك لە ناوچە گەرمەکان پێویستی بە زیاتر لە یەك ئافرەت هەیە.

3- ئافرەتەکە نەزۆکە، یان نەخۆشەو چاوەڕوانی چارەسەری لێ ناکرێ، یان گەیشتۆتە تەمەنی پیری ومندالی نابێت. ئایا لێرەدا پیاوەکە خۆی بخاتە ناو قەفەزی کپ کردنی ئارەزووی هەبوونی مندالێ، یان لە خێزانی یەکەمی جیابێتەوە تاوەکو یەکێکی تر بهێنێ، یان لەگەڵ ئافرەتی یەکەم بمێنێ ونەوەی دووەمیش بهێنێ تاوەکو ئەو ئارەزووەی هەیانە بۆ بوونی مندالی جێبەجێ بێت.

4- لە هەندێ باری کۆمەڵایەتی وسیاسی وخێزانداری وا دەخوازێ کەوا ژمارەی مندالەکان زۆر بن.

5- تەنگژەی نێوان هەردوو هاوسەرەکە بگاتە پلەیەکی وا نەتوانرێ چارەسەر بکرێت لە بەر هەر هۆکارێکی پزیشکی وەیان خێزانی بێت.

6- چەند ژنی هۆکارە بۆ دوور کەوتنەوە لە پەیوەندی جینسی نا شەرعی و پەیدا بوونی مندالی هەلگیراوەی سەر شەقام وشوێنە چۆلەکان.

## برگەی دووەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە کۆمەڵگەو دەوڵەت

1- هەموو وولاتێك پێویستی بەوە هەیە لە هەموو بوارەکانی ژیان بەرەو پێشەوە بچێت، وەك: زانست وزانیاری، پیشەسازی وکشتوکاڵ وبازرگانی، سەربازی. ئەوانەش نایەتە دی تەنها بە هۆی زۆری ژمارەی دانیشتوان نەبێ. ژمارەی دانیشتوانیش زۆر نابێت تەنها بەهۆی دوو هۆکار نەبێت، یەکەمیان هاندان بۆ زوو ژن هێنان، دووەمیان چەند ژنی.[1]

2- زۆر جار وولات ڕووبەڕووی هەندێ باری ترسناك دەبێتەوە، وا پێویست دەکات بەرەنگاری بکرێت، وەك هێرشی دوژمن وکارەساتەکانی تری سروشتی، بەمەش ژمارەیەکی لە دانیشتوان لەناو دەچن، بەتایبەتی نێرینە چونکە زۆربەی

-Kenneth. Principle of Endocrinology. P: 949-9480

1- سيد سابق، فقه السنة، 124/2.

کات ولە زۆربەی وولاتان هەر ئەوانن بەرەنگاری ئەو هێرشانە دەبنەوە. لەو کاتانەدا دوو کێشە دێتە پێشەوە، یەکەمیان پەیدا بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتی بێ هاوسەر، دووەمیان کەم بوونەوەی ژمارەی دانیشتوان بەتایبەتی نێرینە. چارەسەری هەردوو کێشەکە چەند ژنیە. تاوەکو چاودێری ئەو ئافرەتانە بکەن کەوا هاوسەرەکانیان لە پێناوی سەروەری وولات شەهید بوون، هەروەك رێزێکیشە بۆیان تاوەکو نەکەونە ژێر فشاری دەست کورتی وبێ چاودێری، چونکە لەوانەیە دەوڵەت هەژار بێ نە توانێ بژێوی ئەو ژمارە زۆرە دابین بکات. بە هۆی چەند ژنیەوە دەوڵەت دەتوانێ ژمارەی نێرینە زیاد بکات، چونکە دەوڵەت هەرچەندە دەوڵەمەندو پێشکەوتوو بێت ناتوانێ کارگەی منداڵ دروستکردن دروست بکات بەڵکو ئەو کارگەیە منداڵدانی ئافرەت وئامێزی پیرۆزو گەرمی دایکایەتی یەکی شەرعیە کە خەونی هەموو ئافرەتێکی داوێن پاکە.

3–ژمارەی ژنان زۆر زیاترە لە پیاوان لە زۆربەی زۆری کۆمەڵگەکان، لەبەر ئەو هۆیانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن.

ئێمە دەڵێین یان چەند ژنی، یان ئەو ئەنجامانەی خوارەوە:

1– گەر چەند ژنی نەمێنێ ئەوا زیاتر لە نیوەی کۆمەڵی ئافرەتان بێ هاوسەر دەبن ودەبنە قەیرە کچ وبێ بەش دەبن لە دایکایەتی کەوا هیچ ئافرەتێك نیە حەز نەکات ببێ بە دایك. ئەوانە زۆربەیان تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبن، وەك: خەمۆکی (الکآبة)، خەو زڕان، هەستی تەنیایی، شێرپەنجەی مەمك...هتد.[1] ئەمانەو بێجگە لە ژیانەکی پڕ مەینەتی بە مانەوەیان لەناو خەڵکانێك کە بەسووك تەماشایان دەکەن، بەتایبەتی گەر لە خواترس نەبن.

2– ئەو ژنانەی کەوا هاوسەریان نیە، یان منداڵیان نەبووە باری دەروونیان هاوسەنگ نیە، زیاتر توورەن و دەمارگیریان زۆرە، لەژیانی لاسەنگی دەروونی دا دەژین.

---

1ـ ألیکسیس کاریل، الإنسان ذلك المجهول، ص110.

3- زۆربوونی ژمارەیەکی زۆری منداڵی نا شەرعی بە هۆی زیاد بوونی پەیوەندی جینسی نا شەرعی، بەمەش ژمارەی تاوانی کوشتن و بەدڕەوشتی و دزی زیاد دەکات، ئەو تاوانانەش دەبنە ئەرکێکی قورسی ئابوری وتەندروستی وئیداری و سیاسی لە سەر وولات. [1]

ئەگەر سەردانی بەڕیوەبەرایەتی پۆلیس و تەندروستی و دادگای شارو شارۆچکەکان بکەن دەزانن ئەرکی ئەو کارە نا شەرعیانە چەند زۆرە لە سەر بودجەی حکومەت و بارێکی قورسی ئیداریشە لەسەر ئەو بەڕێوەبەریەتیانەی ناوبراو.

لە ئەنجامی تێکەلاوی بێ سنوور لە ولاتانی ڕۆژئاوادا، دەبینین لە ساڵی 1940 (27% ی کچەکان و 49% ی کوڕەکان تووشی زیناو کاری بەدڕەوشتی بوون) لە ساڵی 1970 (40-80% ی هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ تووشی ئەو کردارە بەدڕەوشتیە بوون)، لە ساڵی 1979 ئەوانەی تەمەنیان لە 19 ساڵ کەمترە (71.4%) تووشی ئەو کردارە بوون. [2] هەر لەو ساڵە ئیعلانی شۆڕشی جینسیان کرد بە ڕەسمی (Sexual Revolution)[3].

ئاخۆ ڕێژەی ئەوانەی تەمەنیان زیاترە لە 20 بگاتە چەند؟ ئەوەی جێگەی داخە ئەو کردارە بەد ڕەوشتیەیان ناو ناوە بە (شۆڕش) ، بەلام چ جۆر شۆڕشێ، شۆڕش دژی جەستەو دەرونی گەنجەکان، دژی ئاین وخووڕەوشتی کۆمەڵگە، دژی عورف و عادەتی باپیران، دژی ئابووری وولات، بەڕاستی ئەوە شۆڕشە دژی جینسی مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

4- کەم بوونەوەی ژمارەی منداڵ بەتایبەتی نێرینەو زۆربوونی ژمارەی پیرو پەککەوتەکان. هەروەك دەبینین لە وولاتانی ڕۆژ ئاوا ژمارەی منداڵیان زۆر کەم بۆتەوەو ڕێژەی پیرەکانیش هەر لە بەرز بووندان، لە سوید پیرەکان 18٪ ولە

---

1ـ الكبيسي،أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام، ص87.

2ـ *Sheldon. Complication of Pregnancy. P: 97*

3ـ *Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 482,526,527.*

ئینگلستان و بلجیکاو نرویج 16٪ بۆ هەر یەکیان، لە ئەمەریکا 12.5٪ پێك دەهێنن. وا مەزەندە دەکرێت لە ساڵی 2025 ژمارەی پیرەکان زیاتر بێت لە منداڵی تەمەن لە 15 ساڵ کەمتر.[1]

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ قەدەغە کردنی چەند ژنی، زۆر بوونی زیناو لەبارهاویشتن.

5- بڵاو بوونەوەی ژمارەیەکی زۆری نەخۆشی کوشندە وەك: سوزەنەك و فەرەنگی و ئیدزو هەوکردنی جگەری ڤایروسی جۆری (B, C, D, G) کە هەموویان کوشندەن و چارەسەریان نیەو پاش چەند ساڵێك دەمرن. لە ئەمەریکا لە ساڵی 1970، ڕێژەی 40-80٪ لە هەردوو ڕەگەز نێرو مێ کاری جینسیان ئەنجامدابوو پێش گەیشتن بە تەمەنی 21 ساڵی، لە ساڵی 1994 زیاتر لە 50٪ گەلی ئەمەریکی کاری جنسیان ئەنجام داوە پێش تەمەنی 16 ساڵی.

هەر بۆیە خوای گەورە جۆرەها نەخۆشی ڤایروسی بۆ ناردن وەك سزایەك تاوەکو بگەڕێنەوە، بەلام وادیارە تاوەکو ئێستا هەر بەردەوامن. بۆ زانین تاوەکو ساڵی 2004، 39 ملیون کەس تووشی ئایدز بوون[2] وساڵانە 4 ملیون کەسیان لێ دەمرێت، پاش ئەوەی چارەسەریکی بێ سوودیان بۆ دەکەن، کۆی خەرجی هەر نەخۆشێك لە نێوان 100 هەزار دۆلار تاوەکو 200 هەزارە. هەوکردنی جگەری ڤایروسی لە جیهان ژمارەی تووش بووان 1 ملیارو 200 ملیۆنە ، زۆربەیان دوای 10-15 ساڵی تر دەمرن بەهۆی شێرپەنجەی جگەرو جگەر بە چەوری بوون. پێغەمبەری ئیسلامﷺ پێش1400 ساڵ ئەو بارە بەد ڕەوشتیەی ئێستای وولاتانی

---

*1– Susman et al (1992). The oldest all.*

2– مرض الإيدز: نەخۆشی کەم بوونەوەی بەرگری بەدەستهاتووی لەش. ئەو نەخۆشیە تووشی نێرینەو مێینەو کۆرپەلەش دەبێ، بەبێ جیاوازی باری ئابووری وڕۆشنبیری و جۆری ژیان. بەتایبەتی تووشی ئەوانە دەبێت کەوا کاری جینسی نامۆ ئەنجام دەدەن لە نێرینەو مێینە، ئەوانەی دەرزی بێ هۆشکەر لە خۆیان دەدەن، کۆرپەلەی دایك تووش بوو، ئەوانەی خوێنی پیس بوو وەردەگرن.الخباز ،عدنان، مرض الإيدز، ص 36-37.

بێ باوەڕی بۆ ئێمە باس کردووە و دەفەرمووێ: (( هەر کات بەد ڕەوشتی و فاحشە لەناو گەلێك بەئاشکرا بلاو بۆوە ئەوا خوای گەورە ئێش وئازارو تاعونیان بۆ دەنێرێ کە پێشتر ئەو نەخۆشیانە لە ناویان نەبووە))، یان دەفەرمووێ: ((مردنیان بەسەردا زاڵ دەکات)) ((لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم)). لە ڕوایەی بورەیدە دەفەرمووێ :((ولا ظهرت الفاحشة في قوم إلا سلط الله عليهم الموت)).[1]

ئەو ئازارانەش بریتین لە سەربازەکانی خوا لە ڤایرۆسەکانی ئایدزو ئەوانی تررن وەك سزایەکە بۆیان تاوەکو بگەڕێنەوە سەر ڕێگەی دروستی تێرکردنی ئارەزووی جینسی.

ئەگەر ئەو نەخۆشیانەش بلاو نەبونایەوە لەناویان ئەوا ئەو ڕێژەیە زۆر زیادی دەکرد.[2]

1 ـ الحاكم النيسابوري ، المستدرك على الصحيحين، 358/4. وفتح الباري،193/10.
2 ـ *Rital.A et al. Hilgard introduction to Psychology. P: 376 .*

## باسی سێیەم: میرات

سەرەتا نامەوێت لێرەوە بە درێژی باسی بابەتی میرات بكەم چونكە میرات وچۆنیەتی دابەش كردنی بەسەر هەردوو ڕەگەز، پەیوەندی بە پێكهاتەی جەستەیی ودەروونیەوە نیە. بەڵكو پەیوەندی بە باری كۆمەڵایەتی وئابووری وچۆنیەتی ژیانی هەردوو ڕەگەز هەیە. كەواتە بە هیچ شێوەیەك جیاوازیەكانی بڕو هێندی میرات ئەوە ناگەیەنێ ڕەگەزێكیان لەسەر ئەوی تر فەزل وگەورەیی هەیە، یان ئەوی تریان كەم بایەخ ونرخە. بەڵام تەنها لێرە ڕەچاوی ئەوە كراوە كامەیان لە ڕووی كۆمەڵایەتی و ئابووریەوە زیاتر پێویستی بەو میراتە هەیە. لە گشت كۆمەڵگەكانی دروست لە جیهاندا پیاو ئەركی بژێو چاودێری خێزان ومنداڵ وماڵی لە ئەستۆدایە، لەلایەكی ترەوە ئافرەت بە هیچ شێوەیەك بژێوی خۆشی لەئەستۆدا نیە، لە پێش شووكردن لەسەر باوك وبرایەتی، دوای شووكردن لەسەر هاوسەرەكەیەتی هەرچەندە گەر دەوڵەمەندیش بێت، گەر كەسی نەبوو ئەوا لە خەزینەی دەوڵەت ژیانی دابین دەكرێت (بيت المال).

دكتۆر ئەحمەد كوبەیسی لەو بارەیەوە دەڵێ: ئیسلام میراتی لەسەر بنەمای نێرینەو مێینە دانەناوە، بەڵام لەسەر بنەمای دووری ونزیكی ئەو كەسەیە لە مردووەكە، لەگەڵ ڕەچاوكردنی ئەو لێپرسراویەتیەی كە دەكەوێتە سەری لە ژیانی كۆمەڵگە بەبێ جیاوازی لە نێوان پیاوو ژن.[1]

ئەو ئەركانەی كە كەوتۆتە سەر پیاو: دابین كردنی مارەیی ودیاری، بژێوی خێزان ومنداڵ، دابین كردنی خانوو، بەكرێ گرتنی دایەن گەر ئافرەتەكە شیری بەمنداڵەكەی نەدا، دابین كردنی بژێوی ئافرەت لەلایەن باوك وبرا پێش بە شوودانی، لەلایەن هاوسەرەكەی دوای بەشوودانی هەرچەندەگەر هاوسەرەكەی هەژاریش بێ و ئافرەتەكە دەوڵەمەند بێت. لەبەر ئەو هۆیانەیە خوای گەورە دوو بەشی (سهم) بۆ

---

1ـ الكبيسي، أحمد، فلسفة نظام الأسرة في الإسلام، ص103.

پیاو داناوە بەرامبەر یەك بەش بۆ ئافرەت، ئەویش لە هەندێك باری تایبەتدا نەوەك لەهەموو بارێکدا هەروەك هەندێك نەفام وەك تانەو تەشەنە باسی دەکەن.[1]

لە زۆر باری جیاجیادا ئافرەت هەمان بەشی پیاوی هەیە، یان لەویش زیاتر وەردەگرێ. لە هەندێ باری تردا ئافرەت میرات وەردەگرێ وپیاو وەرناگرێ هەرچەندە لەیەك پلە بن ولە مردووەکەش نزیك تر بێت، وەك لە باسی (کالمسألة الحَجَرِيّة- اليمئِة).

1- دایك وباوك هەردووکیان یەك لە شەش وەردەگرن لە کاتی مردنی کوڕ یان کچ، لەگەڵ بوونی لقی تری میراتگر.

2- داپیرو باپیریش بەهەمان شێوەی پێشوو.

3- خوشك وبرا لە دایك، هەردووکیان یەك لە شەش وەردەگرن گەر تەنها بوون، گەر لە دوو زیاتر بوون سێ یەك وەردەگرن، بەیەکسانی دابەش دەکرێت لە نێوانی نێرینەو مێینەکان بەبێ جیاوازی.

4- بەشی کچی مردووەکە زیاترە لەبەشی مامەکانی (براکانی مردووەکە)، وەك چۆن پیاوێك بمرێت دوو کچ ودوو برای هەبێ، ئەوا دوو کچەکە 3/2 وەردەگرن، 3/1 بۆ برایەکانی مردووەکە دەبێت.

5- لە زۆر باری جیاوازدا مێینە زیاتر وەردەگرێ لە نێرینە، وەك: گەر کوڕێك بمرێ دایکی مابێ لەگەڵ هەندێ خزمانی دووری نێرینە، ئەو کات دایکەکە 3/1 وەردەگرێ بەتەنها، 3/2 بۆ هەموو ئەوانی ترە.

6-ئەگەر ژنێك مرد، مێردی مابوو لەگەڵ دایکی وباپیری، ئەوا مێردەکەی 2/1 وەردەگرێ، دایك 3/1، ماوەکەش بۆ باپیریەتی کە 6/1، واتە دایك دوو بەقەد باپیر وەردەگرێ هەرچەندە باپیر لە جێگەی باوکە.

---

1ــ الوافي،علي عبد الواحد، المرأة في الإسلام، ص49. وسيد قطب، العدالة الاجتماعية في الإسلام،ص55، سيد قطب في ظلال القرآن،264/2.ومحمد رشيد رضا، تفسير المنار،4/ 406.

7- گەر ئافرەتێك وەفات بكات چەند خوشكەی هەبێ لە دایكی، برای هەبێ لە دایك وباوكی، دایكی ومێردی مابێ لە ژیان، ئەوا دایكی 3/1 وەردەگرێ، مێردەكەی 2/1 وەردەگرێ، خوشكەكانی 3/1 وەردەگرن، بەلام براكانی هیچ وەرناگرن هەرچەندە نێرینەن ولە خوشكەكان نزیكترن لە مردووەكە.[1]

ئەو بارە جیاجیایانەی باسمان كردن لەگەڵ هەندێ باری تر، ئەو تانەوتەشەنەی كە نەفامان وجاهیلانی سەردەم شەو ڕۆژ بانگەشەی بۆ دەكەن بە درۆ دەخاتەوە، كە گوایە خوای گەورە جیاوازی كردووە لە نێوان نێرینەو مێینە لە میرات وەرگرتن، وەك فەرموویەتی : ﴿ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (11) ۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾النساء:11-13.

---

1- الباجوري، جمال محمد، المرأة في الفكر الإسلامي، 133/2. والدمشقي، محمد أحمد، شرح الرحبية، ص90.

تەنها لەیەك باردا نێرینە دوو بەشی مێینە وەردەگرێ گەر پیاوێك مرد کوڕ وکچی لە دوای خۆی بەجێهێشت (جا کوڕ و کچەکە لەیەك دایك بن، یان دایکیان جیاواز بێ) ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾ النساء:11.

بە ڕەچاو کردنی ئەرکەکانی سەر شانی نێرینەو مێینە خوای گەورە بڕی میراتی بۆ دیاری کردووە، واتە تەواوترین وبەرزترین دادوەری وعەدالەت ئەوەیە کە ڕەچاوی هەموو ئەگەرەکانی دواڕۆژ، بڕی پێویستی ماندوو بوون دەکات. یەکسانی ئەوە نیە کە مافی خەڵکی تر پێ شێل بکرێت و ڕەچاوی باری کۆمەڵایەتی وئابووری نەکرێت.

# بەشی پێنجەم

## شایەتی دان

باسی یەکەم: جۆرەکانی شایەتی دان

باسی دووەم: جۆرەکانی شایەتی دانی ئافرەت

باسی سێیەم: حیکمەتی دانانی دوو ئافرەت بەرامبەر بە یەك پیاو کاتی شایەتی دان

باسی چوارەم: وەرگرتنی شایەتی دانی یەك ئافرەت لە هەندێ باری تایبەت بە ئافرەتان وهۆیەکانی ئەو وەرگرتنە

# باسی یەکەم

## جۆرەکانی شایەتی دان

بەندی یەکەم : مافی ئادەمیزادان

برگەی یەکەم: تەنها دوو شاهیدی پیاو دەبێت

برگەی دووەم : دوو شاهیدی پیاو، یان یەك پیاوو دوو ژن

برگەی سێیەم: دوو شاهیدی پیاو یان پیاوێك ودوو ژن یان چوار ئافرەت

بەندی دووەم: مافەکانی خوای گەورە(الحدود)

برگەی یەکەم: تەنها چوار شاهید تیایدا وەردەگیرێ

برگەی دووەم: دوو کەس تیایدا بۆ شاهیدی دەبێت

برگەی سێیەم: یەك پیاو بۆ شاهیدی دەبێت

## باسی یەکەم: جۆرەکانی شایەتی دان

لـە زمـانی عـەرەبی: شـایەت: ئـەو کەسـەی شـتێك دەزانـێ ودەتـوانێ ڕوونـی بکاتەوە، شایەتی دان: دەنگ وباسێك بە تەوایی دەزانـێ و ئامـادەیی تیایـە بـۆ دان پیانانی. بە واتای ئامادەیی وشاهیدی دێت.[1]

شایەتی دان کارێکی وا ئاسان نیە، بەڵکو هۆکارێکی سەرەکی یە بۆ چەسپاندنی ماف وسەپاندنی ڕاستی ودادوەری، بەبەڵگە (دوکیومینت) کردنـی مامەڵـەکانی مـاڵی وبازرگانی بەجوانترین شێوە کە نەفس لێی دڵنیا دەبێت. لای دادوەر گرنگ ئەوەیـە بەڵگەی ڕاست (البيِّنة) هەبێ بتوانێ ئەو کێشەیەی هەیە چارەسەری بکـات و بگاتـە ڕاستی وبیسەپێنێ، جا ئەو کارە بە یەك ئافرەت دەکرێت، یان چەند ئافرەتێك، یان پیاو وئافرەت پێکەوە، یان تەنها بە پیاوان بێت.[2]

زانایـانی ئیـسلام دەربـارەی ڕەگـەزی ئـەو کەسـەی شـایەتی دەدات وژمارەیـان جیاوازی وخیلافیان هەیە لە خوارەوە بە درێژی باسی دەکەین.

زانایان دەڵێن شایەتی یەکێك وەرناگیرێ گـەر ئـەو پێـنج سیفەتەی تیـا نـەبێت: ئیسلام، ڕاستی ودادوەری، پێگەیشتن، هۆش، ئازادی.[3]

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ﴾ البقرة: 282.

### دوو مەرجی یەکەم: ئیسلام ودادوەری

زۆربەی زانایان لە گەڵ ئەو ڕایەن کە بێ باوەڕەکان نابنە شاهید چونکە لە ئێمـە نین وبـە دادوەر نـاژمێردرێن وجێگـەی ڕەزامەنـدی موسـڵمانان نـین. خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾الطلاق: 2. ﴿مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 223/3.
2ـ محمود شلتوت، الإسلام عقيدة وشريعة، ص260.
3ـ البغا، متن أبي شجاع، للتهذيب، ص270.

ٱلشُّهَدَآءِ ﴾ البقرة: 282.

ماف بە شێوەیەکی گشتی دەکرێتە دوو بەش: مافی خوای گەورەو مافی ئادەمیزادان.

## بەندی یەکەم: مافی ئادەمیزادان

**ئەویش سێ جۆرە:**

برگەی یەکەم: تەنها دوو شاهیدی پیاو دەبێت، لەو کاروبارانەی کە پەیوەندی بە ماڵ وپارەوە نیە، وەك: مارەکردن، تەلاق، وەسیەت کردن).[1]

مارە کردن: ئیبن عباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:(( مارەیی نایەت بەبێ وەلی کچەکەو دوو شاهیدی دادوەر)) ((لا نكـاح إلا بـولي وشـاهدي عدل))[2]

تەلاق: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴾ الطلاق: 2 .

وەسیەت کردن: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ ﴾ المائدة: 106.

برگەی دووەم: دوو شاهیدی پیاو، یان یەك پیاوو دوو ژن، یان یەك شاهیدو سوێند خواردنی موددەعی، ئەوەش بۆ ئەو کاروبارانەی پەیوەندی بە ماڵ وپارەوەو مامەڵەی بازرگانی هەیە، وەك: کڕین وفرۆشتن، بە کرێدان، ڕەهن دانان.[3] ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا قەزاوەتی کردووە لە کاروباری ماڵی بە شاهیدێك و

---

1ـ البغا، متن أبي شجاع، التهذيب ، ص270.
2ـ سنن الكبرى للبيهقي 125/7 و 56/7. وسنن دار القطني، 220/3.
3ـ البغا، متن أبي شجاع، التهذيب، ص270 .

سوێند خواردن. ((أن رسول الله قضى بيمين وشاهد في الأموال)).[1]

بڕگەی سێیەم: دوو شاهیدی پیاو یان پیاوێك ودوو ژن یان چوار ئافرەت (بۆ ئەو بابەتانەی تایبەتە بە ئافرەتانەوە، وەك: منداڵبوون، شیر پێدان، نەنگی لە ئافرەتان، وەك: بەڵەکی)

## بەندی دووەم: مافەکانی خوای گەورە(الحدود)، ئەو مافانەیە کە ئافرەت تیایدا نابێتە شاهید. ئەوانەش سێ جۆرن

**بڕگەی یەکەم: تەنها چوار شاهید تیایدا وەردەگیرێ، وەك: زینا. ئەگەر چوار شاهیدیان نەهێنا ئەوا هەر یەکیان هەشتا جەلدەی لێدەدرێت.**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ النور: 4.

لەبەر ئەوەی ئەو مافانە پێویستی بە هەڵوەستەو دڵنیابوون هەیە، بۆیە شایەدی ئافرەتان تیایدا گونجاو نیە. هەروەك ئیمامی مالیك لە زوهری دەگێڕێتەوە: لە مافەکانی خوا وحدود شایەتی ئافرەت وەرنەگیراوە.[2]

**بڕگەی دووەم: دوو کەس تیایدا بۆ شاهیدی دەبێت، ئەوانیش حدودەکانی ترە، تەنها زینا نەبێت، وەك: خواردنەوەی مەی، قیصاص.[3]**

**بڕگەی سێیەم: یەك پیاو بۆ شاهیدی دەبێت، وەك: دیتنی مانگ بۆ بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان.[4]**

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێ: ((خەڵك تەماشای مانگیان دەکرد، منیش ئاگاداری پێغەمبەری خوام ﷺ کرد کەوا مانگم دیتووە، ئەویش فەرمانی کرد کە خەڵك بە

1ـ الشافعي، محمد بن إدريس، الأم، 156/6.
2ـ البغا ، متن أبي شجاع ، التهذيب، ص271.
3ـ المصدر نفسه ، ص272.
4ـ المصدر نفسه، ص272.

ڕۆژو بن)). ((تراءى الناس الهلال، فأخبرت رسول الله أني رأيته، فصامه وأمر الناس بصيامه)).[1]

ئیبن عەباس ووتی: ئەعرابیەك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی مانگم دیتیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا تۆ شایەتی دەدەیت بە خواو پێغەمبەر، ووتی بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەڵسە ئەی بیلال بانگ بدە با خەڵك بە ڕۆژو بن)).((أتشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله ،قال: نعم، قال: يا بلال أذن في الناس فليصوموا غداً)).[2]

حیکمەت لە وەرگرتنی یەك شاهید لە ڕۆژوو ئەوەیە، چونکە ئەگەر هەڵەش کراو ڕۆژەك زووتر بڕیاری ڕۆژو درا چاکترە لەوەی ڕۆژێك بڕوات لە مانگی ڕەمەزان. بەڵام بۆ بینینی مانگی شەوال(جەژنی ڕەمەزان) دوو شاهید وەرگیراوە.[3]

## باسی دووەم: شایەتی دانی ئافرەت لە ڕووی وەرگرتن وڕەتکردنەوەی

1- شایەتی ئافرەت لە حدودو خوێن (قصاص) وەرناگیرێ.[4]

لە قیصاص دوو شاهیدی دادوەر وەردەگیرێ لە پیاوان.[5]

زوهری دەڵێ: شاهیەتی ژنان وەرناگیرێ لە حدود ومارەکردن وتەڵاق.[6]

2- سەرجەمی زانایان لەسەر ئەوەن شایەتی ژنان وەردەگیرێ لەگەڵ پیاو لە قەرزو کاروباری ماڵی.[7]

---

1ــ سنن أبي داود: كتاب: الصوم، باب: شهادة الواحد على رؤية هلال رمضان، الرقم:2340 ، 302/2.

2ــ سنن أبي داود: الرقم:2340، 302/2. وسنن الكبرى للبيهقي: الرقم:7762، 211/4.

3ــ البغا،التهذيب، ص272.

4ــ الخطيب الشربيني، مغني المحتاج، 441/2.

5ــ ابن قدامة، المغني، 97/8.

6ــ المغني، 452/6.

7ــ ابن المنذر، الإجماع، ص64.

3- زانایان ڕایان جیاوازە دەربارەی وەرگرتنی شایەتیان لە مارەکردن وتەلاق، وەسیەت و وەکالەت. حەنەفیەکان دەڵێن: شایەتیان وەردەگیرێت لە مارەکردن و تەلاق (یەك پیاوو دوو ژن).[1] بەڵام سەرجەمی زانایان لەگەڵ ئەو ڕایە نین.[2]

4- سەرجەمی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کەوا شایەتیان وەردەگیرێ لەو بابەتانەی پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە وەك: شیر پێدان، منداڵ بوون، کەوتنە بێ نوێژی، پێکەیشتن، پەردەی کچێنی، نەخۆشیەکانی پێستە(بەڵەکی). بەڵام ڕای زانایان جیاوازە لەسەر ژمارەی شایەدەکان.

## باسی سێیەم: حیکمەتی دانانی دوو ئافرەت بەرامبەر بە یەك پیاو کاتی شایەتی دان لە کاروباری مالی وبازرگانی وقەرز

1- سەرجەمی زانایانی توێکارزانی وفسیۆلۆژی لە سەر ئەو ڕایەن کەوا دەماخی پیاو هەر بەشە بەتەنها کار دەکات، تەنها یەك کار لە یەك کاتدا ئەنجام دەدات، واتە سنووردارەو ناتوانێ چەند کارێك لەیەك کاتدا ڕاپەڕێنێ. بەڵام ئافرەت دەتوانێ هەردوو لای دەماخی لە یەك کاتدا بەکار بهێنێ، دەتوانێ کاری هەردوو لای دەماخی تێکەڵکێش بکات بە بێ خەرج کردنی کات وماندوو بوون. لە سیفەتە باشەکانی ئەو تێکەڵکێشانەی کاری دەماغ وای کردووە ئافرەت بتوانێ چەند کارێکی جیاواز لە یەك کاتدا ئەنجام بدات، وەك ئەوەیە ئافرەت دەتوانێ وەڵامی تەلەفۆن بداتەوە، چێشت ئامادە بکات، چاودێری خوێندنی منداڵەکەی بکات لە یەك کاتدا. لە خالە سەلبیەکانی ئەو جۆرە کارەی دەماغ، وای کردووە زۆر جار ئافرەت شتی لە لە یاد بچێتەوە، لە نێوەی ڕێگا بیرو هزری بپچڕێ. هەر ئەوەشە وای لە زانایان کردووە کە بڵێن لە هەندێ کاروباری تایبەتدا دوو ئافرەت شایەتی بدەن بەرامبەر یەك پیاو.[3]

---

1ـ المرغيناني، الهداية، 116/3. والجصاص، أحكام القرآن، 501/1.
2ـ الخطيب الشربيني، مغني المحتاج، 442/4. والقرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 391/3.
3ـ عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص162.

2- لە بەر سەرقاڵی ئافرەت بەکاری ماڵ وپەروەردەی منداڵ لەلایەك، لەلایەکی تر لەوانەیە کاری دەرەوەی ماڵیشی هەبێ، وای کردووە نەتوانێ کاری بازارو مامەڵەو بازرگانی بکات. لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەی کۆن و سەردەمی ئێستاشدا دەبینین لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی بوونی ئافرەت زۆر کەمە وەیان دەگمەنە لە ناو بازاڕە گەورەکانی جیهان و لەناو بۆرصەکانی جیهانی، چونکە پێکهاتەی ئافرەت هەرسی ئەو جۆرە کارانە بە ئاسانی ناکات.

3- سروشتی ئادەمیزاد (نێرینەو مێینە) وایە، ئەو بابەتانەی لایان گرنگە، زیاتر پێوەی خەریك بوونە، ئەویان چاکتر بە بیر دێتەوە لە بابەتەکانی تر. کەواتە ئافرەتان کاری ئافرەتانی تریان چاکتر لەیاد دێتەوە لە کاری بازرگانی ومالی و حدود. هەرچەندە ئافرەت هەیە کاری گرێ بەست وبازرگانی کردبێ بەلام ئەو جۆرە نموونانە زۆر کەمە، حوکمی گشتگیریش لە سەر زۆرینە دادەمەزرێ، نەوەك لەسەر کەمینەو نامۆ.[1]

4- ئێمە کە دەڵێین ئافرەت لە مامەڵەی بازرگانی ومالی زۆر جار ڕێگەی دروستی کارەکەی لێ وون دەبێت، مانای ئەوە نیە ئافرەت فەهم وتێگەیشتنی کەمە، بەڵکو مانای ئەوەیە شارەزایی وخیبرەو پسپۆری کەمە لەو بوارەوە. چونکە کاتێ باسی ئەو جۆرە بابەتانە دەکرێت کە پەیوەندی بە گرێ بەست وبازرگانی هەیە نا توانێ گشت وردەکاریەکانی وەربگرێ تاوەکو بتوانێ وەك شایەدێك لە پێش دادوەر بڕیاری کۆتایی ئیفادەکەی خۆی بدات.

5- هەروەك باسمان کرد کەوا ئافرەت لە خۆڕسکەوە زوو هەڵدەچێت، خێرا وەلامی بزوێنەرەکانی دەرەکی دەداتەوە، خێرا بەدەنگ ئەو کارانەوە دەچێت کە سۆزو عاتیفەیەکی تیایە، وەك گریان و پاڕانەوە، بەهاناوەچوون وای لێ کردووە لە زۆربەی بارەکان عاتیفەکەی زاڵبێ بەسەر تەفکیرو هۆشی. بەلام شایەتی دان لە پێش دادوەر لە بابەتەکانی کوشتن و تەلاق ومامەڵەی ئابووری وبازرگانی یەکێکی

---

1- السباعي، مصطفى، المرأة بين الفقه والقانون، ص31.

پێویستە کە بتوانێ هەموو سۆزو عاتیفەی خۆی بەلاوەنێ، دان بەخۆ داگرو چاو نەترس بێ، بتوانێ کۆنترۆلی خۆی بکات بە ئاسانی هەڵنەچێت ، فیکرو بیری زاڵ دەبێ بەسەر سۆزو عاتیفەی، چونکە ئەو شادەتی یە لەوانە ببێتە هۆکارێك بۆ دەرکردنی سزای کوشتن ولە سێدارە دانی یەکێك، یان تەلاقدانی ئافرەتێك، یان گۆڕینی دوارۆژوو مەسیری یەکێك. ئافرەت لەبەر زاڵ بوونی عاتیفەی بەسەر فیکری، دڵی نەرم دەبێت بەرامبەر دیمەنە دڵتەزێنەکان، لەکاتی تەنگانە دەشڵەژێ، کاتی بینینی ڕووداوی کوشتن دەگریێ. ئەوانەیە وای کردووە نەبێتە جێگەی متمانە بۆ ئەوەی شایەتی دروست بدات، لەوانەیە شایەتی خۆی بگۆڕێ، یان هەر شایەتی نەدات لەو بابەت وبوارانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن.[1]

هەروەك ئیمام ئیبن القیم دەڵێ: گرنگە لە لای قازی، بوونی بەڵگە یان دوو شاهید یان شایەدو سوێند تاوەکو هەق وڕاستی پێ دیار کەوێت، لەوانەشە قازی حوکم بدات بە قەرینەی تەواوی قەتعی، یان بە شایەتی دانی یەکێکی بێ باوەڕ، گەر جێگەی متمانە بێ و سیقەو متمانەی ی پێ بکرێت.[2]

لە ڕوانگەی ئەو ڕایەی ئیبن القیم، هەندێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کەوا شایەتی ئافرەت وەردەگیرێ لە گشت بابەتەکان و بوارەکان، بگرە لە بابەتی کوشتن و خوێن و گرێ بەست ومارەکردن... هتد. بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی خوارەوە.[3]

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ﴾الطلاق:2. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ ﴾المائدة: 106. خوای گەورە

---

1ـ رشيد رضا،تفسير المنار،125/3.والسباعي، مصطفى،المرأة بين الفقه والقانون، ص31.

2ـ ابن القيم، أعلام الموقعين، 1/90-91.

3ـ ابن القيم، أعلام الموقعين،96/1. وابن حزم، المحلى بالآثار، 395/9. ومحمد دروزة، المرأة في القرآن والسنة، ص230.

دەفــەرمووێ: ﴿وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ﴾ النساء: 15. خوای گەورە دەفـەرمووێ : ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ﴾النور :4.

دكتۆر مستەفا سوباعی دەربارەی تەفسیری ئایەتـەكانی قـەرز پێـدان دەڵێـت: شـایەتی دان و نووسـینی بـڕی قـەرز و ماوەكـەی هـاتووە بـۆ چەسـپاندنی مـاف و دۆكیومینت كردنی ووتەكان، تاوەكو مافی كەس نەخورێت، هیچ پەیوەندیەكی نیـە بە ڕەگەزی مێینە، لە ڕووی ئەوەی كـە شـیاوە یـان نـا، لێوەشـاوەیی (ئەهلیـەت)و توانای هەیە یان نا، تا وەكو خەڵك بڵێن ئەوە زولمە لە ئافرەت دەكرێت وسوكایەتی پێكردن وماف زەوت كردنە.[1]

زانایان خیلافیان هەیـە لـەوەی ئایـا دوو هاوسـەر دەتـوانن بـۆ یـەكتری شـایەتی بدەن. هەندێكیان شایەتی ئافرەتان بۆ مێردەكەی ڕەت كردۆتـەوە لەبـەر دوو هـۆ، یەكـەمیان: لـە بـەر نزیكـی تونـدی پەیوەنـدی وخۆشەویـستی، دووەمیـان: چـونكە بژێوی ئـافرەت وجـل وبـەرگ وشـوێنی حەوانـەوەی لـە سـەر مێردەكەیـەتی. بـەڵام شایەتی پیـاو بـۆ خێزانـی وەرگـیراوە چـونكە جێگـەی گومـان نیـە لەبـەر نـەبوونی پەیوەندیەكی ماددی نێوانیان.[2]

1ـــ محمود شلتوت، الإسلام عقيدة وشريعة، ص260. ومصطفى السباعي، المرأة بين الفقــه والقانون، ص31.

2ـــ اليماني، الوزير، العواصم من القواصم، 253/2، وابن قدامة، المغني، 193/9.

## باسی چوارەم: وەرگرتنی شایەتی دانی یەك ئافرەت لە هەندێ باری تایبەت بە ئافرەتان وهۆیەكانی ئەو وەرگرتنە

### بەندی یەكەم: وەرگرتنی شایەتی دانی یەك ئافرەت لە هەندێ باری تایبەت بە ئافرەتان

(شایەتی یەك ئافرەتی جێگەی متمانە، وەرگیراوە لەسەر بابەتی شیرپێدان، ئەوە ووتەی زوهری و ئەوزاعی وتاووسی كیسانیە[1]. [2]

بەلگەمان بۆ وەرگرتنی ئەو شایەتی یە ئەوەیە: عەقەبەی كوڕی حارس[3] گووتی: ویستم ئوم یەحیای كچی ئیهاب بهێنم، لەو كات ئافرەتێك هات ووتی: من شیرم داوەتە عەقەبەو ئافرەتەكە. عەقەبە ووتی: من شتی وام نەزانیووە كە تۆ شیرت بەو ئەو ئافرەتە داوە. دوایی چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو باسەی بۆ كردەوە، ئەویش ﷺ فەرمووی: ((چۆن مارەی دەكەیت وئەو شتەش ووتراوە كە شیرتان پێكەوە خواردووە)). دوای ئەم ووتەیە عەقەبە ئەو نكاحەی ڕەت كردەوە. ((كیف وقد قیل )). [4]

شەعبی دەڵێ: [5]: كاتی خۆی قازی، ژن وپیاوی لە یەك جیا دەكردەوە لە كاتی

---

1ــ طاووس بن كیسان الخولانی :بە ڕەچەڵەك فارسە و لە یەمەن پەروەردە بووە، لە ساڵی 32 كۆچی لە دایك بووە، لە گەورە پیاوەكانی تابعینە، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، زۆر بە جەرگ بووە بۆ ئامۆژگاری كاربەدەستان. لە ساڵی 106 كۆچی دوایی كردووە. الزركلي، الأعلام ، 224/3.

2ــ ابن القدامة، المغني ،155/9.

3ــ عقبة بن الحارث بن عامر النوفلي: كونیەكەی: ئەبو سروعە یان سریمە. لە كاتی فەتحی مەككە موسڵمان بووە، ساڵی 50 كۆچی دوایی كردووە .ابن حجر العسقلاني،تقريب التهذيب، 394/1.
والذهبي محمد بن أحمد، الكاشف،28/2.الرقم:3834،وابن حجر، تهذيب التهذيب، 116/12.

4ــ البخاري 3- العلم باب :26 حدیث:88 ، 45/1.

5ــ الشعبي: عامر بن شراحیل: یەكێكە لە تابعینەكان، لە كوفە لە دایك بووە وگەشەی كردووە، لە پیاوە ڕاستگۆكانی فەرموودە گێڕانەوەیە. خەلیفە عبدالمەلیكی كوڕی مەڕوان كردیە دەستە ڕاستی خۆی و نوێنەری بوو بۆ لای مەلیكی ڕۆم، عومەری كوڕی عبد العزیز كردیە قازی. الزركلي، الأعلام، 251/3. وابن حجر، تهذيب التهذيب، 69/5. والذهبي، تذكرة الحفاظ، 79/1.

شیرخواردن بە شایەتی یەك ئافرەت، چونكە ئەو شهادەیە پەیوەستە بە ئافرەتان و تایبەتمەندیەكەیان.[1]

ئیمامی ئەبو حەنیفە دەڵێ: بۆ ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە ئافرەتان واچاكە ئەو پیاوانەی مەحرەمن بە ئافرەتەكە بەشدار بن لەگەڵ ژنەكان بۆ شایەتی دان. لە نیكاح ئافرەت بە تەنها نابێت بۆشایەتی دان.[2]

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: شهادەتی یەك ژن نا بێت بۆ ئافرەتان و تایبەتمەندیەكەیان، چونكە خوای گەورە بۆ هەموو بابەتەكان دوو شاهیدی داناوە، كەواتە بۆ ئافرەتان ئەولا ترە كە لە دوو كەمتر نەبن بەلام عومەری كوڕی خەتاب‌ﷺ دەڵێ: بۆ ئەو بابەتانە شایەتی یەك پیاوو دوو ژن كەمتر نابێ هەروەك كاروباری بازرگانی و مالی و حدودەكان، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە:[3]

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ﴾ البقرة: 282.

دەربارەی تۆمەتباركردنی ئافرەتێكی بێ تاوان لەلایەن چەند كەسێك، ئەوا شایەتی هەردوو ڕەگەز وەك یەك وەردەگیرێ، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ النور: 4.

لە كاتێ كە پیاوێك یان ئافرەتێك هاوسەرەكەی تۆمەتبار دەكات، لەعنەت كردن شایەتی هەردووكیان وەك یەك وەردەگیرێ، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ

1ـ ابن قدامة، المغني، 559/7.
2ـ ابن قدامة، المغني، 557/9.
3ـ ابن قدامة، المغني، 156/9. و558/7.

ﭐلصَّٰدِقِينَ ﴾ النور: 6. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ النور :8.

## بەندی دووەم: هۆیەکانی وەرگرتنی شایەتی ئافرەت لە کارە تایبەتمەندیەکان

1- ئافرەت کاری ئافرەتانی چاکتر لەیاد دێتەوە لە کاری بازرگانی ومالی و حدود. چونکە ئەو بابەتانەی لایان گرنگەو شارەزایی تیا هەیە.

2- ئافرەت توانای دانیشتنی هەیە بۆ ماوەیەکی زۆر، بەتایبەتی لەگەڵ دەستە خوشکەکانی ولەگەڵ ئەوانەی ماڵەکانیان نزیکی یەکترن، هەروەها توانای زمان و قسەکردنی بەرزە، بە درێژایی ئەو ماوەیە گفوگۆ دەکەن ولە هەموو کاروبارە ئاشکراو نهێنیەکان و وردەکاریەکانی یەکتری شارەزا دەبن، بۆیە کاتێ بابەتەکانی پەیوەست بەئافرەتان دێتە پێشەوە ئەوا بیری دەکەوێتەوەو دەتوانێ بریاری خۆی بدات.

ئەو بەڵگانەی باسمان کردن دەبنە هۆکار بۆ وەرگرتنی شایەتی ئافرەتان بەتەنها لە سەر ئەو بابەتانەی کە پەیوەستە بە خودی ئافرەتان. و الله أعلم.

ئێمەی موسڵمان ئەو باوەڕەمان هەیە کەوا خوای گەورە ئێمەی خولقاندوە، خولقێنەر دەزانێ چی باشە بۆ مەخلوقاتی، جا ئەگەر خولقێنەر خوایەکی زاناو داناو بەسۆزو بەزەیی بێ، مەحالە بەرنامەی خراپ و نا دروست بۆ بەندەکانی بریار بدات تاوەکو پێوەی ماندووبن یان تووشی سەرلێ شێواوی بن. (معاذ الله) ئەوە زۆر دوورە لە خوای گەورە. بە پێچەوانەوە بەرنامەیەکی تۆکمەو تەواوی ژیانی بۆ دارشتووین بەدەستێکی پاك و ئەمین بۆی ناردووینەتە خوارەوە، کەسیش ناتوانێ دەستکاری بکات و بیگۆرێ تاوەکو کۆتایی ژیان لەسەر ئەو زەویە، پێغەمبەریشی بۆناردوون بۆ شیکردووینەوە و روون کردنەوەی ئەو بابەتانەی لە تێگەیشتن وفەهمی جیاوازی

هەیە وخیلافی لەسەر دروست دەبێت. بەڵام بەرنامەکانی تری سەر زەوی کە دەستکردی مرۆڤن، لە ئەنجامی هەواو ئارەزوو یان فەهم وبیری یەکێك یان چەند کەسێك دانراون، یان لە ئەنجامی تەجروبەو تاقیکردنەوەی ڕۆژانە دانراوە، یان عورف وعادەتی کۆمەڵگەیەك بووە، گۆڕانکاری بەسەردا دێت بەگۆڕانی کۆمەڵگەکە، گۆڕانی دەسەڵات، گۆڕانی کات وشوێن. ئەو بابەتەی ئێمە ئێستا باسمان لێ کرد، خوای گەورە جۆرەکانی شایەتی دانی بۆمان ڕوون کردۆتەوەو ڕێگەشی پێداوین بۆ هەوڵ و ئیجتهاد لەو بوارەوە بەمەرجێ دژایەتی نەصەکانی قورئان وفەرموودەکان نەبێ. ئەگەر تەماشای واقیع وژیانی ڕۆژانەی خەڵکی بێ باوەڕیش بکەین لەسەر زەوی دەبینین لە زۆربەی وڵاتان کاری ئابووری ومالْ وگرێ بەستەکانی بازرگانی و کاری بۆرصەکان پیاوان ئەنجامی دەدەن وهەر ئەوان تیایدا وەکیل وکەفیل و شاهیدن . بەهەمان شێوە لەکاروباری دادگاکان، دەبینین لە زۆربەی وڵاتان قازی و دادوەر وپارێزەرانی ماف لە پیاوانن. ئەو کەسانەی زۆر بەتەنگ ئەوەن کەوا ئافرەت لە هەموو شتێك چاو لێکەری پیاو بکاتەو بەزۆر بەشداری پێ بکات لە هەموو شوێنەکانی شیاوو ناشیاو بۆ ئەو ڕەگەزە (خاوەن سۆزو عاتیفەی زالْ بوو)، ئەوا با بۆ خۆیان تەجروبە بکەن لە یەکێك لە وڵاتەکانی پارێزەری مافی ئافرەتان بزانن ئەو دادگایەی لە قازی ودادوەرو پارێزگارو شایەدەکانی گشتی ئافرەت بن، ئایا ئەنجامی کاری ئەو دادگایە بەچی دەگات و بەرهەمەکەی چۆن دەبێت؟ من لەو باوەڕە دام کەوا هیچ وڵاتێك هەرچەندە خۆی بە ماف پەروەرو دیموکراسی دابنێ کاری وا ناکات، چونکە ئەو وڵاتانە زۆر شت تەجروبە دەکەن پێش ئەوەی بڕیاری لەسەر بدەن، بۆیە لە هیچ وڵاتێك لەو وڵاتانە ئەو جۆرە دادگایەو شایەتی دانە نەبینراوەو نەبیستراوە، چونکە ئەو کات لە جیاتی دادگای کردن، ماف پاراستن، ماف وەرگرتن دەبێتە شوێنی بەزەیی و پاڕانەوەو بگرە شوێنی گریان وفرمێسك ڕژان، ئەوا لەجیاتی دادگا دەبێتە شوێنێك (هەر لە شوێنی ماتەمینی) دەچێت و هەزارەها تاوانبار بەبێ سزا دەرباز دەبن، هەزارەها ماف خوراویش بێ بەش دەبن.

لە کۆتاییدا دەڵێم سوپاس بۆ خوای گەورە ئێمە پێویستمان نیە کارەکانمان بخەینە ژێر تەجروبەو تاقی کردنەوە تاوەکو بزانین دەگونجێ یان نا، چونکە خولقێنەرمان لە هیچ شتێکی گەورەو بچوك، بەنرخ وبێ نرخ، سووك وقورس بێ بەرنامەی نەکردووین، پێویستمان بە بەرنامەی کەسی تر نیە لە هیچ بوارێکی ژیان هەتا هەتایە، لە هەموو کات وهەموو شوێنێکدا. بەڵگەشمان بۆ ڕاستی قسەکانمان هەرکات موسڵمانان بەرنامەی خوای گەورەیان لە ژیانی خۆیان وکۆمەڵگەکەیان چەسپاندبێ ئەوا لە گشت بوارەکان ژیان پێشکەوتوو وسەرکەوتوو بوون، خەلافەتە گەورەو پان وبەرینەکان وئیمارەتە باڵا دەستەکانی مێژووی ئیسلام شاهیدی ئەو باڵادەستیەن و ڕاستیەن.

# بەشی شەشەم

## کاروباری دەوڵەت

## ( الولایة )

باسی یەکەم : بەشداری ئافرەت لە کاروباری رامیاری

باسی دووەم : سەرۆکایەتی

باسی سێیەم : وەزارەت

باسی چوارەم : قەزاوەت

باسی پێنجەم : کاری بازار

باسی شەشەم : رای نووسەر

هەرکاتێك باسی ئافرەت و مافەکانی دەکرێت، لایەنێکی زۆر گرنگ دێتە پێشەوە ئەویش وەرگرتنی پۆستە بەرزەکانی وولاتە، واتە دانانی ئافرەت لە بەڕێوەبەرایەتی کاروبارە گشتیەکانی ژیان و پۆستەکانی سەرکردایەتی. ئایا ئافرەت ئەو جۆرە پۆست ولێپرسراویەتیەی پێدەدرێت؟ یان ئەو جۆرە پۆستانە تەنها بۆ نێرینەیە؟ ئایا ئافرەت دادەنرێت بە سەرۆك و قازی و وەزیر؟ ئەو بەشەمان تەرخان کردووە بۆ وەلامی ئەو پرسیارانە.

بێگومان ئاینی ئیسلام، ئاینێکی گشت گیرە، هەموو لایەنەکانی بەڕێوەبردنی ژیانی ڕوون کردۆتەوە، هەروەها ئاماژەشی بەوە کردووە کەوا کام کار گونجاوو شیاوە بۆ نێرینەو مێینە تاوەکو سەرگەردان نەبن وژیانێکی ئاسوودە ببەنە سەر و بەسەرکەوتوویی ڕەوڕەوەی کۆمەلگەو مرۆڤایەتی بەرەو پێشەوە ببەن. بەلام پێویستی بەوە هەیە کەوا باسی حیکمەتەکانی خوای گەورە بکرێت بە شێوەیەکی زانستیانە تاوەکو بتوانین بڕیاری دروست بدەین دەربارەی دیاری کردنی ڕەگەزی گونجاو بۆ ئەو کارانە، بەتایبەتی لەو سەردەمەی ئێستاماندا کەوا بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە یەکسانی تەواو هەبێت لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا لە هەموو شتێك بەبێ هەلاوێران، ئەو یەکسانیەش وا لەقەلەم دراوە کەوا ڕێز گرتن و بەرز ڕاگرتنی ئافرەتە.

ئێمەی موسولمان پێویستە بۆ هەموو کارێکی دونیاو ئاینی بگەڕێینەوە سەر قورئان وسوننەت تاوەکو بتوانین بڕیاری ڕاست ودروست لەو بارەوە بەدەست بهێنین، هەر ئەویشە کە ڕێزی ئافرەت وسەربەرزی وسەرفرازی تیایە.

کەم بەشداری ئافرەت لە کاری ڕامیاری و بێبەش کردنی لە هەندێ کاری تر زۆربەی وولاتان وکۆمەلگەکانی گرتۆتەوە بەبێ هەلاوێران، واتە دیاردەیەکی نێو نەتەوەیی یەو پەیوەست نیە بە نەتەوەیەك، یان چینێك، یان ئاینێك ومەزهەبێك. چونکە بە شێوەیەکی گشتی بەرەنگاری و ڕووبەڕوو بوونەوە ڕەگەزی نێرینە پێی هەلدەستێت، بە هۆی سروشتە توندو زبرو توانای جەستەییەکەی، هەر بۆیە

دەسـەڵات و پلـەی بـەرزی لێپرسـراویەت بـەو دراوە، بـەڵام ئـەوەش واتـای ئـەوە ناگەیەنێ کەوا ئافرەت هـیچ جۆرە بەشـداریەکی نـەبووە، بـەڵکو هەنـدێ بەشـداری هەبووە بە گوێرەی شوێن و کات.

# باسی یەکەم

## بەشداری ئافرەت لە کاروباری ڕامیاری

**بەندی یەکەم: لایەنە پۆزەتیڤەکان**

**بەندی دووەم: لایەنە نیگەتیڤەکانی بەشداری ئافرەت**

**بەندی سێیەم: هۆیەکارەکانی سەرنەکەوتنی ئافرەتان لە کاروباری ڕامیاری بە شێوەیەکی گشتی**

## بەندی یەکەم: لایەنە پۆزەتیڤەکان

1- دروست کردنی کەسایەتیەکی پۆزەتیڤ، خۆ ناسین، لە میانەی هەست کردن بە لێپرسراویەتی لە ژیان. ئەوەش کاریگەریەکی زۆری هەیە لە سەر بونیادنانی کەسایەتی وهاوسەنگی دەرونی کۆمەلایەتی ئافرەت، لەو پالەپەستۆیە دەرونیەش دەرباز دەبێت کە لەناو دەرونی پەنگی خواردبۆوە بەوەی بە چاوێکی کەم وبێ هێز تەماشا دەکرا. دوای ئەو بەشداریە هەست بە هێزو توانا دەکات، شانازی بە بنەماکان دەکات وهەوڵی بۆ دەدات.

2- فراوان کردنی ئاسۆی رامیاری وهەزری.

3- بەشداری لە کاری رامیاری وا دەکات زیاتر پەرۆش وخەمخۆری کێشەکانی نیشتمان وگەل ونەتەوە بێت .

4- وای پێدەکات لەگەڵ کێشەو خەمەکانی خەڵکی تردا بژیت.

5- بەشداری ئافرەت لە هەڵبژاردنەکان، بۆ دەنگدان بە خەلکی باش وشیاو، بەشداری لە شوێنی بریاردان، کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر دروست کردنی گۆرانکاری کۆمەلایەتی ورامیاری ناو کۆمەڵگە.

6- بەشداری لە خۆپیشاندانەکان وا لە ئافرەت دەکات لەگەڵ پێداویستیەکانی کۆمەڵگەدا بژیت، هەست دەکات وا لە بازنەیەکی گەورەتر دەژیت لە بازنەی خێزان، ئەندامێکی چالاکە لە کۆمەڵگە.

7- توانای ئەوەی پێ دەبەخشێ کە گفتوگۆ بکات وبەرگری لە بیروباوەرو بنەماکانی بکات.

8- دەتوانێ منداڵەکانی گۆش بکات بەو بیرو باوەرەی کە هەیەتی، هەروەها دەتوانێ هانی هاوسەرەکەشی بدات بۆ بەشداری کردن.

9- چاودێری کردنی کاروباری کۆمەڵگە، هەنگاونان بۆ لابردنی زولم وفەساد.

## بەندی دووەم: لایەنە نیگەتیڤەکانی بەشداری ئافرەت

1- برو ڕێژەو ئاستی سەرکەوتنیان کەمترە لە برو ئاستی سەرکەوتنی پیاوان. چونکە کاری ڕامیاری پێویستی بە زۆر سیفەتی تایبەت هەیە، کەمی لە ئافرەتان بەدی دەکرێت بەبەراورد لەگەڵ پیاوان، بۆیە پلەو ڕێژەی ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی دەهێنێ کەمترە، ئەگەری هەرەس هێنانیشی زیاترە لە کارەکانی بە شێوەیەکی گشتی بەبەراورد لەگەڵ پیاوان. هەندێ لەو سیفەتانە لە خوارەوە دەیانخەینە ڕوو.

2- لە هەموو کات وساتەکاندا ناتوانن بەبەردەوامی، بە هەمان ئاستی سەرکەوتن کارەکان ئەنجام بدەن، لەبەر هەندێ هۆکاری فسیۆلۆژی وبایۆلۆژی.

3- ئەو کارانە کاریگەری سەلبی هەیە لە سەر خودی ئافرەتەکە لە ڕووی جەستەیی ودەروونیەوە، بەتایبەتی کارە قورسەکان لە کاتی سك پڕی، کاتە ناسکەکانی تر.

4- ئەو جۆرە بەشداریەو بەشداریەکانی تری ئافرەت بە گشتی کاریگەری سەلبی هەیە لە سەر خێزان وکۆمەڵگەو دەوڵەت.

کاریگەری سەلبی هەیە لەسەر خێزان: چونکە کار دەکاتە کرداری منداڵبوون، کاردەکاتە سەر پەیوەندی نێوان ئەندامەکان، ئەرکەکانیماڵەوە.

کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە و دەوڵەت:

أ- لە ڕووی ئابووریەوە:

* زۆربەی کارەکان بۆ ئافرەت ماندوو بوونی تیایە، بۆیە ناتوانێ لە کارەکانی بەردەوام بێ وپێویستی بە پشوودانی زۆر دەبێ، بەمەش زیانێکی ئابووری لێدەکەوێتەوە.

* هەر کارێك برەکەی کەم بوو، یان ئاستی کارو بەرهەمەکانی بەرز نەبوو ئەوا زیانی زیاترە لە قازانجی.

* ئەگەری تووش بوونی بە نەخۆشی زیاترە، چونکە ئەو جۆرە کارانە نەگونجاوە لەگەڵ پێکهاتە خۆرسکیەکەی، بەمەش پێویستی بە چارەسەری پزیشکی دەبێت، کەواتە زیانی ئابووری بۆ خێزان و دەوڵەت هەیە.

ب- لە ڕووی ڕامیاریەوە:

* نزمی ئاستی سەرکەوتن لە کاری ڕامیاری زیانە بۆ گشت کۆمەڵگەو وڵات لە هەموو بوارەکانی ژیان بەبێ هەڵاوێران.

ج- لە ڕووی دیمۆگرافیەوە:

دوور کەوتنەوەی ئافرەت لە کاری ماڵ ومنداڵبوون وپەروەردە، زیانی زۆری تیایە لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و جۆری پێگەیاندنی گەنج ولاوەکان (الكمية والنوعية).

د- لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە:

دروست بوونی کێشەی ناو خێزان، کێشەی بێ کاری پیاوان، کێشەی ئاینی.

5- بێگومان ئەو کارانە دەبنە هۆی کەوتنە ناو هەندێك گوناهو تاوان بەتایبەتی تێکەڵاوی ومانەوەی لەگەڵ خەڵکانی نا مەحرەم لە کاتی دانیشتنەکان ودانووساندنەکان، لە کاتی هاتنی شاندەکانی ناوەوەو دەرەوە، هەروەها کاتی چوونە دەرەوەی بۆ کاری سەربازی و چوونی بۆ وڵاتانی دەرەوە.

ئەو کارانەی کەوا ئافرەتان دەیانەوێت لە جیاتی پیاوان ئەنجامی بدەن بە تایبەتی لە ڕووی ڕامیاریەوە، ئەوا پیاوان خۆیان دەتوانن ئەنجامی بدەن بە چاکتر وباشتر، بەڵام هەندێ لەو کارانەی کەوا ئافرەتان بۆیان دارێژراوە ودیاری کراوە کە ئەنجامی بدەن، ئەوا هەموو پیاوانی دونیا ناتوانن ئەنجامی بدەن، چونکە هەرگیز پێکهاتەی پیاو لەگەڵ ئەو جۆرە ئەرکانە ناگونجێ ئەویش منداڵبوون وپەروەردە کردنیەتی.

## بەندی سێیەم: هۆكارەكانی سەرنەكەوتنی ئافرەتان لە كاروباری رامیاری بە شێوەیەكی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ:

1- نەبوونی زەمینەیەكی مێژوویی وكلتوری بۆ ئەو بەشداریە بە درێژایی مێژوو، تایبەتمەند كردنی ئەو كارە بە پیاوان لە ناو زۆربەی كۆمەڵگەكان بە بێ جیاوازی، لێ راهاتنی هەموو كۆمەڵگەكان لەسەر ئەو جۆرە بارودۆخەوە.

2- ئەو رۆڵە كاریگەرەی ئافرەت دەیگێڕێ لە ماڵەوە، كە بێگومان هیچ ئەلتەرنەتیڤێك نیە(البدیل) كە ئەو شوێنە گرنگە بگرێتەوە، وای كردووە ئافرەت لە كاری رامیاری دوور بن.

3- سروشتی پێكهاتەی جەستەیی ودەروونی تا رادەیەكی زۆر گونجاو نیە بۆ ئەو كارانە، ئارەزوویەكی خۆویستەشیان نیە بۆ بەشداری لەو كارانە.

4- دەست بەسەراگرتنی(ئیحتیكار كردن) ئەو جۆرە كارانە لە لایەن پیاوەكان لە دێر زەمانەوە لە گشت كۆمەڵگەكان، وای كردووە بوار نەڕەخسێت بۆ ئافرەتان كە خۆیان لەو كارانە بدۆزنەوە.[1]

5- لە هەموو وولاتان وكۆمەڵگەكان وپارتە رامیاریەكان، بە چاوێكی سەلبی دەڕواننە بەشداری كردنی ئافرەت لە كاروباری رامیاری. ئایا ئەو تێڕوانینە سەلبی یە لەبەر ئەوەیە كە بە تەجروبەی مێژوویی بۆیان دەركەوتووە كەوا زۆربەی ئافرەتان ئەو سەركەوتنانە بەدەست ناهێنن لەو بوارەوە بەبەراورد لەگەڵ پیاوان، یان زۆربەی ئەو تەجروبانە هەرەسیان هێناوە پاش ماوەیەك؟ یان هۆكاری تر، وەك: كاری خۆشەویستی، یان شوو كردن، یان دەست لێك بەردان لە نێوان ئەندامانی ئەو خێزانانەی كە فەرمانڕەوایەتیان دەكرد، وەك بیستمان كەوا زۆربەی هۆكاری لێكترازان وناكۆكی نێوان فەرمانڕەوایەتی پادشایەتیەكانی وولاتانی ئەوڕپی لە سەدەكانی ناوەڕاست لە بەر ئەو هۆیانەوە بوو.

---

1ـــ ملخص المنهج الداخلي للأحزاب العراقية للقومية والعلمانية والإسلامية. بنـود: عمـل المرأة وحقوقها وكيفية مشاركتها.

# باسی دووەم

## سەرۆکایەتی وولات

## ( رئاسة الدولة )

## بەندی یەکەم: واتای ولایەت وسەرۆکایەتی

### بڕگەی یەکەم: واتای زمانی و زاراوەیی ولایەت

#### یەکەم: واتای زمانی

الولي: وەلی: الناصر: پاڵپشت، هەڵسوڕێنەری کاری دونیاو ئادەمیزادان.

والی(الوالي): خاوەنی شتەکان وهەڵسووڕێنەریان. ئیبن ئەثیر دەڵێ: والی بە واتای هەڵسووڕێنەر دێت ، بە توانایی، کارگوزار، هەریەکێك ئەو سیفەتانەی تیا نەبێ بە والی دانانرێ. گووتراوە: وەلی هەروەك پێشەوا وایە. فلان وەلی یەکێکە: بە واتای کارەکانی ئەنجام دەدات وکەفالەتی دەکات. الوِلاية بالكسر: واتای گرتنە دەستی کار دێت. والوَلاية بالفتح والكسر: بە مانای پاڵپشت وبەهاناوە هاتن دێت.[1]

لە فەرهەنگی(المعجم الوسيط)دا هاتووە: ( ویلایەت بەو واتایانە دێت: نزیکایەتی، پیلان، پێشەوا، دەسەڵات، ئەو وڵاتەی والی دەسەڵاتی بەسەردا هەیە).[2]

#### دووەم: واتای زاراوەیی

دەسەڵاتێکی شەرعیە بۆ ئەو کەسەی توانای هەیە لەسەر جێبەجێ کردنی کارو گرێ بەند و بەڵێن نامەکان.[3]

بەمانای: جێبەجێ کردن وسەپاندنی فەرمانەکان لە سەر خەڵکانی تر هاتووە بە خۆشی و ویستی خۆیان، یان بە ناخۆشی و زۆر سەپاندن.[4]

(الولاية) بە مانای: دەسەڵاتێکی شەرعیە لە دەست کەسێکە، وا لە خاوەنەکەی دەکات هەڵسوکەوتێکی دروست بڕیار بدات، لە سەر خۆیی و خەلکانی تر پەیڕەوی

---

1ـــ ابن منظور، لسان العرب، 400/15-404. و 406/15.
2ـــ الدمشقي، علاء الدين محمد بن علي ت:1088هـ، المعجم الوسيط، 1070/2.
3ـ السيوطي، جلال الدين، الأشباه والنظائر في قواعد وفروع فقه الشافعي، ص284.
4ـــ للجرجاني، التعريفات، ص138.

بکات بە خۆشی یان ناخۆشی .[1]

هەموو نەتەوەیەك گرنگی بە کاروباری وولاتەکەیان دەدەن، چونکە چاکی و باشی کۆمەڵگە بە چاکی وباشی ئەو کەسەوە بەندە کە وولاتەکە بەڕێوە دەبات. ئەگەر ئەو لێپرسراویەتیە بدرێتە یەکێکی نا شیاو ئەوا وولات بەرەو هیلاکی و وێرانکاری، خەڵکیش بەرەو سەرلێشێواوی دەبات.

وەرگرتنی ئەو پۆستانە یەکێکی دەوێت، هۆشێکی پێگەیشتوو، هەزرێکی ساغ، توندو تۆڵی جەستە، بەردەوامی وخۆڕاگری ومتمانە بە خۆبوونی تیا بەدی بکرێت لە گشت کاتەکاندا.

## بڕگەی دووەم: واتای زمانی وزاراوەیی سەرۆکایەتی

### یەکەم: واتای زمانی

الرئيس: گەورەی نەتەوەکە، وهو الرأس أيضاً: بە واتای سەر، ئەنجامدەری کارەکانیان (القيّم)، لە پێشەوەی ئەوانە (مقدمهم)، واتە ئەگەر سەرەکەیان باش و چاك بوو ئەوا خۆیان کاروباریان باش دەبێت.[2]

بۆ سەرۆکی وولات سێ نازناویان داناوە: الخليفة: جێنشین، أمیر المؤمنين: پێشەوای موسلمانان، الإمام: ئەو کەسەی خەڵك بەدوای ئەو وەستاون، خەڵکان شوێنی کەوتوون.

پێشەوایەتی گەورە (الإمامة العظمی): الأم بالفتح: القصد، مەبەست، أمّه يؤمُّه أمّاً: تقدمهم: لە پێشەوەیانە، واتە ئەوەی لە پێشەنگی خەڵکەوەیە، جا بۆ ڕێگەی ڕاست یان چەوت بە پێشیان کەوتووە. أي اقتدى بە: خەڵکان ئیقتیدایان بەو کردووە جا بۆ نوێژ بێت یان بۆ کاروباری وولات.[3]

---

1ـــ أنور، حافظ محمد، ولاية المرأة في الفقه الإسلامي، ص27.

2ـ ابن منظور، لسان العرب، 80/5.

3ـــ ابن منظور، لسان العرب، 22/12-25.

**دووەم: واتای زاراوەیی**

سەرۆکایەتی: ئیمامی جوەینی[1] دەڵێ: سەرۆکایەتیەکی تەواوە، گەورەییەکی گشتی یە، پەیوەستە بە تاك وکۆمەڵ لە کاروباری دونیاو ئاین.[2]

ئیمامی ماوردی لە پێناسەی سەرۆکایەتیدا دەڵێ: پێشەوا وەك جێنشینی پێغەمبەران بۆ چاودێری وپارێزگاری ئاین وڕاپەڕاندنی کاروباری رامیاری دونیایی دانراوە.[3]

لەبەر ئەوەی ئاینی ئیسلام بریتیە لە کاروباری دونیاو ئاین، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەوای ئاینی وڕاپەڕێنەری کاری دونیاو دادوەری گشتی وچاودێری کۆمەڵایەتی، سەرکردەی جەنگ بووە، بۆیە زۆربەی زانایان بە پەسەندی نازانن ئەو پۆستەو پلەوپایە بدرێت دەست ئافرەت چونکە بۆی گونجاو نیە توانای هەڵسوڕانی ئەو هەموو ئەرکەی نیە لە هەموو کات وساتەکاندا.

## بەندی دووەم: بەڵگەکان لەسەر جائیز نەبوونی ئەو پۆستە بۆ ئافرەت

### برگەی یەکەم: بەڵگەکانی قورئانی

هەروەك لە زۆر شوێن باسمان کرد کەوا پلە وناستی توندو تۆڵی و عەزیمەت و هیممەتی نێرینە بە شێوەیەکی گشتی بەرزترە لە مێینە لە تێکڕای کاتەکانی ساڵ. ئەو سیفەتانەش ناسراون بە (القوامة والدرجة). ﴿الرجال قوّامونَ على النّساء﴾ ﴿وللرّجالِ عَلَيهِنَّ دَرَجَة﴾

---

1 ـ الجويني: إمام الحرمين، ضياء الدين عبد الملك بن عبد الله النيسابوري: زاناو فەقیە ئەدیب ونووسەرو ڕاڤەکار، لە ساڵی 419 ك لە نەیسابوور لە دایك بووە، لە شاری مەککە ژیاوە، کتابێکی زۆری داناوە، لە ساڵی 487 ك لە نەیسابوور کۆچی دوایی کردووە. ابن خلكان، أحمد بن محمد، وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، 167/3.

2ـ الجويني، عبد الملك بن عبد الله، غياث الأمم في التياث الظلم، ص 15.

3ـ الماوردي، الأحكام السلطانية، ص5.

## بڕگەی دووەم: بەڵگەکانی فەرموودە

لە ئەبی بەکرەوە [1] هاتووە، کاتێ کە هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا کەوا فارسەکان کچی کیسرایان کردۆتە گەورەی خۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ئەو نەتەوەیە سەرکەوتوو نیە کە پێشەواکەیان ئافرەت بێت)). ((ما أفلح قوم ولّوا أمرهم امرأة)).[2] ئەبی بەکرە دەڵێ زۆر سوودم لەو فەرموودەیە وەرگرت بۆیە لە شەڕی (ووشترەکە– الجمل) کشامەوە.

زانایانی ئیسلام بەگشتی، وا لەو فەرموودەیە گەیشتوون کەوا هەرکات ئافرەت سەرۆکایەتی نەتەوەیەك بکات، ئەوا ئەو نەتەوە سەرکەوتوو نابێت. بۆیە زانایان مەرجی ئەوەیان داناوە بۆ پۆست وپلەوپایەی سەرۆکایەتی دەبێت نێرینە بێت. [3]

## بڕگەی سێیەم: بەڵگەکانی عەقلی

أ– ئەگەر جائیز نەبێت ئافرەت پێشەوایەتی بکات لە نوێژدا، ئەوا بە شێوەیەکی ئەولاتر جائیز نیە پێشەوایەتی بکات لە کاروباری بەرزترین پلەی وولات وکاروباری موسڵمانان بە گشتی.[4]

ب– ئەو پۆستانە وا دەخوازێ بچێتە ناو کاروبارو شوێنی زۆر مەترسیدار، ئەو کارانەی توانایەکی جەستی قورسیان پێویستە هەروەك سەرکردەی سوپاو بەشداری ڕاستەوخۆ لەکاتی تەنگانەو نزیك بوونەوەی دوژمن، ئەو کارانەی زۆربەیان لە توانای ئافرەتدا نین، بەتایبەتی گەر لە کاتە ناسکەکانی ئافرەتدا بێت، وەك: بێ نوێژی یان سك پڕی یان زەیستانی یان کاتی خوێنداری بێت.

---

1ـــ أبو بكرة: نفيع بن الحارث بن كلدة الثقفي، ناسرابوو بە ئەبو مەسروح، هاوەڵێکی بەڕێز بوو، لە شاری تائیف موسڵمان بوو، لە شاری بەسرا ژیانی بەسەر برد وهەر لەوێش کۆچی دوایی کرد ساڵی 61 کۆچی، فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، زانایانیش لە خۆی ومنداڵەکانی وەرگرتووە. الإصـــابة، 467/6. وابن حجر، تهذيب التهذيب،469/10. وابن حجر، تقريب التهذيب، ص565.

2ـــ البخاري 96- الفتن باب:17 حديث:2686، 2600/6.

3ـ ابن قدامة،المغني، 380/11. وابن الرشد، بداية المجتهد، 395/2.

4ـ ابن قدامة، المغني، 533/2. وابن حزم الظاهري ،المحلي، 125/3. وابن الرشد، بداية المجتهد، 124/1. الشافعي، الأم، 145/1.

ج- لە مەرجەکانی پێشەوا ئەوەیە لە هەندێ کاتدا دەبێ نەرمی نەنوێنێ، سۆزو عاتیفەی بەسەریدا زاڵ نەبێت، وەك لە کاتی جێبەجێ کردنی سنوورەکانی خوا، کوشتارو لە سێدارەدان، جەنگ و بەرگری، گفتوگۆ لەگەڵ دوژمن. دەگمەنە ئافرەتان بتوانن خۆگر بن لەو کاتانەدا لەبەر زاڵبوونی سۆزو دڵ ناسکی بەسەر بیر و هۆشیان.[1]

1ـــ البدوي، عبد الرحمن ، مذاهب الإسلاميين، 631/1.

# باسی سێیەم

## وەزارەت

## ( الوزارة )

بەندی یەکەم : واتای زمانی وزاراوەیی وەزیر

برگەی یەکەم : واتای زمانی

برگەی دووەم : واتای زاراوەیی

بەندی دووەم : بەڵگەی ڕێگە نەدانی ئافرەت لە وەرگرتنی ئەو پۆستە

بەندی سێیەم : ڕای زانایانی کۆن لەسەر ڕێگەدانی ئافرەت بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستانە

بەندی چوارەم : ڕای زانایانی سەردەم لەسەر ڕێگەدانی ئافرەت بۆ وەرگرتنی ئەو پلەو پایانە

برگەی یەکەم : بەڵگەی ئایەتەکان

برگەی دووەم : بەڵگەی فەرموودەکان

برگەی سێیەم : ڕای پەسەندکراو

بەندی یەکەم : واتای زمانی وزاراوەیی وەزیر

## بڕگەی یەکەم: واتای زمانی

لە نێوان زانایان جیاوازی هەیە لە سەر ئەوەی ئایا ووشەی وەزیر لە چیەوە بنچینەی گرتووە، هەندێکیان دەڵێن: لە ووشەی پەناگە هاتووە (الملجأ) ، بنەچەکەی بریتیە لە چیای بەهێزو بەرگریکەر. یان بە واتای بارێکی قورس (الحمل الثقیل)، کۆیەکەی بارە قورسەکانە. بە واتای وزیر السلطان: وەزیری جێنشینە، بە واتای ئەوە دێت کەوا پشت بە ڕاو بۆچوون وپێشنیارەکانی دەبەسترێ لە کاروباری وولات، لە کاری تەنگانە وەك پەناگەیە. بە واتای قورسایی یە(الثقل)، واتە قورسایی جێنشین دەخاتە سەر شانی خۆی وجێبەجێی دەکات، هەروەها بە واتای: هاوکاری کرد لەکارەکانی توانای پێبەخشی(أعانه وقوّاه).[1]

## بڕگەی دووەم: واتای زاراوەیی

وەزیر لە دەوڵەتی ئیسلامی: دووەمین پلەی بەرزی وولاتە لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە ، ڕۆلێکی زۆر کاریگەریشی هەبووە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ڕامیاری و کۆمەلایەتی وبەڕێوەبەرایەتی، لە زۆر کاتدا ڕۆلی زیاتر گێڕاوە لە خەلیفەو جێنشین، ئەوەش بەهۆی بێ هێزی خەلیفە لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە، یان بەهۆی کەم تەمەنیەوە بێت.[2]

بەلام پلەوپایەی وەزیر لە حکوماتی ئەو سەردەمە، ناتوانێ بە بێ ڕێنمایەکانی سەرۆك وەزیران و سەرۆکی وولات کار بکات، کەواتە تەنها بریتیە لە پلەیەکی بەرزی بەڕێوەبردنی کاروباری وولات و بەس. خەڵکانێك دادەمەزرێنرێ، کە هەندێ لێهاتوویی و سیفاتی دیاری کراوی تیابێ.

وەزارەتیش دەکرێ بە دوو بەشی سەرەکی، وەزارەتی دەسەلات پێدراو (وزارة التفویض)، وەزارەتی جێبەجێ کردن (التنفیذ).

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 284/15. والفيروزآبادي، القاموس المحيط، 159/2.
2ـ طاهر قاسم، نظام الحكم في للشريعة والتاريخ، 409/1.

وەزارەتی دەسەڵات پێدراو: ئەو وەزارەتەیە کەوا سەرۆك یەکێك دیاری دەکات کەوا کارەکانی بۆ راپەڕێنێ بە بیروڕاو تێڕوانینی خۆی، دوایی سەرۆك واژۆی بڕیارەکەی دەکات.[1]

وەزارەتی جێبەجێ کردن: ئەوەیە سەرۆك یەکێك دەکاتە نوێنەری خۆی بۆ راپەڕاندنی کارەکانی وڵات، بێ ئەوەی ئەو کەسە دەسەڵاتی سەربەخۆی هەبێت لە هەموو بڕیارەکانی، واتە هەروەك نێوانێکە لە نێوان سەرۆك و هاووڵاتی.[2]

ناکۆکیەك و گوتەیەکی زۆر کرا لە سەر وەرگرتنی ئافرەت ئەو پۆستەیە لە وڵات، وەك: وەزارەت و سەرۆکایەتی بە شێوەیەکی بێ مەرج و مەرجدار. سێ رای جیاواز هەیە لەو بارەیەوە:

## بەندی دووەم: بەڵگەی رێگە نەدانی ئافرەت لە وەرگرتنی ئەو پۆستە

لەلایەن زانایانی مەزهەبەکان مەرجی یەکەم بۆ ئەو پۆستە بریتیە لەوەی کەوا لە رەگەزی نێرینە بێت، هەروەك چۆن لە جێنشین ئەو مەرجە هەبوو.

1- لە ئەبی بەکرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( ئەو نەتەوەیە سەرکەوتوو نیە کە پێشەواکەیان ئافرەت بێت)).

2- ئەگەر پێشەوایەتی ئافرەت بۆ نوێژ جائیز نەبێت، ئەوا بە هەمان پێوەر بۆ پلەی جێنشین جائیز نیە. وەزیریش وەك نوێنەری خەلیفەیە، ئەوەی لەسەر جێنشین جێبەجێ دەبێت لەسەر وەزیریش بەهەمان شێوەجێبەجێ دەبێت.[3]

3- وەزارەتیش پێویستی بە رای دروستە لەکاتی بڕیاری کۆتایی، هەروەها پێویستی بە هیممەت وعەزیمەت و توانایەکی چاکی بە رێوەبردن هەیە، ئەوانەش لە ئافرەتدا کەمتر بەدی دەکرێت.

---

1ـ الماوردي ، علي بن محمد البصري، الأحكام السلطانية و الو لايات الدينية، ص21.

2ـ الريس، محمد ضياء الدين، النظريات السياسية في الإسلام، ص224.

3ـ الماوردي، الأحكام السلطانية، ص 27. والسيوطي، جلال الدين، عبد الرحمن بن أبـي، حسن المحاضرة، 121/2.

4- وەرگتنی ئەو پۆستانە لەلایەن ئافرەتەوە پێچەوانەی هەردوو ئایەتی (القوامة والدرجة) یە.

5- نەبوونی دیاردەی وەرگرتنی ئەو پۆستەیە لە مێژووی خەلافەتەکانی ئیسلامی بە درێژایی 1400 ساڵ، بەڵگەیەکی مێژوویی یە بۆ جائیز نەبوونی.

6- کەوتنە ناو هەندێ کۆڕو کۆبوونەوەی وا، ئەگەری تووش بوونی بە هەندێ لە گوناهو تاوان دەبێت. وەك تەوقە کردن ولادانی سەرپۆش و تێکەڵاوی بەردەوام.

7- لە زۆر بارو دۆخدا، ئەو پلەو پایانە وا لە ئافرەت دەکات تووشی لە خۆبایی بوون وپشت گوێ خستنی ئەرك وفەرمانەکانی ماڵەوەی بکات.

## بەندی سێیەم: ڕای زانایانی کۆن لەسەر ڕێگەدانی ئافرەت بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە

1- ئیبن ڕوشدی قورتبی دەڵێ: ئیمامی تەبەری دەڵێ: جائیزە ئافرەت حوکم وەربگرێ بە شێوەیەکی تەواوی بەربڵاو(مطلق- غير مقيّد) بێ مەرج ولە هەموو کاروبارێکیشدا.[1]

2- ئیبن حەزمی زاهیری دەڵێ: جائیزە ئافرەت حوکم ودەسەڵات وەربگرێ، بەبەڵگەی وەرگرتنی(شیفا) کاروباری بازار لە سەردەمی ئیمامی عومەر.[2]

3- ئیمامی قورتبی گەورە لە کتێبی (الجامع لأحكام القرآن) دەڵێ: جائیزە ئافرەت حوکم وەربگرێ بە شێوەیەکی تەواوی بەربڵاوی بێ مەرج.[3]

1ـ ابن رشد القرطبي، الحفيد:بداية المجتهد ونهاية المقتصد ،395/2.
2 ـ ابن حزم الظاهري، المحلى، 429/9.
3ـ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 183/13.

## بەندی چوارەم: ڕای زانایانی سەردەم لە سەر ڕێگەدانی ئافرەت بۆ وەرگرتنی ئەو پلەوپایانە

ژمارەیەك لە زانایانی سەردەم، وەك: موحەمەد دروزە[1] ، موحەمەد مەهدی الحجوي[2]، مەحمود شەلتوت[3]، ڕایان لەسەر ئەوەیە كەوا جائیزە ئافرەت پلەی وەزیر (بەو واتایەی سەردەم) وەربگرێ. بەو بەڵگانەی خوارەوە:

### بڕگەی یەكەم: بەڵگەی ئایەتەكانی قورئان

1- ئەو ئایەتە ئاماژە بەو بنەمایە دەكات، كەوا نێرینەو مێینە لەیەك نەفس و یەك سەرچاوە هاتووە، كەواتە بە شێوەیەكی گشتی یەكسانن. خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: 1.

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ الحجرات:13.

ئەو دوو ئایەتە بەڵگەن لە سەر ئەوەی ئافرەت تەواوی كەسایەتی ئادەمیزادیەتی خۆی هەیە، واتە هەموو مافێكی كە پەیوەستە بە ئادەمیزاد هەیەتی وبۆی بڕیار دراوە، هەروەك چۆن هەموو ئەرك وفەرمانی لەسەرە وەك پیاو، بەهەمان شێوە هەموو مافێكی هەیە.[4]

---

1ـ دروزة، محمد، المرأة في القرآن والسنة، ص44-45.

2ـ الحجوي، محمد المهدي ، المرأة في الشرع والقانون، ص34 ،83.

3ـ محمود شلتوت، القرآن والمرأة، ص3. نقلاً عن الدكتور فؤاد عبد المنعم، المساواة في الإسلام، ص195-197.

4ـ بنت الشاطيء، عائشة عبد الرحمن ، المفهوم الإسلامي لتحرير المرأة، ص2.

2- خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ التوبة: 71.

ئەو ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئافرەتان وپیاوان پاڵپشتی یەکترین بۆ رێگرتن لە خراپەکاری وفەرمان بە چاکە کاری، هەر سێ دەسەڵاتی تەشریعی و قەزایی وجێبەجێ کردن مەگەر بریتی نین لە فەرمان بەچاکەو رێگرتن لە خراپە. کەواتە چۆن ئەوان بۆ ئافرەتان رەوایەو بەشدارن لەگەڵ پیاوان، بەهەمان شێوە وەرگرتنی ئەو پۆستانەش بۆیان رەوایەو تیایدا بەشدارن.[1]

3- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةًۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ النمل:32ـــ35

لەو ئایەتانەدا کەسایەتی ئەو ئافرەتە دیاردەکەوێت کەوا چۆن توانیویەتی و وڵاتەکەی لە رووبەڕوو بوونەوەو جەنگ بپارێزی، بە پشت بەستان بە ڕاوێژ کردن بە پیاوان، خۆ گونجاندن وفێڵ ومەکربازی.

4- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴾المجادلـــــة: 1. ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ڕای دروست وجورئەت وعەزیمەتی ئافرەت بۆ داواکردنی مافەکانی خۆی.

5- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴾القصص: 26 ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بیر تیژی

---

1 ــ محمد رشيد رضا، نداء إلى جنس لطيف، ص7.

كچەكەی شوعەیب، كە توانی بە ماوەیەكی كەم موسی پێغەمبەر÷ پێناسە بكات بە ئەمین وبەهێز.

**ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بیر تیژی و زیرەكی خوشكی موسی پێغەمبەر ﷺ كە توانی براكەی دەرباز بكات لەو تەنگژەی تێی كەوتبوو.**

ئەو بەڵگانە هەموویان ئاماژە بە بیر تیژی، پێشنیارو بڕیار دروستی هەندێك لە ئافرەتان دەكەن، كەواتە توانای هەیە بۆ بەشداری كردنی لە بەڕێوەبردنی كاروباری بەرزی وولات و وەرگرتنی پلەوپایەكانی بەرز.[1]

## بڕگەی دووەم: بەڵگەی فەرموودەكان

1- لە پەیمانی حودەیبیە، پێغەمبەری خوا ﷺ پرس وراوێژی بە ئوم سەلەمە ﷺ كرد كاتێ كە كێشە دروست بوو لەسەر دواخستنی چوونە ناو مەككە وسەربڕینی قوربانیەكان و سەرتاشین لەو شوێنەی كە موسڵمانەكان تیایدا پەیمانی حودەیبیەیان واژو كرد.[2]

2- ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەو پەنادانەی كە ئوم هانی كردبووی بۆ یەكێك لە بێ باوەڕەكان كاتی فەتحی مەككە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەوەی تۆ پەنات داوە ئێمەش پەنای دەدەین:((قد أجرنا من أجرت يا أم هاني)).[3]

3- سەركردایەتی عایشە ﷺ بۆ ئەو سوپایەی كە داوای خوێنی ئیمامی عوسمانی ﷺ دەكرد لەو كۆمەڵە یاخی بووەی كە چوونە بەسرە، كە توانای گفتوگۆو دانوساندن بكات، تاوەكو بە لێهاتوویی خۆی توانی ئاگری ئاژاوەو دووبەرەكی بكوژێنێتەوە .[4]

---

1ـ دروزة، محمد ، المرأة في القرآن والسنة، ص44-45.

2ـ ئەو بابەتە بە درێژی باس كراوە لە كتێبی( ئافرەت لە مێژوودا- دانەر) لە داهاتوویەكی نزیك.

3ـ ئەو بابەتە بە درێژی باس كراوە لە كتێبی( ئافرەت لە مێژوودا- دانەر) لە داهاتوویەكی نزیك.

4ـ ابن الأثير،عزالدين بن علي، الكامل في التاريخ، 105/3. والطبري، تاريخ الأمم والملوك، 165/3.

4- لە مێژووی ئیسلامیشدا نموونەی ژمارەیەك لە ئافرەتمان هەیە کە پۆستی سەرۆکایەتی وسەرکردەیان وەرگرتووە وتوانیویان بۆ ماوەك کاروباری وڵات بە شێوەیەك کە ڕەزامەندی خەڵکەکەی تیابووە بەڕێوە ببەن، وەك:
شجرة الدر- أم الخليل الصالحية[1]، کە حوکمڕانی میسری کرد.[2] هەروەها ضيفة بنت الملك العادل الأيوبي، کە حوکمڕانی شاری حەلەبی کرد بۆ ماوەیەك.[3]

4- ئەو فەرموودەی کە باسی ((لن يفلح)) دەکات ئەوە تەنها بۆ جێنشینی یە، نەوەك بۆ وەزیری، هەروەها دەڵێن تایبەتە بەوەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پاشەڕۆژ داهاتووی بنەماڵەی کیسرای بۆمان ڕوون کردۆتەوە وەك هەواڵێکی پەنهانی.[4]

## بڕگەی سێیەم: ڕای پەسەندکراو

بەشداری ئافرەت لە کاروباری ڕامیاری وبەڕێوەبردن- واتە پۆستی بەرزەکانی وڵات- زۆر کەمە، لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

1- چونکە ئەو کارانە پێویستی بە ئەزموون وپسپۆڕی ودەهاو مەکر، دەروونێکی فراوان، مێشکێکی سارد، کەم هەڵچوون، زۆر جاریش پێویستی بە دەرچوون هەیە لەگەڵ سوپا بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرنگاربوونەوە. هەندێ جاریش پێویستی بە فێڵ وهەڵخەڵەتاندن هەیە. ئەو سیفەتانەش دوورە لە سروشتی

---

1- شجرة الدر أم خليل الصالحية:لە ئەمیرە ناودارەکانی ئیسلامە، خێزانی صالح پاشا بوو، خاوەنی زیرەکی وفێڵی زۆر بوو، خێرخوازو چاکەکار بوو، دوای مردنی مێردەکەی، کوڕی هاوسەرەکەی کوشت لەبەر نەشیاوی لە بەڕێوەبردنی وڵات، خۆی حوکمڕانی وڵاتی گرتە دەست لە ساڵی 648 ك. هەرچەندە عزەددین بیك کاروباری بەڕێوەدەبرد بەڵام نەیدەتوانی بێ پرسی ئەو هیچ کارێك ئەنجام بدات. کحالة، أعلام النساء، 286/2-287.

2- الكبيسي، أحمد ، المرأة والسياسة في صدر الإسلام، ص144-147.

3- ضيفة خاتون:خێزانی زاهیر پاشای کوڕی سەلاحەددینی ئەیوبی بوو، حوکمڕانی حەلەبی کرد پاش مردنی عەبدولعەزیزی کوڕی، توانی 6 ساڵ وڵات بە شێوەیەکی جوان بەڕێوەببات، لە ساڵی 640ك کۆچی دوایی کرد. کحالة، أعلام النساء ،340/2. کحالة، المرأة في القديم والحديث ،234/1.

4- ابن حزم الظاهري، المحلي، 429/9.

ئافرەت کە ناسراوە بە بەزەیی وسۆزو عاتیفەیەکی بەرز، دڵ نەرمی، زوو هەڵچوون، هــەروەها نــەگونجاوە لەگــەڵ ئــەو گۆڕانکاریــە زۆرەی دێتــە ســەر بــڕو ڕێــژەی هۆرمۆنەکانی لە کاتە جیاجیاکـان(ساڵانە ومانگانـەو بگـرە هەفتانـەش)، هـەر ئـەو گۆڕانکاریانەش وا دەکات کە ئافرەتان بە شێوەیەکی گشتی کەمتر توانای خۆڕاگری وبەردەوامی و ململانێ وڕووبەڕوو بوونەوەیان هەبێت.

2- بەشـداری ئـافرەت لـەو جـۆرە کاروبارانـەدا زۆربـەی کـاتی بـووە، تـاوەکو هاوسەرەکەی لەسەفەر دەگەڕێتەوە، یان تاوەکو کوڕەکەی گەورە دەبێت وجێگەی باوکی دەگرێتەوە.

3- هەندێ جاریش بەشداریەکەی بـەهۆی هانـدان بـووە لەلایـەن پیاوێکـەوە بـۆ بەرژەوەندیەکی خۆی، بەڵام لە کۆتاییـدا ئافرەتەکـە پەشـیمانی خـۆی دەربڕیـە لـە جۆرە بەشدار بوونە. لەلایەکی ترەوە دەبینین زۆر سـەرکەوتوو بـووە لـە بەشـداری کاری پەروەردەو تەندروستی وکۆمەڵایەتی.

ئەو خوایەی شێوەو ڕووکارو پێکهاتەی هەموو بوونەوەرێکی بـە شـێوەیەکی وا خولقاندووە کـە گونجـاو بێـت بـۆ ئـەو کـارەی پێـی سـپاردراوە لـە ژیـانی دونیـادا، کارئاسانیشی بۆ کراوەو ڕێگەو بەرنامەشی بۆ دارێژراوە. ئادەمیزادیش- نێرو مێ - بەهەمان شێوەی هەموو بوونەوەرەکانی تر پێکهاتەی جەستەیی ودەروونی گونجاوە لەگەڵ ئەرك وفەرمانەکانی.

# باسی چوارەم

## قازی وقەزاوەت

(القضاء)

بەندی یەکەم: واتای زمانی وزاراوەیی قەزاوەت

بەندی دووەم: جائیز نیە ئەو پۆستە بدرێتە ئافرەت

برگەی یەکەم: بەڵگەی ئایەتەکان

برگەی دووەم: بەڵگەی فەرموودەکان

برگەی سێیەم: بەڵگەی عەقلی

بەندی سێیەم: جائیزە ئەو پۆستەیە بدرێتە ئافرەت

بەندی چوارەم: جائیزە ئەو پلەیە بدرێتە ئافرەتان تەنها بۆ سنوورەکانی خواو کوشتنەوە نەبێت

بەندی پێنجەم: ڕای پەسەند کراو

## باسی چوارەم: قازی وقەزاوەت (القضاء)

### بەندی یەكەم: واتای زمانی وزاراوەیی قەزاوەت

القضاء: حوكم، بڕیاری كۆتـایی هـەموو كێشەیەكە. أصـــله القطـــع والفــصل: بنچینەكەی لە بنبڕی ویەكلاكردنەوەی كێشەكان هاتووە.[1]

القضاء: بەرگری كردنە لە مافە زەوت كراوەكانی خەلك و بـەرگری لـەو كەسـەیە مافی خوراوە، وەرگرتنەوەی مافەكەیەتی لەو كەسەی كە مـافی خـواردووە لـەكاتی هاتنە بەردەم دادگا، بەمەرجی بوونی دادوەری ڕاستی.[2]

### بەندی دووەم: جائیز نیە ئەو پۆستە بدرێتە ئافرەت

زانایانی كۆن وەك ئیمامی شافعی[3] ومـالیكی[4] وحەنبـەلی[5] لەگـەلّ ئـەو ڕایـەن، بەم بەلگانەی خوارەوە:

### برگەی یەكەم: بەلگەی ئایەتەكان

**خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ﴾ قەزاوەت بەشێكە لـە ولایـەت، ولایـەت وهەندێك لەكارە گرنگەكان وەك تەلاق وجیهـادو نیكـاح تـایبەتـە بـە پیـاوان. بۆیـە ئـەو پۆستەش بۆ ئافرەتان نەگونجاوە.**

﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾: پیـاوان پلـەیان بـەرزترە لـە ئافرەتـان لـە هەنـدێ بواردا، بۆیە نابێت ئافرەت قازیاتی پیاوان بكات.

---

1ـ ابن منظور، لسان العرب، 209/11. الفيروز آبادي، القاموس المحيط، 281/4.
2ـ الحموي، إبراهيم بن عبد الله، أدب القاضي، ص54.
3ـ الماوردي، أدب القاضي، 625/1.
4ـ الدسوقي، محمد عرفة، حاشية على الشرح الكبير للدردير، 192/4.
5ـ ابن قدامة، المغني، 380/11.

**بڕگەی دووەم: بەڵگەی فەرموودەكان**

قـەزاوەت ولایـەتی بـچوكە، ئەگـەر ولایـەت بـۆ ئـافرەت نـەگونجاو بێـت ئـەوا بەهەمان پێوەر قەزاوەت وسەركردەی سوپاش نەگونجاوە بۆیان.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: چـونكە ئـافرەت میزاجـی گۆڕاوە، هەڵچوون وبڕیـاری خێرایە، كەواتە ڕایەكانی پەسەندو جێگیر نیە، بۆیە بۆ كـاری ئیمامـەت و ولایـەت و قەزاوەت ناشێت.[1]

لە ئەبی بورەیدە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا فەرموویەتیﷺ: (( قازیەكان سێ كەسن، یەكیان لە بەهەشت، دووانیان لە دۆزەخ، ئەوەی لە بەهەشتە (پیاوێكە) ڕاستی وهەقی ناسیوەو كاری پێدەكات، ئـەوی تریـان ڕاسـتی وهـەقی ناسـیوەو خواری دەكاتەوە، ئەوەی تریشیان قەزاوەت دەكات بـەبێ ئـەوەی زانیـاری هـەبێ: ((القضاة ثلاثة واحد في الجنة، واثنان في النار، فأما الذي في الجنة فرجل عـرف الحق فقضى به، ورجل عرف الحق وجار في الحكم فهو في النار، ورجل قـضى الناس على جهل فهو في النار)).[2]

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قازی دەبێ پیاو بێت.[3]

**بڕگەی سێیەم: بەڵگەی عەقلی**

لەبەر ئەوەی قەزاوەت وەك ولایەت وایە، كەواتە بە هەمان پێـوەری ولایـەت ئـەو پۆستە بۆ ئافرەتان جائیز نیە.

ئیبن قودامە دەڵێ: لەبەر ئەوەی لە پێش قـازی خـەڵكانی نـاكۆك دەوەسـتن بـۆ قەزاوەت، ئەو جۆرە شوێن وكارانەش پێویستی بە ڕای دروسـت و تـەواوی هـۆش و بیرو میزاج هەیە لە هەموو كاتەكاندا، ئەوەش بۆ ئافرەتان لـەبار نیـە هـەموو كـات،

---

1ـ المناوي، عبد الرؤوف، فيض القدير شرح الجامع الصغير ، 302/5.

2ـ سنن ابن ماجه الرقم:2315، 34/2. و سنن أبي داود كتاب: القـضاء، بـاب: فـي القاضي يخطىء، حديث: 3556، 5/4.

3ـ الشوكاني، نيل الأوطار، 167/9.

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وجێنشینەکانی، جێنشینەکانی تری دوای ئەوان وپێشەوای ولایەتەکانی ئیسلامی هیچ کات ئافرەتیان لەو پۆستەیە دانەناوە. ئەگەر جائیزیش بوایە ئەوا لە زەمانێك شتێکمان بەم شێوەیە دەبیست.[1]

## بەندی سێیەم: جائیزە ئەو پۆستەیە بدرێتە ئافرەتان

لە سەر ئەو ڕایەن کەوا پۆستی قازی جائیزە بدرێتە ئافرەت بۆ هەموو جۆرە قەزاوەتێك. خاوەنی ئەم ڕایەش ئەوانەن: ئیمامی تەبەری[2]، ئیبن حەزمی زاهیری[3]، ئیبن تەڕازی شافیعی[4]، حەتتاب[5]. بەم بەڵگانەی خوارەوە:

1- وەرگرتنی کاری حیسبە لەلایەن شیفاوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئافرەت دەشێت قەزاوەت وەربگرێ.

2- ئەگەر فەتوای ئافرەت دروست بێت، ئەوا بە هەمان پێوەر قەزاوەتەکەشی دروستە، چونکە مەرجی فەتوادان بوونی زانیاری تەواوە دەربارەی حوکمەکانی شەرعی، بەهەمان شێوە قەزاوەت بەندە بە زانستی شەرعی، کەواتە گەر ئافرەتەکە زانستی شەرعی هەبوو دەتوانێ قەزاوەت بکات.[6]

3- مەبەست لە حوکم، جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوایە، گوێ گرتن لە گووتەی هەردوو لای بەرامبەرو چارەسەری کێشەکەیان، ئەگەر ئەو کارە بە ئافرەت جێبەجێ بکرێت، ئەوا بۆی جائیزە.[7]

---

1ـ ابن قدامة، المغني ،380/11.
2ـ ابن رشد القرطبي، بداية المجتهد، 395/2.
3ـ ابن الحزم الظاهري، المحلي، 429/9.
4ـ القرطبي ،الجامع لأحكام القرآن، 183/13. وابن العربي، أحكام القرآن ، 136/2.
5 ـ الحطاب، شرح مختصر خليل،1887/6.
6ـ القرطبي ، الجامع لأحكام القرآن، 183/13. وابن العربي، أحكام القرآن، 136/2.
7ـ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 183/13. وابن العربي، أحكام القرآن، 136/2.

4- ئەو فەرموودەی باسی ئەوە دەکات کەوا هەر نەتەوەیەك سەرۆکەکەی ئافرەت بێت سەرکەوتوو نیە، ئەوە تەنها بۆ ئیمامەتی گەورەیە واتە جێنشین (خەلیفە) نەوەك بۆ قەزاوەت ووەزارەت وحیسبە.

**بەندی چوارەم: جائیزە ئەو پۆستەیە بدرێتە ئافرەتان تەنها بۆ سنوورەکانی خواو کوشتنەوە نەبێت (الحدود والقصاص)**

ئەوە ڕای حەنەفیەکانە کە دەڵێن ئافرەت دەتوانێ قەزاوەت بکات لە هەموو کاروبارەکاندا تەنها سنوورەکان وکوشتنەوە نەبێت، چونکە شایەتی دانیان لە هەموو شتەکان وەرگیراوە تەنها لە سنوورەکان وکوشتنەوە نەبێ، بە هەمان پێوەر قەزاوەتیشیان وەرگیراوە.[1]

1- حوکمی قەزاوەت لە حوکمی شایەتیەوە هەڵێنجراوە، هەردووکیان لە دەروازەی ولایەت دان، بۆیە ئەوەی بۆ شاهیدی گونجاو بێت بۆ قەزاوەتیش گونجاوە.

2- چونکە شایەتی ئافرەتان لە سنوورەکان وکوشتنەوە وەرناگیرێ، بۆیە لەو بوارانەش قەزاوەتیان لێ وەرناگیرێ.

لەو ڕایانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن بۆمان ڕوون بۆوە کەوا قەزاوەت کردنی ئافرەت بابەتێکی ئیجتهادیە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی قورئان وسوننەتی ڕاستەوخۆ نیە دەربارەی جائیز بوونی یان ڕێگە پێنەدانی.

1ـ المرغيناني، الهداية، 3/101-107. وابن العابدين، رد المحتار، 4/356. وابن الهمام،كمال الدين، فتح القدير على الهداية شرح بداية المبتدي للمرغيناني، ومعه شرح العناية للبابرتي، وحاشية سعدي أفندي، 5/485.

## بەندی پێنجەم: ڕای پەسەند کراو (الترجیح)

پیاو شیاو ترە بۆ پۆستەی قەزاوەت چونکە زانایان ئەو مەرج وسیفەتانەیان داناوە بۆ قازی.

1- پێویستە قازی شارەزاییەکی تەواوی هەبێ لە سەرچاوە وبنەماکانی تەشریعی ئیسلامی، توانای هەڵجاندن ودەرهێنانی حوکمی هەبێ، لە بەڵگە هێنانەوەو شیکردنەوە دەستی باڵای هەبێ، تاوەکو بتوانێ بە ئاسانی ڕاڤەی حوکمەکان بکات وحوکمی دروستیش بدات.[1]

2- دەرونەکی چەسپاو نەگۆڕاو، دڵێکی فراوانی توندو پتەو، هەڵنەچوون، خێرا بڕیار نەدان.

ئەو دوو خاڵە کەم جاری وا هەیە لە ئافرەتاندا هەیە بۆیە بۆ قەزاوەت کەمتر گونجاون. ئەگەر هەندێ لەو سیفەتانەشی تیابێ ئەوا بێگومان ناتوانێ ئەرکەکەی بە شێوەیەکی زۆر سەرکەوتوو ئەنجام بدات، چونکە سیفەتەکانی خاڵی دووەم لە خۆڕسکەوە لە ئافرەتاندا کەمە.

---

1 ـ الخصاف، أدب القاضي، ص29. والمودودي، للقانون الإسلامي والدستور، ص24-30. والنبهان، محمد فاروق، نظام الحكم في الإسلام، ص628.

# باسی پێنجەم

## کاری بازار

## (الحسبة والمحتسب)

بەندی یەکەم: واتا زمانی وزاراوەیی

بەندی دووەم: جائیزە ئافرەت ئەو پۆستەیە وەربگرێ

بەندی سێیەم: جائیز نیە ئافرەت ئەو پۆستەیە وەربگرێ

بەندی چوارەم: ڕای پەسەند

## باسی پێنجەم: کاری بازار (الحسبە والمحتسب)

### بەندی یەکەم: واتا زمانی وزاراوەیی

#### یەکەم: واتای زمانی

1- بە واتای جوانی وباشی بەرنامەو تەگبیر دێت. لێرە بەواتای پاداشی ماندوو بوون نایەت، بەڵکو بە واتای پوختەیی کاروبار دێت. المحتسب: موحتەسیب، ئەو کەسەیە کە پۆستی ڕێکخستنی کاری بازار دەگرێتە ئەستۆی خۆی. [1]

2- بە واتای ناڕەزایی دەربڕین لە کاری خراپە (احتسب علیه، یعني أنكر علیه قبیح عمله).[2]

#### دووەم: واتای زاراوەیی

فەرمان کردن بە چاکە ئەگەر نەمابوو، ڕێگە گرتن لە خراپە ئەگەر بڵاوبۆوە لەناو کۆمەڵگە.[3]

زانایانی سەردەم وا پێناسەیان کردووە: بریتیە لە چاودێری کردنی کۆمەڵگە لەلایەن دەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتی حکومی، بەمەبەستی چاکسازی وگێڕانەوەیان بۆ چاکەکاری ودوورکەوتنەوەیان لەو کارانەی کە زیانی هەیە بۆ خۆیان لە ژێر ڕۆشنایی هەندێ بنەماو دەستووری ئیسلامی.[4]

### بەندی دووەم: جائیزە ئافرەت ئەو پۆستەیە وەربگرێ

ئەو زانایانەی کە ڕایان وایە جائیزە ئافرەت ئەو پۆستەیە وەربگرێ ئەمانەن: ئیبن حەزمی زاهیری وئیمامی تەبەری و هەندێکی تر.[5]

---

1 ـ ابن منظور، لسان العرب، 166/3.

2 ـ الفیروزآبادي،القاموس المحیط،55/1.الزبیدي،تاج العروس من جواهر القاموس، 312/1.

3 ـ الماوردي، الأحكام السلطانیة، ص24.

4 ـ عبد العزیز محمد، نظام الحسبة في الإسلام، ص16.

5 ـ ابن حزم الظاهري، المحلي، 429/9. وابن رشد القرطبي، بدایة المجتهد، 395/2.

خوای گەورە فەرمانی بە ئێمە كردووە- نێرو مێ- كەوا فەرمان بەچاكە بكەین و ڕێگەش لە خراپە بگرین، كەواتە وەرگرتنی كاری حیسبە بۆ هەردوو ڕەگەز جائیزە بەو بەڵگانە:

1- هەروەك هاتووە لە وەرگرتنی شیفا بۆ پۆستی حیسبە لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر ﷺ، هەر ئەو بەڵگەیە وای لە زانایان كردووە كەوا مەرجی نێرینە هەڵگرن لەو جۆرە پۆست و پلەو پایانە.[1]

2- هەموو ئەو بەڵگانەی كەوا ڕێگە دەدەن بە ئافرەت پلەی قازاوەت وەربگرێ، هەر هەمان بەڵگە دروستە بۆ وەرگرتنی پلەی حیسبە.

## بەندی سێیەم: جائیز نیە ئافرەت ئەو پۆستە وەربگرێ

ژمارەیەك لە زانایان لەسەر ئەو ڕایەن كەوا جائیز نیە ئافرەت پۆستی حیسبە وەرگرێ لەسەر پیوەری جائیز نەبوونی پۆستی قەزاوەت. لەو زانایانە ئیبنی عەرەبی[2] و قورتبی.

1- حیسبە جۆرێكە لە ولایەت، بۆیە جائیز نیە.

2- ئیبنی عەرەبی[3] وقورتبی[4] دەڵێن: ئەو پلەی كە گوایە دراوەتە شیفا بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری حیسبە لە بازاری مەدینە هیچ بنەمایەكی مێژوویی وزانستی نیە بەڵكو هەڵبەستراوە.

3- چۆن ئیمامی عومەر ﷺ ئافرەتێك لەو پۆستەیە دادەنێ، كەوا بەردەوام بچێتە بازارو تێكەڵاوی خاوەن دوكانەكان بێت كە هەر هەموویان پیاو بوون، چۆن

---

1ـ الماوردي، الأحكام السلطانية، ص228.

2ـ ابن العربي:القاضي أبوبكر محمد بن عبد الله الأشبيلي المالكي. زاناو بلیمەت وفەقیهو موجتەهید بووە، لە زانا بەرزەكانی مەزهەبی مالیكیە، قازی ئەشبیلیە بووە، كتێبی زۆری هەیە، لەوانە: عارضة الأحوذي شرح للترمذي، أحكام القرآن. لە ساڵی 543ك وەفاتی كردووە. سير أعلام النبلاء، 197/20. والزركلي، الأعلام ،106/7.

3ـ ابن العربي، أبوبكر، أحكام القرآن، 144/3

4ـ القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، 183/3.

ئەو شتە باوەڕ دەکرێت لەلایەن ئەو کەسەوە بڕیار بدرێت کە خۆی خاوەنی بیرۆکەی خۆداپۆشین بووە، کە ئیمامی عومەرە ﷺ.

## بەندی چوارەم: ڕای پەسەند

لای خۆمەوە ئەو ڕایە پەسەند دەکەم کەوا دەڵێ جائیز نیە ئافرەت ئەو پۆستە وەربگرێ لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

1- نەبوونی ئایەت وفەرموودەیەك کەوا بە ڕاستەوخۆ ئاماژە بەو جۆرە بەشداریە بکات.

2- کاری حیسبە پێویستی بە چوونە دەرەوە وتێکەڵاو بوونێکی زۆر هەیە، ئەمەش کار دەکاتە سەر ئەرك وفەرمانی ماڵ وپەروەردەی منداڵ و کەوتنە ناو تێکەڵاوی گوناهو تاوان.

3- موحتەسیب لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خەلکانی بازار مامەلە دەکات، چاودێریی کۆگاو کارگەکان وچۆنیەتی دابەش کردن وفرۆشتنی کاڵاو کەلوپەلی بازار دەکات، لە زۆر باردا پێویست بە ئاگادار کردنەوەو بانگ کردن وسزادانیش دەکات، لەوانە هەندێك سەرپێچی کاران بنێردرێتە دادگا بۆ سزادان وبەندکردن. ئەو کارانەش پێویستی بە هیمەت وعەزیمەت ومتمانە بەخۆبوون وهێزو بازووی توند هەیە، کە ئەوانەش لەگەڵ سروشت وپێکهاتە ناسك ونەرم وسۆزو بەزەیی ئافرەت ناوەشێتەوە.[1]

1ـ الباجوري، جمال محمد، المرأة في الفكر الإسلامي، 209/2.

# باسی شەشەم

## ڕای نووسەر دەربارەی وەرگرتنی ئافرەت بۆ ئەو جۆرە پۆستانە

بەندی یەکەم: وەڵامی ئەوانەی لەسەر ئەو ڕایەن کەوا جائیزە ئافرەتان پۆستەکانی بەرزی وولات بگرنە ئەستۆ بە پشت بەستان بە ژمارەیەك لە ئایەتی پیرۆز

بەندی دووەم: بەڵگەی زانستی لە سەر ئەوەی کە ئافرەت گونجاو نین بۆ ئەو پۆستانە چونکە لە خۆرسکەوە خاوەنی ئەو سیفەتانەن

بەندی سێیەم: پیاوان شیاو ترن بۆ ئەو پۆستانە چونکە لە خۆرسکەوە خاوەنی ئەو سیفەتانەن

بەندی چوارەم: هەندێ هۆکاری تری کاریگەر لەسەر بەشداری ئافرەت لە پۆستە باڵاکانی دەوڵەت

بەندی پێنجەم: پوختەی پەسەند کراو

بێگومان زۆربەی ئەو کۆمەڵگەیانەی لەو ناوچە ژیاون کۆمەڵگەیەکی جەنگی بوون، واتە زۆربەیان لە نێوان خۆیاندا ناکۆکیان هەبووە لە سەر بەرژەوەندیەکان، هەروەك ئاگادارن کەوا گرنگترین و لە پێشەوەترین کاروباری رامیاری وولاتانی ئەو کات بریتی بوو لە چۆنیەتی خۆپاراستن یان بەرگری کردن لە خاك ونیشتمان، یان هێرش بردن وداگیر کردن، هەروەك بە ئاشکرا دیار دەکەوێت لە کاتی خوێندنەوەی مێژووی شارستانیەتەکانی کۆن وناوەراست وبگرە شارستانیەت وئیمپراتۆریەتە نوێکانیش. هەروەك ململانێی نێوان شارستانیەتی سۆمەری و ئاشوری وئەکەدی وبابلی ومیدی، دواتر ململانێی نێوان فارس وڕۆمەکان، تاوەکو سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام و ململانێی نێوان سەفەویەکان وعوسمانیەکان، هەروەها ململانێی نێوانی وولاتانی ئەوروپی وهەڵگیرسانی جەنگی یەکەم ودووەمی جیهانی. لە سەردەمی شارستانیەتە کۆنەکان لەکاتی جەنگدا تەنها ڕۆڵی کەسانی ئازاو بە توانا دیار بوو ئەوانیش بەبێ دوو دڵی هەر هەموویان لە ڕەگەزی نێرینە بوون، چونکە بەهۆی هێزی بازویان دەیان توانی ڕەوڕەوەی شەڕەکان بگۆڕن بۆ بەرژەوەندی وولاتەکەیان، لەو سەردەمانەدا ئافرەت هیچ ڕۆڵێکی نەبوو، بگرە لە هەندێ کات و شوێندا هەر کەسایەتی وناویشی نەبوو. لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی ئەو سەردەمە ئافرەت هەر وەك سێبەری پیاو وابوو، ببوو بە ئامێرێك بە دەست پیاو، تەنها بۆ ڕابواردن بەکار دەهێنرا، بەبێ هیچ هۆیەکیش دەستی لێبەردەدرا یان سزا دەدرا، زۆر جاریش تۆمەتی بۆ هەڵدەبەستراو دەکوژرا. هەروەك پەیکەرێکی بێ گیان وابوو، نەچالاکی هەبوو نە ڕۆڵی کۆمەلایەتی، هەر یەکێك ئەگەر هەردەم ژیانی لە مەترسی دابێ چۆن دەتوانێ ڕۆڵی ئیجابی ببینێ، یان بتوانێ داوای مافەکانی خۆی بکات، چەند نموونەیەکی کەم نەبێت بە درێژایی مێژوو ئەگینا ئافرەتان هەر ناویان نەبووە، ئەو نموونە کەم ودەگمەنانەش نابنە بەڵگەی بەشداری ئافرەت لە ژیانی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی بەرچاو.

ئەگەر بێت وباسی ئافرەتانی کۆمەڵگەکانی کۆن بکەین پێش هاتنی ئیسلام، بە ڕاستی و بە ڕاشکاوی دەبینین هەر وەك گیانەوەر مامەڵەی لەگەڵ کراوە، بەلام

ئێرە جێگەو شوێنی ئەو باسە نیە.[1]

شەریعەتی ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت ناوەو یەکسانی کردووە لەگەڵ پیاوان لە ڕووی مرۆڤایەتی یەوە، مافەکانی کەسایەتی وژیانی کۆمەڵایەتی پێداوە، ئەرك وفەرمانی دیاری کراوە، لە یەك نەفس دروستکراوەو تەواوکاری پیاوە، لە سزاو پاداشتییشدا یەکسانن، کەسیان لەوی تریان گەورەتر نیە لای خوا تەنها بە خوا پەرستی نەبێ.[2]

## بەندی یەکەم: وەڵامی ئەوانەی لەسەر ئەو ڕایەن کەوا جائیزە ئافرەتان پۆستەکانی باڵای وولات بگرنە ئەستۆ بە پشت بەستان بە ژمارەیەك لە ئایەتی پیرۆز.

هەندێ ئایەتی پیرۆز باسی چەند ئافرەتێکی بەڕێزی ناودار دەکات کە توانیویانە لە هەندێ باری تایبەتدا ڕۆڵی کاریگەر بگێڕن.

1- هاتنی ناوی ئەو ئافرەتانە، یان ئاماژە پێکردنیان بە واتای ئەوە دێت کەوا خوای گەورە ڕێزی هەیە بۆ ئافرەت، سەپاندنی مرۆڤایەتی ئافرەتەو لای خوای گەورە، ناوی وون نابێت وپاداشی هەیە گەر کاری چاك ئەنجام بدات. چونکە لە هەندێ مەزهەب وکۆمەڵگە ئافرەت هەر بە ئادەمیزاد نەدەژمێردرا.

2- خوای گەورە بۆمان ڕوون دەکاتەوە وپێمان ڕادەگەیەنێ کەوا ئافرەتیش کە پێکهاتووە لە جەستەو دەروون و خاوەن هۆش وبیر، لە توانای دا هەیە لە هەندێ کات و شوێنی تایبەت کاری سەرکردایەتی و پێشەوای کۆمەڵگە بگرێتە ئەستۆ، بە تایبەتی پاش ڕاوێژکردن بە پیاوانی خاوەن ئەزمونی ڕامیاری، هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز بۆمانی باس کردووە. هەروەها هەندێ ئافرەت توانای

---

1 ـ ئەو بابەتە بە درێژی باس دەکەین لە کتێبی ( ئافرەت لە مێژوودا- دانەر) لە داهاتوویەکی نزیك (إن شاء الله).

2- باسی مافی ئافرەت لە ئیسلامدا بە درێژی دەکەین لە کتێبی ( ئافرەت لە مێژوودا- دانەر) لە داهاتوویەکی نزیك (إن شاء الله).

ئەوەی هەیە كەوا بەرنامەی وا دابڕێژێ كە بە هۆیەوە بتوانێ خێزان وكەسوكاری دەرباز بكات لە تەنگژەیەك كە تێی كەوتوون، هەروەك لە باسی خوشكی موسا پێغەمبەرﷺ هاتووە، هەروەها هەندێك ئافرەت بە بیر تیژی خۆی دەتوانێ پێشنیاری ڕاست ودروست پێشكەش بكات بۆ ئەوەی خەڵكان لەسەری بڕۆن وتیایدا سوود مەند بن، هەروەك لە چیرۆكی كچەكەی شوعەیب دا هاتووە. بەڵام ئەو ڕووداوانە كە ڕوویانداوە لە كۆمەڵگەكانی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، ژمارەی ئەو جۆرە بەشداریە زۆر كەمە، ئایا ئەوانە بەڵگەی شەرعین بۆ ئەوەی ئافرەتان ببنە پێشەواو سەركردەی ئوممەت لە كۆمەڵگەكانی ئیسلامی، هەروەك هەندێ لە زانایان وەك بەڵگە دەیهێننەوە.

ئەگەر هەر یەكێك لەو چیرۆكانە بە ووردی شیێ بكەینەوە، ئەوا ئەو واتایە ناگەیەنێ كەوا بۆ ئافرەت جائیزە وەك پیاو لەهەموو كات وشوێنەكدا پێشەوایەتی و سەركردەی ووڵات بگرنە دەست، تەنانەت ئەوەش ناگەیەنێ كەوا ئافرەتان لە دەرەوەی ماڵ لەناو پیاوان كار بكەن. بۆ نموونە چیرۆكی كچەكانی شوعەیب بە ووردی شی دەكەینەوە تاوەكو بزانین واتای چی دەگەیەنێ.

1- موسا پێغەمبەر ﷺ، سەری سووڕما لەو دوو ئافرەتە لەناو ئەو هەموو شوانە بە هێزانەی كە هاتوون بۆ ئاودانی مەڕەكانیان، چونكە ئەو كارە هێزو توانای دەوێت، ململانێ وپاڵدان وبەربەرەكانی دەوێت. هەر بۆیە فەرمووی: (مَا خَطْبُكُمَا)، واتە كێشەكەتان وموسیبەتەكەتان چی یە؟ كەواتە ئەو كارە لەبەر قورسیەكەی بۆ ئافرەتان، موسیﷺ ئەو كارەی بە كێشەو موسیبەتی ناوی برد.

2- هەردوو كچە ژیرو پاكەكە زانیان كەوا كەوتوونەتە ناو كێشە، بۆیە بە پەلە وەڵامیان داوەو ووتیان ئێمە ناچینە ناو پیاوان و مەڕەكانمان ئاو نادەین تاوەكو ئەوان نەڕۆن. كەواتە ئەوان لە ناچاری هاتوون بۆ ئەو كارە، ناچنە ناو كێشەو تێكەڵ بوون، بۆیە چاوەڕێ دەكەن تاوەكو هەموو شوانەكان دەڕۆن ئینجا ئەوان مەڕەكانیان ئاو دەدەن ﴿لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ﴾.

3- هەروەها خۆیان هۆی هاتنە دەرەوەکەیان ڕوون کردەوە، ئەویش ئەوەیە کە باوکیان پیرە وکەسیان نیە بۆیە هاتوونەتە دەرەوە بۆ ئەو کارە. کەواتە هاتنە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن تەنها لەبەر پێویستیەکی زۆر گرنگە، نەبوونی کەسێکی ترە کە ئەو کارە ئەنجام بدات، یان کارەکە بەو نەبێت ناکرێت ﴿وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾.

4- لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە لەگەڵ پیاوێکی نەناسراو، دەبینین زۆر بەحەیاو شەرم ڕێگەیان گرتە بەر، هەست بە دەنگی قاچەکانیان نەدەکرا. هەرکاتیش یەکیان قسەی دەکرد، زۆر بەکورتی وپڕ مانایی قسەکانی تەواو دەکردو درێژەی پێنەدەدا ﴿تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾.

5- ئەوەی گرنگیشە ئەو ئافرەتە هەر لەسەرەتای چیرۆکەکە تاوەکو کۆتایی لەگەڵ خوشکی خۆی دابوو، بەتەنها نەبوو.

ئێمەش دەپرسین ئایا ئافرەتانی سەردەم دەتوانن وەك کچەکەی شوعەیب هەڵسوکەوت بکەن؟ ئایا پیاوانی سەردەم هەموو وەك موسا پێغەمبەرن(ﷺ)، لە ورێز گرتن ولە پاکی، پیاوچاکی، هێزو توانا، هەستی هاوکاری کردن؟ لەگەڵ ئەو هەموو هۆکارە ئیجابیانەش بەتەنها لەماڵ دەرنەچوون، نە چوونە ناو کێشەو ململانێ وتێکەڵاوی ناو پیاوان نەبوون.

کەواتە ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا بۆ ئافرەتی موسڵمان نیە دەرچوون بۆ دەرەوەی ماڵ تەنها بۆ کارێکی زۆر پێویستی وبە ناچاری نەبێت، لە گەڵ پەیڕەوکردنی هەموو مەرجەکانی چوونە دەرەوەی ئافرەت، هەروەك باسمان کردن[1]، هەموو ئەو خاڵانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کاری سەرکردایەتی وپێشەوایەتی وا ئاسان نیە بۆ ئافرەتان هەروەك هەندێ کەس گومانی بۆ دەبەن.

شێخ موحەمەد ئەبو زەهرە دەڵێ: پیادەکردنی حوکمەکانی ئاینەکانی پێش ئیسلام پەیوەستە بەوەی ئایا ئەو حوکمە پاڵپشت کراوە بە حوکمەکانی ناو

---

1- بەرگی دووەم/ بەشی سێیەم.

شەریعەتی ئیسلام، ئەگەر ئەو پاڵپشتەی نەبوو ئەوا حوکمی ئاینەکانی تر کاری پێ ناکرێت لەناو ئاینی ئیسلام.[1]

## بەندی دووەم: بەڵگەی زانستی لە سەر ئەوەی کە ئافرەت بە گشتی گونجاو نین بۆ ئەو پۆستانە چونکە لە خۆرسکەوە خاوەنی ئەو سیفەتانەن:

1- لە لێکۆلینەوەیەك کە لوریا و روبین(Lurian&Rubin) لە ساڵی 1974 کردیان بۆیان دەرکەوت کەوا مێینە بەم سیفەتە بۆماوەیانە ناسراوە: ناسك، نەرم ونیان، هەستیار، ڕوکار ئاسوودە.[2]

2- گۆڕانکاریە فسیۆلۆژیەکان وهۆرمونیەکانی کە تووشی ئافرەت دەبن- ساڵانەو مانگانەو بگرە هەفتانەش- وا لە ئافرەت دەکات کەوا میزاج گۆڕاو بێ، لە باری لا سەنگی جەستەیی ودەروونیدا بژیت لە هەندێك لە کاتەکانی ژیاندا.

3- دەماغ لە دوو نیوە پێکهاتووە وهەرلایەکیشیان کاروفەرمانی جیاوازە، نیوەی چەپ بەرپرسیارە لە بیرکردنەوەی عەقلانی (التفکیر العقلاني) ، وەك: لۆجیك وگونجاوی (المنطق)، ڕاستی ودروستی (الصواب)، گەیشتنە دەرئەنجام(الاستنتاج) ، شی کردنەوە (التحلیل). بەڵام نیوەی لای ڕاست پەیوەندی دارە بە هەستی سۆزو بەزەیی(المشاعر العاطفي)، وەك: زانستەکانی بینین (المعلومات البصرية)، هەست کردن بە هەستە جیاجیاکان (الإدراك الحسي)، هەست بزوێن بەرامبەر شتە شاراوەکان (الحدس)، ئەندێشە (الخیال). هەروەك دەرکەوتووە کەوا نیوەی چەپ لە پیاوان پێشکەوتووترە، بەڵام هەردوو نیوە یەکسان وهاوسەنگن لە ئافرەتان، هەربۆیە هێزی شیکردنەوەو لۆجیك و بە ئەنجام گەیشتن لە ئافرەتان کەمترە لە پیاوان.[3]

---

1ـ أبو زهرة، محمد ، أصول الفقه، ص73.

2_ *Rital.A et al .Hilgard introduction to Psychology. P: 97.*

3ـ الخشت، محمد عثمان، وليس الذكر كالأنثى، ص60-62. والقصاب، الفروق، ص151.

4- ئافرەت دەتوانێت هەردوو لا مێشکی لەیەك کاتدا بەکاربهێنێ وکارەکانی لێك گرێ بدات و بەیەکەوەیان ببەستێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ ماندوو بوون و ووزە بەفیڕۆ دانی تیا بێ. لە لایەنە باش و پۆزەتیڤەکانی ئەو تایبەتمەندیە ئەوەیە کەوا ئافرەت توانای ئەنجامدانی چەند کارێکی هەیە لە یەك کاتدا، بۆ نموونە کاتی هەڵچوون و ئاژاوەدا دەبینین دەگرێی وجوێن دەدات وپارێزگاری وبەرگری لە خۆشی دەکات لە یەك کاتدا. بەڵام لایەنە سەلبی ونیگەتیڤی ئەم دیاردەیە ئەوەیە زۆر جار لە ناوەراستی ڕێگە خۆی لەبیر دەچێت و وون دەبێت ونازانێ بەتەولوەتی ویەقینی چی ڕوویداوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەو هەندێ هۆکاری تری دەروونی وای کردووە هەندێ لە زانایان شایەدی دوو ئافرەت بە شایەدی یەك پیاو بڕیار بدەن لە هەندێ بارو دۆخی تایبەتدا وەك سنوورەکان وسزاکان ومامەلەی مالی، یان نەگونجێن بۆ کاری ڕامیاری وسەرکردایەتی وولات وسوپا.[1]

5- ئەو پشێویە جەستەیی ودەرونیەی تووشی ئافرەت دەبێت کاتی بێ نوێژی وسك پڕی وزەیستانی، ئەگەر کۆبکرێتەوە لەگەڵ ماندوو بوونی جەستەیی ودەرونی کاری پۆستە بەرزەکانی وولات، دەتوانین بڵێین بە هەردووکیان زیانی زۆر بە خۆی وکۆرپەکەو خێزانەکەی دەدات، لەوانەشە بێ بەشی بکات لە سۆزی دایکایەتی وئەرکی هاوسەرێتی.[2]

6- هەروەك باسمان کرد کاری قورس وڕاهێنان ومەشقی سەربازی ووەرزشی تونددو تیژ کاریگەری زۆر نیگەتیڤانەی هەیە لەسەر ئافرەت بەگشتی ولەسەر ئافرەتی سك پڕ بەتایبەتی.

7- کاتێك ئافرەت توشی ئێش وئازارێك دەبێت وا بە ئاسانی لە یادی ناچێت، هەرکاتێکیش ئەو ئازارەی بیر بکەوێتەوە دووبارە ئازاری پێدەگاتەوە، هۆکاری تەنها بۆ ڕزگار بوون لەو کێشەیە ئەوەیە کە ماوەی بدرێتی زۆر بە ووردی وبە

---

1ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق ، ص164-180.

2_ *Kenneth. Principle of Endocrinology, P: 71,804*

درێژی و بە قووڵی باسی ئەم ڕووداوە بکات کە ئازاری پێ گەیاندووە، بەتایبەتی لای یەکێکی خۆشەویست ودڵسۆز بۆی، ئەگەر ئەم کارە نەکات ئەوە ئەو یادە هەر بە هەڵواسراوی لەناو ناخی دەروونیەوە دەمێنێ وپاڵەپەستۆ دەخاتە سەردڵ و سنگی و لەوانەیە توشی خەم و پەژارەی درێژخایەنی بکات. بەڵام گەر بواری درا ئەم ڕووداوە باس بکات ئەوا ئەو پاڵەپەستۆیە دەروونیە نامێنێ وبەتاڵ دەبێتەوە.[1] ئەو سیفەتەش لە کەسانێکی سەرکردە ناوەشێتەوە، چونکە زۆربەی کارەکانی سەرکردە ئێش وئازاری تیایە.

8- هەروەك لای کەس شاراوە نیە کەوا زۆر گووتن وگێڕانەوەی هەموو ئەو شتانەی دەبینرێ ودەبیسترێ پەسەند نیە بەتایبەتی بۆ کەسێکی سەرکردە، وەزیر، قازی چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بڵاو بوونەوەی نهێنیەکانی دەوڵەت و وەزارەت وقەزاو دادگاو بەرپا بوونی کێشەی ڕامیاری وکۆمەڵایەتی.

9- کاتی ڕوودانی کێشەو ڕووبەڕوو بوونەوە، ئافرەت وەڵامدانەوەکەی لە شێوەی قسە پێ ووتنە، بەهۆی زاڵبوونی ناوەندی قسەکردن وزمان لە ئافرەتان، هەروەها ئەو پاڵەپەستۆیە دەرونیەی کە لە ناخ ودەرونیەتی دەری دەبڕێ بە شێوەی قسە پێ گووتن، هەروەها ئافرەت لەو بارانەدا مەیل وئارەزووی بەلای خۆ بەدەستەوەدانە، نەوەك بەرەنگاری وململانێ، بە هۆی بوونی سیفەتی هێمنکەرەوە لە هۆرمونەکانی مێینە ئیسترۆجین وپرۆجیسترۆن.[2]

10- ئافرەتان هەر لە پێکهاتەی عەقلیانەوە ناسراون بە سیمەتی قەبولکردن و قایل بوون (سمة التقبلية)، بە شێوەیەك ئەوان بەلایەنی وەرگرتنی زانیاری و زانست، هەروەها بە لایەنی شێوەسازی وپێکهێناندا دەڕۆن (التشكيل والتكوين)، نەوەك کاریگەری کردنە سەر خەڵك و خۆ سەپاندن.

1ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين ، الفروق بين الذكر والأنثى، ص203.
2ـ القصاب، عبد اللطيف ياسين، الفروق بين الذكر والأنثى، ص201.

## بەندی سێیەم: پیاوان شیاوترن بۆ ئەو پۆستانە چونکە لە خۆرسکەوە خاوەنی ئەو سیفەتانەن

1- نیوەی چەپی مێشك کە بەرپرسیارە لە بیرکردنەوەی عەقلانی، وەك: لۆجیك وگونجاوی، ڕاستی ودروستی، گەیشتنە دەرئەنجام، شی کردنەوە لە پیاوان بەهێزترە لەوەی ئافرەتان.

2- نێرینە بەم سیفەتە بۆماوەیانە ناسراوە: توندو ڕەق، زبر، بەهێز، گەورە لە بارستەو کێش وڕوکاری دەرەوە، ئارەزووی خۆ سەپاندن، دەسەڵات گرتنە دەست، ئارەزوو بەلای کاری ڕامیاری، کارکردنە سەر خەڵك وسەرنج ڕاکێشانی خەڵکانی تر.

3- هەروەها دەبینین کەوا نێرینەی گەنج وپیاوان کە بواری میکانیکی و لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل وتوانای بیرکاری ودیزاینی تەلارو تاقیکردنەوەکانی بینینی زۆر لە پێش ئافرەتانن، بەگشتی نێرینە دەستی گرتووە بەسەر زۆربەی بوارەکانی زانستی وداهێنان وفەلسەفە، هەرە زۆرینەی بلیمەتەکان (العباقرة) لە ڕەگەزی نێرینەن، چونکە زۆربەی چالاکی نێرینە بەگشتی جولەو داهێنانە.[1]

3- بەرهەم هێنان وبەکارهێنانی ووزە لە خانەکانی لەشی نێرینە زیاترە لە مێینە لە منداڵیەوە تاوەکو تەمەنی پیری، دڵ وسیەکان وبڕی خوێن وبەکارهێنان وسووتانی ئوکسجینی زیاترە لە مێینە، هەربۆیەش ژیانی نێرینە چوست وچالاکی وبەرهەم هێنانی زیاتر پێوە دیارە لە گشت قۆناغەکانی ژیان، ئەو هەموو میکانیزمەش بە هۆی هۆرمونی تیستۆستیرۆنە.

4- ڕێژەی هۆرمونی تیستۆستیرۆن لە پیاوان 10 هێندەی ئافرەتانە، هەربۆیەش توانای جەستەیی وبارستەی ماسولکە، لێهاتوویی، توانای جولەو جورئەتی چوونە پێش وبەرەنگاری زیاترە لە مێینە.

5- بە پێچەوانەی ئافرەتان ڕاهێنانی قورس و وەرزشی توند و کاری

---

1ـ سیرل بیرت وآخرون، کیف یعمل العقل، ص156 والقصاب، الفروق، ص164-180.

بەربەرەکانی و ململانیێ، هەموو ئەوانە ڕێژەی ئەندرۆجین وتیستۆستیرۆن زیاد دەکەن، بەمەش بارستەی ماسولکەو تواناو هێزی بەرگری، ئامادەباشی وئارەزووی ڕوو بەڕوو بوونەوەش زیاد دەبێت.

6- کاتی ڕوودانی کێشەیەك نێرینە بە ووردی وخێرایی لە هەموو لایەنەکانی کێشەکە دەکۆڵێتەوەو هەموو توانای بەکاردەهێنێ بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو، پێویستی بە قسە کردن نیە لەوکاتانەدا، واتە بیردەکاتەوە بەبێ ئەوەی قسە بکات، چونکە مێشکی نێرینە ناتوانێ زیاتر لەیەك کار ئەنجام بدات لەیەك کاتدا. ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری بوونی سیفەتی دژواری لە هۆرمونی تیستۆسیتیرۆنی نێرینە.

7- هەروەها نێرینە لە لایەنی بیولوجیەوە زیاتر بەلای هۆکاری جولەدا دەڕوات، وەك دژایەتی جەستەیی ولێدان. لەبەر بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە هۆرمونی ئەندرۆجین لە نێرینە دەبینین زیاتر ئارەزووی یاری توندو زبرو ململانێ و بەربەرەکانی هەیە، لە ئەنجامی ئەو لێکولینەوانە بۆمان دەردەکەوێت کەوا: دژایەتی ودژواری سیفەتەکی نەگۆرە وجێگیرە لە نێرینە و زالە بەسەریەوە. هەرچەندە هۆکاری دەرەکی، وەك: ژینگەو کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری کاریگەری هەیە لەسەر ئەو سیفەتە بەڵام هەرچۆنێك بێت هۆکاری بۆماوەیی و هۆرمونی زاڵە بە شێوەیەکی گشتی.[1]

لەبەر ئەو خاڵانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن دەربارەی هەردوو ڕەگەز بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرانی لە ڕەگەزی ئافرەتان نەناردووە، بەڵکو هەر هەموویان لە پیاوانن و خەڵکی ناوچە شارستانیەکانن. خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ ﴾یوسف: 109. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ الأنبياء: 7. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾النحل: 43.

1- القصاب، الفروق، ص155. وسيرل بيرث، كيف يعمل العقل، ص162.

لە ئافرەتان پێغەمبەران نەبوون بەڵام ڕاستگۆویان، چاکەکاران، باوەڕدارانی پتەو هەن، هەروەك لە قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکات.[1]

لەگەڵ بوونی ئەو هەموو جیاوازیە، ئافرەتان گەر هەموشیان نەبێ هەندێکیان دەتوانن هەمان ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە پیاوان ئەنجامی دەدەن، بەڵام لە کارکردن تەنها ئەنجامدان مەرج نیە، بەڵکو چەند خاڵێکی تری گرنگ هەیە لە پێویستە ڕەچاو بکرێت لەوانە:

1- کارەکە زۆر بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدرێت.

2- کارەکە بەردەوامی تیابی بەهەمان گوڕوتین لە هەموو کاتەکاندا.

3- زیانی بۆ خودی ئەو کەسە نەبێت کە ئەنجامی دەدات.

4- زیانی بۆ خێزان وکۆمەڵگەو وڵات نەبێت لە گشت بوارەکانی ئابووری وکۆمەڵایەتی و ڕامیاری ودیمۆگرافی یەوە.

5- بەدیلی باشتر نەبێت بۆ شوێن گرتنەوەی.

## بەندی چوارەم: هەندێ هۆکاری تری کاریگەر لەسەر بەشداری ئافرەت لە پۆستە باڵاکانی دەوڵەت

1- بەشداری ئافرەتان لەو کارانە زۆربەی زۆری کاتی بووە، تاوەك هاوسەرەکەی لە سەفەر دەگەڕێتەوە، یان تاوەکو منداڵەکەی گەورە دەبێت ودەگاتە تەمەنی پێگەیشتن، یان تاوەکو پیاوێکی تر هەڵدەبژێرن بۆ سەرکردایەتی وڵات.

2- زۆر جار بەشداری ئافرەتان لەو کارانە بەهۆی هاندانی پیاوێك یان کۆمەڵێك بووە بۆ بەرژەوەندیەکی خۆیان، دوای تێگەیشتنی ئافرەتەکە لە بنچینەی کارەکەو پیلانەکە، وازی هێناوەو پەشیمانی دەربڕیە.

---

1ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، 423/2. والطبري، جامع البيان،105/8. والحجازي، محمد محمود، تفسير الواضح، 494/1، 29/2. والواحدي، علي بن أحمد، أسباب النزول، ص210.

3- بەشداری ئافرەتان لەو پۆست وپلەوپایانەدا زۆر کەم بوو لە سەردەمەکانی کۆن، ئێستاش بەهەمان شێوە بگرە هەتاوەکو لەو وڵاتانەی بانگەشەی دیموکراسی ومافی ئافرەتان دەکەن هەر زۆر زۆر کەمە، هەروەك دەبینین لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا کە نزیکەی دوو سەدەو نیوە دامەزراوە تەنها پێیان ڕەوا نەبووە یەك ئافرەتیش بکەنە سەرۆك کۆمار یان وەزیری بەرگری وجەنگ، تاوەکو خەڵکان و وڵاتانی تریش چاولێکەری ئەوان بکەن وبانگەشەی خۆیان بە درۆ نەیەخنەوە، بەڵام بەداخەوە خەڵکانی ساویلکەی وڵاتانی جیهانی سێیەم و هەژارەکان بە ووتارە درۆکانیان هەڵخەڵەتاون.

هەروەك باسمان کرد ئەو کارانە پێویستیان بە کەسانێکە کە خاوەن ئەزموون، پسیۆڕ، شارەزا، دڵ فراوان وڕەق، کەم هەڵچوو، فێڵباز، ئارەزووی ململانێ و پێشبڕکێ و بەزاندن، نەوەك یەکێکی نەرم ونیان وبەسۆزو بەزەیی وەك ئافرەت.

4- ئاینی ئیسلام گرنگی زۆری بە خێزان وپەروەردەی منداڵ داوە، نزیکەی 70 ئایەت هاتووە لەو بارەوە، بۆیە دەرچوونی ئافرەت بۆ دەرەوەی ماڵ وەرگرتنی ئەو کارانە، کاریگەری سەلبی هەیە لەسەر خێزان ومنداڵ و دوور کەوتنەوەیە لە کاری کۆمەڵایەتی وپەروەردەیی کە دەتوانێ تیایدا ڕۆڵی بەرچاوو کاریگەر بگێڕێ.[1]

لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو بەڵگە نەویستە زانستییەیی کە دەیسەلمێنێ ئەو دوو ڕەگەزە هەرگیز یەکسانی تەواو نین لە جەستەو دەروون، بۆیە نابێت هەردووکیان ململانێ ودژایەتی یەکتر بکەن لەسەر وەرگرتنی پۆست وپلەو پایە، چونکە هەریەکیان گونجاوە بۆ کۆمەڵێك کار، هەر دووکیان تەواوکارو هاوکاری یەکترین، بە هەردووکیان ژیان واتا بەخش دەبێت و ڕەوڕەوەی بەرەو پێشەوە دەچێت، بەڵام گەر دژایەتی وململانێ هەبوو لە نێوانیان، هەریەکیان خۆی بە شیاوو گونجاو تر دانا لەوی تر ئەوا کۆمەڵگەو مرۆڤایەتی لەباریەك هەڵدەوەشێتەوە. هەربۆیەش خوای گەورە لەسەر زاری دایکی مەریەم فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾آل عمران:36.

1- عبد الكريم زيدان، الوجيز في أصول الفقه، ص124 وما بعدها.

خــوای گــەورە فەرموویــەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ طـــە: 50:0، هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾ عـــبس: 20. لــەم دوو ئایەتــەدا، ئامــاژە بــەوە دەكـات كـەوا ئـەو خوایـەی هـەموو شـتێكی خولقانـدووەو ڕێگەشی بۆ دیاری كردووە كە چ كارێك بكات، هـەروەها ئـەو ڕێگەیەشـی بـۆ ئاسـان كـردووە، بــە واتــای ئــەوەی هــەموو پێداویــستیەكانی بــۆ ئامــادەكردووە كــاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرك وكاروبارەی بۆی دیاری كراوە.

ئەگەر بۆ كاركردنی ئافرەت هەندێ مەرج دانرا، یان باسـی ئـەوە كـرا كـەوا بـۆ ئافرەت هەندێ كـار گونجـاو نیـە، ئەوانـە ئـەو واتایـە ناگەیـەنێ كـەوا ئـافرەت پلـە وپایەی كەمترە، بەڵكو تەنها بە واتای دابەش كردنی كارەكـان دێـت لـە نێـوان ئـەو دوو ڕەگەزە، چونكە زۆر جار لە نێوان كوڕی پیـاوانیش هەنـدێكیان شـیاو نـین بـۆ هەندێ پۆستە، بەڵام هەمان كەس بۆ پۆستەی تر زۆر گونجاوە.

هەروەها شتێكی سروشتیە كە بواری كاركردنی ئافرەت كەمتر بێت لەوەی پیاو، چونكە هەندێ كاری تر هەیە بۆ ئافرەت دانراوەو كـار ئاسـانی وگونجـاوی جەسـتەو دەروونی بۆ كراوە وەك منداڵبوون وپەروەردە كردنی كە هەموو پیاوی دونیا نـاتوانن شوێنی یەك ئـافرەت بگرنـەوە لـەو كـارەدا، ئـەو كـارەش پیرۆزتـرین كـارە چـونكە هەموو پیاوانی جیهان بەرهـەمی ئـەو كـارەن، هـیچ كەسـێكیش نـاتوانێ نكـۆڵی لـەو ڕاستیە زانستیە واقعیە بەڵگە نەویستە بكات تـەنها یـەكێك نـەبێ خـۆی لـە خانـەی ئـادەمیزاد جیـا كردبێتـەوە. هـەروەها هـیچ ئـافرەتێكیش نیـە ئـارەزوو ئامـانجی سـەرەكی بگـرە هـەموو ژیـانی بـە دایكایەتیـەوە نـە بەسـترابێتەوە. هـەركات لـەو ئارەزووە بێ بەش بوو ئەوا هەموو دونیای هەبێ وادەزانێ هەر سەرگەردانەو لە ژیان هەرەسی هێناوە.

هــەروەك دەزانــن كــەوا ئــەركی دایكایــەتی كــاتێكی زۆری دەوێــت، زۆر ســوك و ئاسانیش نیە، بەڵكو ماندوو بوون وقورسایی وبار گرانـی تیایـە، بۆیـە كـاتێ خـوای گەورە ئەو ئەركە پیرۆزەی بۆ ئافرەتان داناوە، لە لایەكی ترەوە ئـەرك و فـەرمانی كەم كردۆتەوە تاوەكو لە ژیان سەرگەردان و ماندوو شەكەت نەبن.

## بەندی پێنجەم: پوختەی پەسەند کراو (الترجیح)

ئافرەتـان لـەو بوارانـە کـار بکـەن کـە گونجـاوە لەگـەڵ پێکهاتـەی جەسـتەیی و دەرونی، ئەو کارانەی کە بەهیچ شێوەیەك کاردانەوەی نیگەتیڤی لەسەر ئافرەت نیە بە شێوەیەکی گشتی ولەسەر هۆرمونـەکانی بەتایبـەتی، تـاوەکو ڕەورەوەی ژیانی نەگۆڕێت، هەروەها ئەو کارانەی کە ئارەزووەکانی ئافرەت تێر دەکات وەك نواندنی سۆزو بەزەیی وهاوکاری کەسانی ترو چـاودێریان، لەگـەڵ ڕەچـاو کـردن وجێبـەجێ کردنـی بنـەماکانی دەرچـوونی ئـافرەت لـەماڵ وهەوڵـدان بـۆ تێکـەڵ نـەبوون ونـە بەزاندنی سنوورەکانی خوا. ئەو کارانەی کەوا بەلای منەوە زۆر گونجاوە لەگەڵ ئەو خاڵانەی باسمان کردن ومەرجەکانی شەرعیشی تیا بـەدی دەکرێت وئارەزووەکانی ئافرەتیش تێر دەکات بریتیـە: لـە کـاری پـەروەردەی منـداڵ لـە داینگـەو باخـچەی سـاوایان وقوتابخانـەکان بەگـشتی، وانـە ووتنـەوە لـە زانکۆکـان بەتایبـەتی ئـەو بابەتانـەی پەیوەنـدی بـە ئافرەتانـەوە هەیـە، هـەروەها کاروبـاری تەندروسـتی بـە زۆربەی جۆرو بوارەکانی، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە نەخۆشیەکانی ئافرەتان وکارکردن لە نەخۆشخانەی منداڵبوون و نەخۆشخانەی منداڵان، هەروەها بەشـەکانی هـەناوو نەشـتەرگەری ئافرەتـان، هـەروەها لـە ئەزمایـشگاو تاقیگـەکان وتیـشك و سۆناری ئافرەتان، زۆر بـواری تـری تەندروسـتی وپزیـشکی وپەرسـتیاری ومامـانی. ئافرەتـان دەتـوانن لـە وەزارەتـی کاروبـاری کۆمەڵایـەتیش ڕۆڵی خۆیـان ببیـنن لـە خزمەت کردنی ئافرەتان پیرو پەککەوتەو بەساڵاچوو ولێقەوماو هـەتیوان. هـەروەها پێویـستە بـۆ ئافرەتـان بـوارێکی تایبـەتیان بـۆ برەخـسێنرێ ئـەویش وەزارەتێکـی تایبەت وپەیوەست بە ئافرەتان تاوەکو خۆیـان کـارو چالاکیەکانیان تیـادا ئـەنجام بدەن، کێشەکانی خۆیان بە ڕاو بۆچوونی خۆیان چارەسەری گونجاویان بۆ دابنـێن، دوور لە بیروبۆچوونی هاوردەو بیردۆزە داڕماوەکانی دەرەوە. ئەوانەی ئەو کارانەش بـەڕێوە دەبـەن پێویـستە هەڵبـژاردەبن و هـەموو چـین وتوێـژەکانی کۆمەڵگـەی کوردەواری بگرێتـەوە لـە هـەموو ناوچـەکان بـەبێ جیـاوازی و دوور لـە وەسـیەت و وەصایەی پیاوان وبەرژەوەندی حیزب ولایەن ومەزهەب.

لە هەموو ئەو كارانەی باسمان كردن پێویستە بەرنامەیەكی وا دابڕێژرێ كەوا هەرگیز ئافرەتان بێ بەش نەكرێن یان دوور نەكرێنەوە لە كاروباری خێزان وسۆزی دایكایەتی وپەروەردەی منداڵ، چونكە نەتەوەی كورد پێویستی بە رۆڵەو نەوەی تازە هەیە، تاوەكو بتوانن پارێزگاری ئەو دەستكەوتانە بكەن كە بەدەستی هێناوە، نەوەك ئەو لایەنە فەرامۆش بكرێت وژمارەی منداڵان كەم بێتەوەو ژمارەی پیرو پەككەوتەكان زیاد بێت هەروەك لە زۆربەی وولاتانی رۆژئاوا بەدی دەكرێت، كە لەوانەیە چەند ساڵی تر ژمارەی پیرەكان زۆر زیاتر بێت لە ژمارەی منداڵانی ژوور تەمەنی 15 ساڵ، ئەوكات مەترسی لەناوچوونیان پێوە دیار دەبێت. هەروەها لەبەر بوونی هەندێ كرداری فسیۆلۆژی وبایۆلۆژی پێویستە لەو كارانەی كە لەسەرەوە باسمان كردن بۆ ئافرەتان نابێ تیایاندا ماندوو بكرێن هەر چەندە گونجاویشە لەگەڵ پێكهاتەی وئارەزووەكانی. چونكە كاری زۆری بەردەوام دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بەرهەم هێنان و زیاتر دووركەوتنەوەو مۆڵەت وەرگرتن وبگرە نەخۆش كەوتن.

هەرچەندە لای هەندێ لە زانایان وا پەسەندە و پێویستە ئافرەت تەنها خزمەت بكرێت وهیچ كارێك نەكات، چونكە خۆی ماندووە بە كاری ماڵەوەو منداڵ، سەرباری ئەوانەش كاری دەرەوەی پێ بكرێت، ئەو بڕیارە لای ئەوان بە ناڕەواو زوڵم لە قەڵەم دەدرێت. هەروەها دەڵێن ئافرەت بۆی هەیە شیر نەداتە منداڵەكەی ولەسەر باوكی منداڵەكە پێویستە ئافرەتێكی تری بۆ دابین بكات بۆ شیر پێدانی، لەسەری پێویستە خزمەتكاری بۆ بگرێ، بێجگە لە دابین كردنی شوێنی حەوانەوە وناوماڵ.

لەگەڵ بوونی ئەو ڕاو بیرو بۆچوونانە كە هەموویشیان بەڵگەیان هەیە، من لەگەڵ ئەو بیرو ڕایە دانیم كەوا ڕێگە گری لە هاتنە دەرەوەی ئافرەت وكاركردنی دەكات بە شێوەیەكی تەواوی و بنبڕ لەو سەردەمەی ئێستاماندا، چونكە ئەوەتا لەسەرەتای هاتنی ئیسلام وسەردەمی جێنشینە بەڕێزەكان وتاوەكو ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ئافرەتی ناودارمان زۆر هەبووە كەوا بەشداری بوارە جیاجیاكانی كردووە، لەگەڵ جێبەجێ كردنی مەرجەكانی هاتنە دەرەوەو جۆری

کاری گونجاوو لێوەشاوە. لە هەمان کاتیش فەرامۆشی کاری ماڵ وخێزان ومنداڵ وپەروەردەیان نەکردووە. لە کتابی (المرأة الكردية ودورها في المجتمع الكــردي) باسی ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی کوردم کردووە کە بەشداری زۆر بواری جیاجیای کردووە، لە پەروەردە، کۆمەڵایەتی، تەندروستی کاتی جەنگ، چاودێری هەتیوو لێقەوماوان، بگرە هەندێ جاری پێویستیش بەشداری سوپایان کردووە بۆ بەرەنگاری دوژمن. هەروەها لەو سەردەمە ئافرەتان دەتوانن ڕۆلی خۆیان بگێڕن لە زۆر بواری زانستی وبەڕێوەبردن هەروەك ئاماژەمان بۆ زۆربەیان کرد، لەگەڵ ئەوەشم کەوا زیاتر هاوکاریان بکرێت لە ڕووی مۆڵەت پێدان بۆ ئەوانەی پێویستیانە، هەروەها هاوکاری ئابووری زیاتر بکرێت ئەوانەی کەم دەرامەت و هەژارن وبژێوی ماڵ ومنداڵیان لەسەرە.

لەبەر ناسکی باری دەروونی ئافرەت، بەرزی پلەی سۆزو بەزەیی، ماندوو بوون و بارگرانی کاتی سك پڕی ومنداڵبوون، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ وەسیەت و ئامۆژگاری پیاوانی کردووە کەوا لەگەڵ ئافرەتاندا زۆر باش بن، ئەگەر باوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، چونکە ئەوانە لە پەراسوو دروست کراون، لای سەرەوەی پەراسووش لە هەموو بەشەکانی تری خوار ترە، ئەگەر ویستت بە تەواوی ڕاستی بکەیتەوە ئەوا دەشکێ، ئەگەر وازی لێ بهێنی ئەوا هەر بە خواری دەمێنێ، بۆیە لەگەڵیاندا باش بن. ئەو فەرموودەیە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە: ((من كان يؤمن بالله واليوم الأخر فلا يؤذ جاره، واستوصوا بالنساء خيراً، فإنهنّ خلقن من ضلع، وإن أعوج شيء في الضلع أعلاه، فإنْ ذهبت تقيمه كسرته، وإنْ تركته لم يزل أعوج، فاستوصوا بالنساء خيراً)). [1]

ئەو بەیەکچوونەی نێوان ئافرەت و پەراسوو، لە ڕاستیدا شتێکی زۆر زانستیانەیەو ڕاستەو دروستە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئارەزووی خۆوە قسە ناکات، هەموو فەرموودەکانی لەلایەن خواوەیە، خوای گەورەش لەسەروی هەموو زانایانە، بە هەموو زانستێکی دیارو پەنهان ئاگادارە.

---

1ـ البخاري: 80 ـ النكاح باب:1 حديث: 4890، 1987/5.

لێکۆڵینەوە زانستیەکانی پزیشکی ووردو قووڵ دەریان خستووە کەوا ئافرەت لە دوای لە دایك بوون تاوەکو مردنی بە قۆناغی زۆر جیای جەستەیی ودەرونیدا تێدەپەڕێت، کەوا لە هەر یەکێك لەو قۆناغانە ژمارەیەك لە هۆرمونەکان دیار دەکەون بە بڕو ئاستی جیا، ژمارەیەکی تر لە هۆرمونەکان وون دەبن یان بڕو ئاستیان دادەبەزێت، وەك: هۆرمونەکانی پەیوەست بە زاوزێ وهۆرمونی سك پڕی و گەشەو شیر بەرهەم هێنەرو شیر دەرهاوێژەر وزۆربەی هۆرمونەکانی جەستەیی. هاوکات لەگەڵ ئەوانە هەندێ لە ئینزیم و کانزاکان وپێکهاتەی تری لەش، کە هەموویان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کار دەکەنە سەر توانای جەستەیی ودەرونی و بیرو هۆش و هەزرو ئارەزووەکانی ئافرەت. ئەگەر بمانەوێت وێنەیەك دروست بکەین لەسەر نەخشە هێلیەکان بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ئاستی ئەو هۆرمونانە ڕوودەدات لە هەریەکێك لە قۆناغەکانی ژیانی ئافرەت دەبینین ئاستی ئەو هۆرمونانە کەمە لەسەرەتای قۆناغەکە، دوایی وبەرەبەرە بەرز دەبێتەوە تاوەکو دەکاتە لوتکە، دوایی دەست دەکات بە نزم بوونەوە بەهەمان شێوە، لەو کات وێنەکە شێوەی پەراسوو وەردەگرێت (بریتیە لە شێوە کەوانە- curve). بەڵام ئاستی هۆرمونەکانی نێرینە نەگۆڕە، لەیەك ئاستدا دەمێنێ تاوەکو تەمەنێکی زۆر درێژ وگۆڕانکاری کەم بەسەر هەندێکیان دا دێت کە کار ناکاتە سەر پێکهاتەو توانای جەستەیی دەرونی وبیرو هۆشی.[1]

هەروەك پێشتر بۆمان ڕوون کردنەوە کەوا هۆرمونەکان کاریگەری سەرەکییان هەیە لە پێکهاتەی جەستەیی ودەرونی و بیرو هۆش وئارەزوو، ئەگەر بڕو ڕێژەی ئەو هۆرمونانە لە گشت قۆناغەکانی ژیانی ئافرەت وەك کەوانەو پەراسوو بێت، کەواتە ئەو بەیەکچوواندنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە ڕاست و دروستە.

---

1– بۆ دڵنیا بوون و زیاترشارەزا بوون لەبەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی بڕو ئاستی هۆرمونەکانی ئافرەت لە قۆناغەکانی ژیانی وەك بێ نوێژی، سك پڕی، منداڵبوون وشیرپێدان، لە بێ نوێژی کەوتن، بگەڕێوە بەرگی یەکەم بەشی دووەم، هەروەها کتێبی دانەر(تەنها بۆ ئافرەتان) بەشی یەکەم ودووەم وپێنجەم وشەشەم.

ئەگەر بمانەوێت شێوەی ئەو کەوانەیە بگۆڕین بۆ هێڵێکی ڕاست، وەك ئەوەی لە نێرینە بەدی دەکرێت، ئەوا پێویست دەکات هەندێ هۆرمونی تر بە ئافرەت بدرێت کە میکانیزمەکەی دژ بە هۆرمونەکانی ئافرەتەکە خۆی بێت. تەنها هۆرمونی کاریگەر بۆ ئەو گۆڕانکاریە بریتیە لە هۆرمونی نێرینە (تیستۆستیرون). ئەو کاتە پشێوی دەکەوێتە کاری هەموو هۆرمونەکانی ئافرەت، چونکە دوژمنێکی زۆر بەهێز هێرشی کردۆتە سەریان، بەمەش هەموو ئەندامەکانی زاوزێ لەکار دەکەون وکرداری هێلکە دانان وبێ نوێژی هەر نامێنێ، بەمەش سك پڕی دروست نابێت. هاوکات لەگەڵ شێوانی ئەو کردارانە، گۆڕانکاری زۆر لە جەستەو دەرونی ئافرەت ڕوو دەدات لە ئەنجامی پشێوی کەوتنە ناو ڕژێنەگلاندی ژێر مێشك وزۆربەی گلاندەکانی تر، چونکە هەموو پەیوەندیان بە یەکتریەوە هەیە. لە ئەنجامی ئەو دەست تێوەردانە دەبینین ئافرەتەکە لە کەسایەتی ئافرەتان دەرچووە بە دیمەن و کردار، لە هەمان کاتیش نەبووە بە ڕەگەزی نێرینە، بەڵکو ئافرەتێکی پیاوی دەردەچێت- نێرەموك (المرأة -المرجل-المسترجلة)، نە ئافرەتە ئەرکەکانی ئافرەت جێبەجێ بکات، نە بۆتە نێرینەش بە واتای تەواوی نێرینە لە جەستەو دەرون. ئەگەر وێنەیەکی بڕو ئاستی هۆرمونەکانی بکێشین لەسەر نەخشەی هێلکاری ئەوا ئەو هێڵە ڕاستەمان بۆ دەرنەچووە کە خەیال وئەندێشەمان بۆی دەچوو، لە جیاتی ئەوە شێوەێکی نا ڕێکی وا دەردەچێت مەگەر لە شێوەی ئەو پەراسووە شکایە بکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە. ئەو بڕە هۆرمونەی زیادەی کە پێیدراوە زیاد بووە لەو پێویستیە خۆرسکی وفیتریەی کە خوای گەورە بۆ ئافرەتی داناوە، بۆیە ئەنجامەکەی بووە ووردو خاش کردنی کەسایەتی ئافرەتەکە لە هەموو بوارەکانەوە. بۆیە هەر یەکێك، لە هەر کاتێك، لە هەر بابەتێکی ژیان لە فیترەت لابدات ئەوە ژیانی گشتی سەراو ژێر دەبێت جا چ لە کاتێکی نزیك یان لە کاتێکی دوور.

لە بەرگی یەکەم ئاماژەمان بەو لێکۆڵینەوەیە کرد کەوا لە ئەمەریکا کرا لەسەر 4000 کچی زانکۆ، بۆ ماوەیەك هۆرمونی نێرینەیان وەرگرت (تیستۆتستیرون) تاوەکو بزانن ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوودەدات چین، لە کۆتاییدا دیار کەوت کەوا لە

هـەموو کردارەکـانی مێینـە کـەوتوون و سـیفەتی دژواری وتونـدی وشـەڕانگێزی کوڕەکانیان وەرگرتووە.

هەروەها دەتوانرێ ئاستی هۆرمونەکانی ئافرەتان بگۆڕین ولـەکاریان بخـەین بـە زیاد کردنی بڕی هەندێ لـە هۆرمونـەکانی مێینـە خـۆی وەك هۆرمـونی ئیسترۆجین وپرۆجیسـترون، هـەروەك بـەکار دەهێنـرێن بـۆ بابـەتی ڕێگـە گـرتن لـە سـك پـڕی، لەباربردن، ووشك کردنی شیر، چارەسەری نـەزۆکی و زۆر شـتی تـر. کـاتێ ئـافرەت ئەو هۆرمونانە وەردەگرێت دووبارە هەموو سووڕی بێ نوێژی تێك دەچێت بۆیە سك پـڕی نابێـت، هـەروەها ئـەو هۆرمونانـە بـەو ڕێـژە زیـادەی پێیـدەدرێت کاریگـەری نیگـەتیڤ و مـاکی خراپیـان زۆرە لەسـەر ئـافرەت، هـەرگیز ئـەو هۆرمونانـە وا لـە ئافرەت ناکات ببێ بە نێرینە، چونکە وەرگرتنیـان بـە بـەردەوامی مەترسـی لەسـەر ژیانی ئافرەتەکە زۆرە. (بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی کاریگەری ئەو هۆرمونانەی کـە بۆ ڕێگەگرتن لە سك پڕی بەکاردێت بە هەموو جۆرەکانیەوە، بڕوانە کتێبـی دانـەر- تەنها بۆ ئافرەتان).

هەر بۆیە وا چاکە ئافرەتان هەوڵ نـەدەن لـە سیفەتە خۆرسـکیەکانی خۆیـان لا بـدەن، چـونکە ئـەو سـیفەتە خۆڕسـکیانە گونجـاوە لـە گـەڵ ئارەزووەکانیـان ، هەروەها وا چاکە کەسایەتی خۆیان وون نەکەن وخۆیان نەتوێننـەوە لـە کەسـایەتی پیاو وچاولێکەری ئەوانیش نەکەن. چونکە لادان لـەو بەرنامـە خۆڕسـکیە لادانـە لـە زانست وڕاستی و خۆ هەڵخەڵەتاندنەو ڕووبەڕوو بوونەوەو پێکدادانە لەگـەڵ واقیـع و مێژوو.

وێنەی ژمارە: نەخشەی هێلکاری ئاستی هۆرمۆنەکانی ئافرەتە لە کاتی بێ نوێژی و کاتی سک پڕی.[1]

*1 –Leon Speroff. Clinical Gynecologic Endocrinology & Infertility, P:319.*
*–.Stanley G.Clayton .Gynecology by ten teachesr. P:30*

زانای بایۆلۆژی ڕوسی شیوعی (أنطوان نیمیلاف- Anton Nemilov) هەروەك خۆی دەڵێ من لە پوختەی کۆمونیستەکانم لە کتێبی تراژیدیای بایۆلۆژیای ئافرەتان (The biological tragedy of women) دەربارەی نا یەکسانی نێرینەو مێینە لە ڕووی بایۆلۆژیەوە، کە بە تەجروبە بۆی دەرکەوتووە دەڵێ: ئەگەر لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بڵێین با مافێکی دیاری کراو سنووردار بدەینە ئافرەتان لە شارستانیەتی ئەمڕۆ، دەبینین زۆربەی پیاوان لەگەڵ ئەو بڕیارە نین تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێت. خۆشم هەر لەگەڵ ئەو بیرو ڕایە دابووم، کە نا بێ مافیان سنووردار بێت، بەڵکو گشتی بێت، بەلام ئەوەی پێویستە بیزانین نابێ خۆمان بخەڵەتێنین کەوا لە ڕووی زانستیەوە یەکسانی ئەو دوو ڕەگەزە شتێکی وا سووك و ئاسان نیە بە ڕاستی هیچ وولاتێك لە جیهان وەکو وولاتی ئێمە هەوڵی نەدا کەوا یەکسانی بکات لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە، بە دانانی یاسای زۆر لەبار وهاوکار بۆ گەیشتە ئەو ئامانجە. بەلام کاتێ تەماشای واقیع دەکەین، دەبینین پلەوپایەی ئافرەت لە ناو خێزان هەروەك خۆیەتی، بەڵکو لەناو کۆمەڵگەش بە هەمان شێوە کەم گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

تاوەکو کاتی ئێستامان تەسەووری خەڵك دەبارەی نا یەکسانی ئافرەت وپیاو هەر چەسپاوە لە مێشکی چینەکانی کۆمەڵ، نەك هەر تەنها چینی سادەو کەم ڕۆشنبیر، بەڵکو لە ناو چینە هەرە بەرزەکانی کۆمەڵگەی کۆمونیزمیشدا. ئافرەتە ڕۆشنبیرەکانیشمان گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەوە دەڵێن: ئەگەر بەتەواوی یەکسانمان بکەن لەگەڵ نێرینە ئەوا کەم کردنەوەو دابەزندنی پلە وپایەو شوێنمانە لەناو کۆمەڵگە، هەروەها مانای نیرەموکی ئێمە دەبەخشێ بۆیە لامان قەبول نیە. هەروەها نووسەر دەڵێ: ئەگەر بەدوای ئەو کارەدا بڕۆین وپرسیار بکەین لە زانایەکی بایۆلۆژی، قوتابیەك، بازرگانێك، کۆمونیستەکی تەواو باوەڕ، هەر هەموویان دەڵێن کەس نیە وەك ئافرەت بێت، یان بێتە هاو شێوەو هاوبەش و هاوشانی( كفئاً أو نـداً)، هەروەها ئەگەر تەماشای چیرۆکێك لە چیرۆکە کانی

